ساڵی سیانزەهەم بەهاری ٢٠١٢
گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕانو کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

# سەردەم
70

خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

ڕاوێژکاری گۆڤار
ڕێبین هەردی

دەستەی نووسین
هیوا قادر
هەورامان وریا قانع

دیزاین
ئومێد محەمەد

تایپ و هەڵەچنی
ڕێبوار سەدرەدین

بەرگ
ئارام عەلی

ئیمەیڵ
govarysardam@yahoo.com

www.serdam.org

# ناوەرۆک

## فیکرو فەلسەفە ٤ ـ ٤٥


* ئیبن ڕوشد — ئولریش رودۆلف — و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال — ٥ ـ ١٢
* دیوارە نەبینراوەکان — هاشم ساڵح — و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع — ١٣ ـ ٢٤
* ئۆبلۆمۆڤیزم چییە؟ — نیکۆلای دۆبرۆلیۆبۆڤ — و. لە ئینگلیزییەوە: سیامەند شاسواری — ٢٥ ـ ٤٥


## وتارو لێکۆڵینەوە ٤٦ ـ ٧٩


* چەپی نوێ... — د. مەلیک یەحیا سەڵاحی — و. لە فارسییەوە: کارزان محەمەد — ٤٧ ـ ٥٢
* ئەدەبی جیهانی — میلان کۆندێرا — و. لە ئەڵمانییەوە: کەریم پەڕەنگ — ٥٣ ـ ٧٠
* گۆڕانکاری لە مافی مرۆڤدا... — شارۆلت بەنچ — و. لە فارسییەوە: عەزیز مورادی — ٧١ ـ ٧٩


## فایلی ژمارە: سیاسەت و ئەخلاق ٨٠ ـ ١٦٥


* مۆراڵ چییە؟ — هۆرست هایدبرینک — و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال — ٨١ ـ ٨٨
* سێ ئەرکی مرۆڤ — نیکۆس کازانتزاکیس — و. لە ئینگلیزییەوە: هادی محەمەدی — ٨٩ ـ ٩٦
* سیاسەت و ئەخلاق — اکرم البنی — و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع — ٩٧ ـ ١٠٤
* قۆناغە سەرەتاییەکانی.. — ڕازێل ئایلسۆن — و. لە ئینگلیزییەوە: چنور فەتحی — ١٠٥ ـ ١٢٢
* بە گوێی دڵ ببیستن... — ئۆشۆ — و. لە فارسییەوە: جەواد حەیدەری — ١٢٣ ـ ١٢٨
* تیۆریاکانی سروشتی ئەخلاق — جەیمس ڕەیچڵ و ستوارت ڕەیچڵ — و. لە ئینگلیزییەوە: کارزان عەزیز — ١٢٩ ـ ١٤٢
* ئەخلاق لە سەردەمی نوێدا — موستەفا مەلەکیان — و. لە فارسییەوە: فاتیمە ئەدهەم — ١٤٣ ـ ١٥٢
* ئەخلاقی فەردی و کۆمەڵایەتی — برتراند ڕەسڵ — و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی — ١٥٣ ـ ١٦٥

## گفتوگۆ ١٦٦ - ١٩٧


*گفتوگۆ لەگەڵ ئەدۆنیس سازدانی: نینار ئەسبەر و. لە سویدییەوە: هیوا قادر ١٦٧ - ١٧٨
*گفتوگۆ لەگەڵ هارۆکی مۆراکامی سازدانی: لۆرا میلەر و. لە فارسییەوە: جەبار سابیر ١٧٩ - ١٩٠
*گفتوگۆ لەگەڵ ئەمین مەعلوف سازدانی: شاکر نوری و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع ١٩١ - ١٩٧


## ئەدەب و هونەر ١٩٨ - ٢١٣


* پشیلەیەک لە بەرباراندا ئێرنست همنگوای و. لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵا ١٩٩ - ٢٠٢
*خەونەکانی باوکم غوڵام حسێن و. لە فارسییەوە: مەزهەر ئیبراهیمی ٢٠٣ - ٢٠٨
* سێ دەقی شیعری و. لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن ٢٠٩ - ٢١٣


## نووسەرانی نۆبڵ ٢١٤ - ٢٢٧


* پێر لاگەرکڤیست ٢١٥ - ٢٢٢
* یەڵمار سوێدەربێری ٢٢٣ - ٢٢٧


## وێستگەکانی سەردەم ٢٢٨ - ٢٣٧


* نەوال سەعداوی و. لە عەرەبییەوە: دیاکۆ ٢٢٩ - ٢٣١
* خەڵاتی ئەسترید لینگرێن... و. لە سویدییەوە: ڕێوار ٢٣٢ - ٢٣٣
* لە ئەفغانستان ئافرەت لەسەر... و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان ٢٣٤ - ٢٣٥
* یاسایەک ڕێگا بە کوشتن دەدا و. لە عەرەبییەوە: سەردەم ٢٣٦ - ٢٣٧


## بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم ٢٣٨ - ٢٤٣

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

* ئیبن ڕوشد — ئولریش رودۆلف — و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال
* دیوارە نەبینراوەکان — هاشم ساڵح — و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع
* ئۆبلۆمۆڤیزم چییە؟ — نیکۆلای دۆبرۆلیۆبۆڤ — و. لە ئینگلیزییەوە: سیامەند شاسواری



# فیکر و فەلسەفە

# ئیبن روشد

نووسینی: ئولریش رودۆلف
و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

ئەم بڕوایە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا [1]، لە کۆشکی ئەلموەحیدینەکانی مەراکیش ڕاگەیەنرا، هەر لەوێش لەپاڵ هەندێك کەسی دیکەدا پیاوێکی گەنج بیستی کە گرنگیی بە سەرجەم پرسیارەکانی زانست دەدا: ئەبولوەلید ئیبن روشد، کە لە ئەوروپا بەزۆریی بە ئاڤێرۆیس ناسراوە (١١٩٨ مردووە). ڕێگەی ژیانی ئیبن روشد هەندێك تەریبی بۆ ڕەوتی پێگەیشتنەکەی ئیبن توفەیل هەبوو: ئەمیش لە ئیسپانیاوە (بەڵام ئەم لە کۆردۆباوە) هاتبوو بۆ باکوری ئەفریقا، ئەمیش هەروەها لە پزیشکیدا پێگەیەنرابوو و هاوکات دادوەر (قازی – و) بوو و خۆی بە دیراسەی فەلسەفەوە خەریك کردبوو. جگە لەمە ئیبن روشد دەستی دایە نووسینی کۆمێنتار (ڕاڤە/شەرح)ی فەلسەفەی ئەریستۆتێلیس - پێدەچێت ئیبن توفەیل ئامادە نەبووبێت ئەم ئەرکە وەربگرێت و بۆیە پێشنیاری بۆ سوڵتان کردبێت، ئەو ئەرکە بدات بە هاوپیشە گەنجەکەی. سەرباری ئەمە بەدەگمەن دەشێت ئەم دوو هزرڤانە لەتەك یەکتریدا بەراورد بکرێن، چونکە تێڕوانینی ئیبن روشد تەواو جیاواز بوو لە تێڕوانینی ئیبن توفەیل بۆ فەلسەفە و مێژووی فەلسەفە، بۆیە بۆ ڕێگەیەکی دیکە دەگەڕا تاکو زانستی فەلسەفەیی لەو گێژەڵووکانە دەربهێنێت کە بەرێی دانوستاندنەکانی سەدەی یازدەیەم و دوازدەیەمەوە خزابووە نێویانەوە.

جیاوازییەکان لەو پرسیارەدا دەردەکەون کە داخۆ ڕێ بە مرۆڤ درابێت بفەلسەفێنێت؟ ئەم پرسیارە وادیارە بە هیچ شێوەیەك ئیبن توفەیلی بە خۆیەوە خەریك نەکردبوو، بەڵام ئیبن روشد بە جیددی وەریگرت و تەنانەت ئیشێکی خۆی بە ناونیشانی «فەسڵ ئەلمەقال» (لێکۆڵینەوەی بڕیاردەر) بۆ تەرخان کرد. ئێمە گەرەکە ئەم ناونیشانە بە واتای وشە وەربگرین، چونکە ئیبن روشد نایەوێت خۆی لەم تێکستەدا

---

[1] مەبەستی نووسەر پێشنیارەکەی ئیبن توفەیلە بۆ ئەوە کە پەرچەکردار بەرانبەر بە فەلسەفەی ئیبن سینا بنوێنرێت: ئیبن توفەیل نەیدەویست وەك غەزالی ڕەخنە لە فەلسەفەی ئیبن سینا بگرێت، ئەو هەروەها نەیدەویست وەك ئیبن باجە بگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی فارابی، بە پێچەوانەوە ئیبن توفەیل لەو بڕوایەدا بوو کە دەشێت کۆتێزێك لەنێوان مەبەستەکانی ئیبن سینا و غەزالیدا چێبکرێت، بڕوانە: سەرچاوە، لا ٦٩.

**ئەرگومێنتەکانی ئیبن روشد کە لەم نووسینەدا دەردەبڕرێن، شایانی سەرنجن، چونکە لەسەر چەند ئاستێکی جیاواز دەبزوێن. ئەو لە لایەک هێرشەکانی غەزالی ڕەت دەکاتەوە، بەڵام لە لایەکی دی ڕەخنە لە فەیلەسوفانی پێش خۆی دەگرێت (لە پێش هەموویانەوە لە ئیبن سینا). بە دیدی ئیبن روشد گریمانە سادەکانی ئەو فەیلەسوفانە بوون بە هۆیەک بۆ ئەوە کە فەلسەفە نەسازی (تناقچ) لە خۆ بگرێت و لێرەشەوە شیاو بێت هێرشی بکرێتە سەر**


ئولریش رودۆلف

تەرخان بکات بۆ ئەوەی بە ئەرگومێنتی فەلسەفەیی بەرگری لە ئیدێکانی بکات، ئەو بە پێچەوانەوە دەیەوێت بڕیارێکی یاسایی (شەرعی) سەبارەت بەوە بچەسپێنێت «کە داخۆ دیراسەی فەلسەفە و لۆجیك لە یاسای (ئایینییە)وە ڕێی پێدرا بێت، یاساغ کرابێت، پێشنیار کرابێت یان زەرووری بێت».

ئیبن روشد بۆ ئەم مەبەستە دەگەڕێتەوە بۆ قورئان کە گرنگترین سەرچاوەی یاسای ئیسلامییە و لە قورئاندا گۆتەی بەم چەشنە دەبینێتەوە: «ئێوە کە تێڕوانینتان هەیە، هەروەها بهزرێن» (سورەتی ٥٩، ئایەتی ٢)، یان: «ئایا ئەوان نەیانڕوانی لە دەسەڵاتداریی (خودا) بەسەر ئاسمان و زەویدا و لە ئەوەش کە خودا سەراپا خولقاندوویەتی؟» (سورەتی ٧، ئایەتی ١٨٥)[٢]. ئەم گۆتانە لە ڕوانگەی ئیبن روشد بەڵگەن بۆ ئەوە، کە پێوستە مرۆڤان لەبارەی ڕێکخراوی جیهان و بنەرەتی خودی خۆیان بهزرێن، بەڵێ زۆرتر لەمەش، ئەوان گەرەکە ئەم لێهزرینە بە چاکترین شێوە ئەنجام بدەن، چونکە قورئان هەروەها دەبێژێت: «(ئەی محەمەد، ئەی ئیماندار) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی (بۆ هەندێك) و ئامۆژگاری جوان و بەجێ (بۆ هەندێکی تر) و گفتوگۆ و موجادەلە بە جوانترین شێوە (لەگەڵ هەندێکی تردا بەتایبەتی خاوەن کتێبەکان)، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە ...» (سورەتی ١٦، ئایەتی ١٢٥)[٣]. بەڵام لێرەدا چاکترین جۆری هزرین ئەوەیە کە سەرەنجامەکەی شیاوی سەلماندنە،

٢) أو لم ينظروا في ملكوت السموات والارض وما خلق الله من شيء ... (بە کوردی: «ئایا بۆ سەرنجیان نەداوە لەو هەموو دەسەڵاتە گەورەیەی خودا لە ئاسمانەکان و زەویدا و ئەو هەموو شتانەی کە خودا بەدیهێناون؟». بڕوانە: بورهان محەمەد ئەمین، تەفسیری ئاسان.

٣) سیتات لە هەمان سەرچاوەی پێشوو. دەربڕینەکەی قورئان بە عەرەبی: «ادع الى سبيل ربك بالحكمه والموعظة الحسنه وجادلهم بالتى هى احسن ...».

ئەمە هزرینەش فەلسەفەیە کە بە پێچەوانەی زانستەکانی دیکەوە بەتایبەتی ڕوو لە زانستی پێوەری (ئەریستۆتێلی) دەکات. کەواتە یەکەم سەرەنجامی لێهزرینەکانی ئیبن روشد ئەوەیە، کە قورئان (و بەمەش شەریعەت) نەك تەنیا پێشنیار دەکات، بەڵکو هەروەها وەك فرمان (واجب) ڕێنوما بۆ ئەوە دادەنێت، کە مرۆڤان خۆیان بە فەلسەفەوە خەریك بکەن.

بێگومان ئەم فرمانە هەموو مرۆڤان لە هەمان شێوازدا ناگرێتەوە، واتا ئیبن روشدیش بە هەمان شێوەی هزرڤانانی پێش خۆی جیاوازی لە نێوان گرووپی جودای مرۆڤاندا دەکات. هەندێك مرۆڤ لە بورهانەکانی فەلسەفە تێدەگەن، هەندێکی دیکە تەنیا لە ئەرگومێنتە دیالێکتیکی یان ڕەوانبێژییەکان تێدەگەن و لەبەر ئەم هۆیە لە داواکارییەکەی قورئان بۆ فەلسەفاندن بەدەرکراون. سەرباری ئەمە دەربڕینەکەی ئیبن روشد وەك تەحەدایەك دەمێنێتەوە، چونکە ئەم دەربڕینە هەروەها واتایەکی ئەوتۆ دەگەیەنێت، کە فەلسەفە فرمانێکە (واجبێکە) بۆ هەموو ئەو کەسانە کە زەینێکی شکۆفەکردوویان هەیە. بەڵام گەر ئیبن روشد بەڕاستی بییەوێت ئەم فرمانە وەك دەرەنجام لە قورئانەوە بباتەوە، ئەوا دەبێت ڕوونیبکاتەوە کە بۆچی نووسەرانی دیکە (بۆ نموونە غەزالی) تۆمەتی کوفر دەدەنە پاڵ فەیلەسوفەکان و ئەو نووسەرانەش لەم تۆمەتەدا بە هەمان شێوە پشت بە قورئان دەبەستن.

«فەسڵ ئەلمەقال» لەسەر ئەمەش وەڵامێکمان پێدەدات، بەڵام ئەم وەڵامە ئێستا چیدی لە لێهزرینێکی یاساییەوە دەرناچێت، بەڵکو لە تێڕوانینێکەوە سەبارەت بە پرنسیپەکانی ڕاڤەی (تەفسیری) قورئان. ئیبن روشد بەجەختی ڕایدەگەیەنێت، کە مرۆ (المرء) ناتوانێت لەسەر یەك تاکە شێواز لە نووسراوی پیرۆز تێبگات، بەڵکو نووسراوی پیرۆز سێ جۆری جیاوازی گۆتە لە خۆ دەگرێت و هەر یەکەیان داوای دەرچەیەکی ڕاڤەکارییانە دەکات: ١) کۆمەڵێك ئایەت هەیە کە لەنێو خۆیەوە ڕوون و ئاشکرایە و مرۆ دەتوانێت چ بە دەسوێژەکانی بورهان و چ بە دەسوێژەکانی دیالێکتیك و ڕەوانبێژی بەڕوونی لێیتێبگات؛ نموونەیەك بۆ ئەم کۆمەڵە ئایەتە بریتییە لەم ڕستەیە: «هیچ خودایەك جگە لە ئەڵڵا نییە»؛ ئەم ڕستەیە بۆ هەموو یەکێك ڕۆشنە، بۆیە نابێت ڕاڤەی مەجازی بکرێت و بەو ڕێیەوە بەزۆر لە واتاکەی دووربخرێتەوە. ٢) کۆمەڵێکی دیکەی ئایەت هەیە کە بەگوێرەی فۆرمولەکردنی ڕواڵەتی بە هەمان شێوەی کۆمەڵی یەکەم ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام پێویستە مرۆڤانی سادەش بە واتای وشە (wörtlich) لێیتێبگەن؛ ئەم تێڕوانینە بۆ نموونە ئەم ڕستەیە دەگرێتەوە: „خودای میهرەبان بەسەر تەختی فەرمانڕەوایی خۆیەوە وەستاوە” (سورەتی ٢٠، ئایەتی ٥)[٤]. ئەم ڕستەیە وا پیشانی زۆرینەی ئیماندارانی دەدات کە هەروەك خودا وەك پاشایەك لەسەر تەخت دانیشتبێت، دەربڕینێکی بەم چەشنەش لەتەك تێگەیشتنی ئەواندا بۆ دەسەڵات یەکدەگرێتەوە، بەڵام کێ خاوەنی مەعریفەی باڵاتر بێت، ئەو کەسە دەزانێت کە خودا ناجەستەییە، کەواتە ناشێت بە شوێنێکەوە پابەند بکرێت، بۆیە ئەو کەسانە کە زەینێکی شکۆفەکردوویان هەیە، دەزانن کە دەبێت ئایەتێکی بەم چەشنەی قورئان بە شێوەیەکی مەجازی ڕاڤە بکرێت. ٣) لە کۆتاییدا کۆمەڵێکی دیکەی ئایەتی قورئان هەیە، بەڵام لە حاڵەتی ئەم جۆرە ئایەتانەدا دیار نییە کە داخۆ مرۆ بە واتای وشە یان لە مەغزایەکی مەجازیدا لێیان تێبگات. ناسراوترین نموونەی ئەم جۆرە ئایەتانە گۆتەکانن لەبارەی زیندووبوونەوە. ئێمە ناتوانین ئەم گۆتانە لە واتای سەلماندندا بپشکنین، چونکە ئێمە سووك و ئاسان نازانین کە بە چ شێوەیەك زیندووبوونەوەکە (جەستەیی؟ هۆشەکیی؟ تاکەکەسیی؟) ڕۆژێك لە ڕۆژان

**٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو. بە عەرەبی: «الرحمن علی العرش استوی».**

ڕوو دەدات. ئیبن روشد لە حاڵەتی ئەم جۆرە ئایەتانەدا جەخت لەوە دەکات، کە زانایان دەتوانن پابەندبن پێیانەوە نوێنەرایەتیی بۆچوونی جیاواز بکەن، چونکە هیچ کام لەو زانایانە ناتوانێت تیۆرییەکەی خۆی بە ئەرگومێنتی بورهانی مسۆگەر بکات و بۆیە نابێت هیچ کەس بەهۆی بۆچوونەکانییەوە تەکفیر بکرێت – گەر زانایەك هەڵوێستێکی بەو چەشنە وەربگرێت، ئەوا لەو کارەیدا نکۆڵی لە خودی بنەماکەی ئیمان دەکات (واتا لە حاڵەتی ئەم نموونەیەدا نکۆڵی لە هەقیقەتی زیندووبوونەوە دەکات) و بەمەش دژبێژیی یەکێك لە بنەماکانی ئیسلام دەکات.
کەواتە ئیبن روشد بۆ ڕاڤەی قورئانیش بەقەد پێویست فەزای کارکردن دادەنێت - هەر ئەوەندە کە ئەو خۆی پێویستی پێیەتی. بەڵێ ڕاڤەی قورئان تەنانەت سەرەنجامی لێهزرینە یاساییەکانی (شەرعییەکانی - و) ئەو مسۆگەر دەکات و ئەو بڕوایەش دەراستێنێت، کە گەر هاتوو گۆتەکانی نووسراوی پیرۆز ڕاست ڕاڤە بکرێن، ئەوسا لەتەك تێزە فەلسەفەییەکاندا یەکدەگرنەوە، بەڵام گەر ئەمە ئاوها بێت، ئەوسا ئیتر هیچ هۆیەك نابێت بۆ ئەوەی فەیلەسوفەکان لۆمە بکرێن، گەر کەسێکیش ئەم کارە بکات، ئەوا بەسەهوودا چووە. ئەمە بێگومان غەزالیش دەگرێتەوە، کە لە نووسینەکەیدا بە ناونیشانی «تەهافوت ئەلفلاسفە» گوتبووی، گوایە فەیلەسوفەکان لە بیست پنتدا بەهەڵەداچوون.
پیشاندانی ئەم سەهووە دووەم ئەرکی گرنگە و ئیبن روشد دەیەوێت ئەمیش بەجێبگەیەنێت. ئەو لە بنەڕەتدا دەبوو ئەم ئەرکە ئەنجام بدات، چونکە لەسەر ئەو تانوتانە کە لە « تەهافوت ئەلفلاسفە»دا درابوون، نە ئیبن باجە (کە پێدەچێت تێکستەکەی نەناسیبێت) و نە ئیبن توفەیل (کە پێدەچێت بۆ لە پێناوی ڕاگرتنی هارمۆنیدا گرنگیی بە تێکستەکە نەدابێت)، پەرچەکرداریان بە شێوەیەکی گونجاو پیشاندابوو. بەڵام ئیبن روشد جیاواز بوو لە ئەوان، ئەو دەیزانی کە ناشێت هێرشێکی بەو چەشنە لەدژی فەلسەفە پشتگوێ بخرێت و ڕاڤە نەکرێت، بۆیە سەبارەت بەو تۆمەتانە هەڵوێستی وەرگرت و وەڵامێکی نووسی بە ناونیشانی «تەهافوت ئەلتەهافوت». ئیبن روشد لەم نووسینەدا ڕوو دەکاتە سەرجەم تانوتەکانی غەزالی و هەوڵ دەدات هەڵیانبووەشێنێتەوە.
ئەرگومێنتەکانی ئیبن روشد کە لەم نووسینەدا دەردەبڕێن، شایانی سەرنجن، چونکە لەسەر چەند ئاستێکی جیاواز دەبزوێن. ئەو لە لایەك هێرشەکانی غەزالی ڕەت دەکاتەوە، بەڵام لە لایەکی دی ڕەخنە لە فەیلەسوفانی پێش خۆی دەگرێت (لە پێش هەموویانەوە لە ئیبن سینا). بە دیدی ئیبن روشد گریمانە سادەکانی ئەو فەیلەسوفانە بوون بە هۆیەك بۆ ئەوە کە فەلسەفە نەسازی (تناقض) لە خۆ بگرێت و لێرەشەوە شیاو بێت هێرشی بکرێتە سەر. ئیبن روشد هاوکات دەیەوێت ڕەوایەتی بە ترادیسیۆنی فەلسەفەیی بداتەوە و بۆیە زۆر مەبەستێتی فەلسەفە لەدژی هەموو تانوتەکانی غەزالی بپارێزێت. پوختەی تانوتەکانی غەزالی ئەو تێڕوانینەیە، کە گوایە فەیلەسوفەکان بێئیمانی (کوفر) بڵاودەکەنەوە، چونکە گوایە ئەوان ئەم جۆرە تێڕوانینانە ڕادەگەیەنن: ١) ئەزەلییەتی جیهان (بەشی یەکەمی «تەهافوت ئەلفلاسفە»)، ٢) خوا تەنیا بە شێوەیەکی گشتی تاکە شتەکان دەناسێت (بەشی ١٣)، ٣) مرۆڤ نەك بە لەش، بەڵکو تەنیا بە دەروون زیندوو دەبێتەوە (بەشی ٢٠).
ئیبن روشد زۆر بە توندی ئەم تۆمەتانە دەگەڕێنێتەوە، ئەویش بەم ئەرگومێنتانە: ١) قورئان لە هیچ جێیەکدا نابێژێت، کە جیهان لە هیچەوە (من العدم) خوڵقێنراوە و لە ڕەوتی کاتدا هاتۆتە ئاراوە. گەر لە قورئاندا هەر گۆتەیەك سەبارەت بە بنەڕەتی جیهان هەبێت، ئەوا ئەو گۆتانە بەزۆریی ئاماژەن بۆ ئەوە، کە مرۆ پێویستە بۆ هاتنەئارای جیهان گریمانەی ئەستویەکی (مادەیەکی) ئەزەلی بکات؛

هەر بەم شێوەیە لە سورەتی ١١، ئایەتی ٧، هاتووە: «هەر ئەو خودایەیە کە ئاسمانەکان و زەویی لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروست کرد، کاتێك تەختی فەرمانڕوایەتیەکەی بەسەر ئاوەوە بوو ...»[٥]. بەڵام ئەم جۆرە ئایەتانە ڕۆشن نین و فەزای ڕاڤەکردن چ بۆ فەیلەسوفان و چ بۆ تیۆلۆژان دەرەخسێنن، کەواتە ناشێت هیچ لایەنێکیان بەهۆی قەناعەتەکانییەوە تۆمەتی بێئیمانیی (کوفر) بخرێتە پاڵ. ٢) ئەمە بە هەمان شێوە ئەو پرسیارەش دەگرێتەوە کە سەبارەت بە زانینی خودا دەکرێت، بەڵام مرۆ لە حاڵەتی ئەم پرسیارەشدا بە هەڵە لە فەیلەسوفەکان تێدەگات، چونکە ئەوان بە هیچ شێوەیەك نکۆڵی لەوە ناکەن کە خودا تایبەتەکان دەناسێت، بەڵکو تەنیا جەخت لەوە دەکەن کە پێویستە شێوەی زانینی خودا جیابکرێتەوە لە هەر شێوەیەکی زانینی مرۆڤ. ئاخر مرۆڤان هێدی هێدی بە زانینی خۆیان دەگەن و مەعریفەیان بەرێی ڕوانینەوە لە تاکە شتەکان سەرهەڵدەدات، بەڵام ئەم ڕەوشە لە لای خودا تەواو پێچەوانەیە، چونکە زانینی خودا هەر لە ئەزەلەوە سەرجەم شتەکان (بە زانینی مرۆڤیشەوە) لە خۆ دەگرێت، ئەم زانینەی خودا بریتی بوو یان بریتییە لە پێشمەرجێك بۆ ئەوە، کە تایبەتەکان بەدووی یەکتریدا دروست بوون یان دروست بن. ٣) لە کۆتاییدا لە پرسیاری زیندووبوونەوەشدا هەڵوێستی نارەوا بەرانبەر فەیلەسوفەکان وەرگیراوە، ئاخر تێڕوانینی ئەوان لەمەڕ زیندووبوونەوە بە هیچ شێوەیەك نەساز نییە بە قورئان، هۆی ئەمەش پێشتر لە «فەسڵ ئەلمەقال»دا باس کرا: مرۆ ناتوانێت ئەو جێیانەی قورئان، کە لە زیندووبوونەوە دەدوێن، بە واتای وشە یان لە مەغزای مەجازییاندا بچەسپێنێت، کەواتە ناشێت تۆمەتی بێئیمانی بدرێتە پاڵ هیچ کەسێك کە پەیوەست بەم پرسیارەوە ڕاڤەیەکی دیکە ئەنجام بدات.

بەمەش پێدەچێت هەموو پنتە گرنگەکان ڕوون کرابێتنەوە، ئیبن ڕوشد ڕەوایەتیی بە فەلسەفە دا چ لە داواکارییە بنەماییەکەیەوە (فەسڵ ئەلمەقال) و چ لە تاکە تێزەکانییەوە (تەهافوت ئەلتەهافوت)، کەواتە ئیتر ئیبن ڕوشد ڕەوایەتی وەردەگرێت بۆ ئەوەی ڕوو بکاتە پەرچاندنە فەلسەفەییەکانی خۆی. بەڵام ئەم کارە لەو نووسینانەدا ڕوونادات کە هەتا ئێستا لێیان دواین، بەڵکو لە ژانرێکی دیکەی تێکستدا، واتا: دەروازە لەژمارەنەهاتووەکان، پارافرازگەلی ڕوونکەرەوە و کۆمێنتارەکان کە لەبارەی سەرجەم بەرهەمەکەی ئەریستۆتێلیس (هەروەها لەبارەی 'کۆمار' ی پلاتۆن و ئیشی جیاوازی دیکەی ئەنتیکە) نووسیونی.

لەم نووسینانەدا هزری سیستەماتیکانەی خودی ئیبن ڕوشد ئاوەڵا دەبێت، بەڵام مەبەستی ئەو لەم نووسینانەدا ڕووناکاتە پیشاندانی گۆشەنیگایەکی نوێ و چاوەڕواننەکراو، بەڵکو دەیەوێت سەرلەنوێ بۆ ڕاستی بگەڕێتەوە. ڕاستی بە تێڕوانینی ئیبن ڕوشد ناسراوە، چونکە پێشتر لە لایەن ئەریستۆتێلیس نوێنەرایەتی کراوە؛ ئاخر ئەوە ئەریستۆتێلیس بوو کە فێری کردین لە سروشتی دەوری خۆمان تێبگەین و لە سروشتەوە دەرەنجامی جەخت سەبارەت بە سەرجەم بوون دەربکێشین، بەڵام ئەم توانستە درەنگتر بزر بوو، چونکە هزرڤانانی وەك ئیبن سینا فەلسەفەیان بە تیۆلۆژییەوە (و ئەریستۆتێلیزمیان بە نوێپلاتۆنیزمەوە) بەست و ئاستی بورهانیان تێکەڵ کرد بە ئاستەکانی دیالێکتیك و ڕەوانبێژی، هەر بەم شێوەیە فەلسەفە کۆهەرێنسە (تەماسوکە) سەرچاوەییەکەی خۆی بزر کرد و لێرەشەوە ئیتر دەرفەت بۆ ڕەخنەگرانی وەك غەزالی ڕەخسا هێرش بکەنە سەری.

ئیبن ڕوشد بۆ ئەوەی هەڵوێست لەدژی ئەو هێرشانە

٥) دەربرینە عەرەبییەکە: **«وهو الذی خلق السموت والارض فی ستة أیام و کان عرشه علی الماء ...»**

وەربگرێت، سەرلەنوێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەریستۆتێلیس، ئەم هەڵوێستوەرگرتنە ئێستا سەرەنجامێکی ئەوتۆ دەخاتەوە کە ئیبن روشد ئەو تێزە «نوێ»یانە کە فەیلەسوفانی پێش خۆی بەتایبەتی گۆڕانیان پێدابوون ((بۆ نموونە جیاکردنەوەی کرۆك (ئێسێنس) و لێرەبوون (ئێکزیستێنس) لە لایەن ئیبن سینا، یان مۆدێلە گەردوونناسییەکەی فارابی بە خوداوە وەك هۆکار لە لوتکەدا)) رەتبکاتەوە و بە تیۆرییە «کلاسیکی»یە ئەریستۆتێلییەکان (واتا جەوهەرەکان وەك بەردی بناغەی بوون، خودا وەك هۆکاری بزووتن) جێیان بگرێتەوە، بەڵام ئیبن روشد سەرەرای ئەوە هێشتا هەر ناتوانێت وا ئاسان فەلسەفەی ئەریستۆتێلیس بینابکاتەوە، ئەو خۆیشی ئەمە دەزانێت، چونکە لە دەربرینەکانییەوە دەردەکەوێت، کە ئەو زانیاریی تەواوی سەبارەت بەو راڤە جیاوازانە هەبوو کە سەبارەت بە بەرهەمەکەی ئەریستۆتێلیس لە بەردەستدا بوون (ئەلێکساندەری ئەفرۆدیسیاس، تێمیستیۆس، سیمپلیکیۆس، یۆهانس فیلیپۆنۆس و هتد). کەواتە ئیبن روشدیش لە لایەنی خۆیەوە راڤەی ئەریستۆتێلیس دەکات، ئەو ئێستا دانوستاندنی ئەو کێشانە بەر دەخات، کە لە سەرجەم بەرهەمەکەی ئەریستۆتێلیسەوە دەکەونەوە، هەروەها بەراوردی ئەو راڤانە دەکات کە بۆ بەرهەمەکەی ئەو گۆڕان پێدرابوون، بەم شێوەیە ئیبن روشد بەرێی خەریکبوونی بەویژدانانەوە لەتەك هەوڵە ترادیسیۆنیەکانی چارەسەرکردندا دەگات بە ریزێك وەڵام کە لە تێروانینە بنەماییەکانیاندا تەواو نوێ و رەسەنن.

ناسراوترین نموونە لێرەدا تیۆریی زەینە، کە لە لێهزرینەکانی ئیبن روشددا رۆڵێکی گرنگ دەگێرێت. بەڵام کێشەی ئەو لەم تیۆرییەدا ئەوە نییە کە بە شێوەیەکی دی سەبارەت بە زەینی چالاك بهزرێت (واتا ئەو هەڵوێستە وەربگرێت کە لە لای ئیبن باجە و ئیبن توفەیل پێشینەیی بوو)، بەڵکو دەیەوێت باشتر روونی بکاتەوە کە داخۆ رەوشی زەینی هێزەکی / شیمانەیی (یان ئەستویی) چۆن بێت. زۆرینەی کۆنترین نووسەران بۆچوونی هاوشێوەیان لەبارەی زەینی هێزەکی هەبوو، ئاخر چ کندی، چ فارابی و ئیبن سینا (هەروەها هزرڤانانی پاش ئەوان) گریمانەی زەینێکی خۆیی هێزەکیان لە لای مرۆڤ کردبوو بە بنەمای لێوەدەرچوون، بەڵێ تەنانەت کاراییەکی گرنگیان بۆ تەرخان کردبوو: واتا ئەو کاراییە کە دەرفەتی بەختیاربوون بۆ تاکەکەس دەرەخسێنێت (بێگومان فارابی سنووری بۆ دانابوو) — ئاخر، ئەمەش تێروانینە بنەرەتییەکە بوو، گەر مرۆڤ بۆی بلوێت بە مەعریفە بگات، ئەوسا زەینی هێزەکیی خۆی ریالیزە دەکات و بەمەش لە جیهانی هۆشەکیی ئەزەلیدا بەشداری دەکات.

ئیبن روشد دژی ئەم تێروانینە دەوەستێتەوە، بەدیدی ئەو دەشێت چەند هۆیەك وەك بەڵگەی ئەو هەقیقەتە وەربگیرێن، کە تەنیا یەك زەینی گەردوونیی هێزەکی هەیە. مرۆ دەبێت لە لایەك ئاستەکانی تایبەتێتی (واتا ئاستەکانی تاکە مرۆڤ) و گشتێتی (واتا مەعریفەی هۆشەکی) لەیەك جیابکاتەوە. تاکەکەس چالاکیی جیاوازی هەیە و چالاکییەکانی بەندن بە لێرەبوونی جەستەیی سێنسیانەی ئەوەوە، ئەم چالاکیانە سەجەم ئەو ئەکتانە لەخۆدەگرن کە پەیوەندییان بە چاپێنراوە (أنطباع) سێنسییەکانمانەوە هەیە (وەك دەرککردن، یادوەری، پێشبینی و هتد)، بۆیە ئەو چالاکییانە لە لایەن دەروونێکی تاکییەوە (خۆییەوە - و) کە لەتەك لەشدا لەناودەچێت، پێکەوە دەگونجێنرێن. بەڵام بە دیدی ئیبن روشد مەئریفەی هۆشەکی سەر بە کایەی تاکەکەسی نییە، بەڵکو دەچێتە سەرووی هەموو ئەو سەرەنجامانەوە کە تاکەکەس لە تاکە دەرککردنەکانەوە پێیان دەگات، چونکە تاکەکەس بە داماڵینی (تەجریدکردنی) ئەو سەرەنجامانە هەڵدەستێت و لێوەیان مەئریفەی هۆشەکی

چێدەکات، بەمەش لێوەیان تێگەیەك دەهێنێتە گۆڕێ، بەڵام تێگە گشتییە و زانینی تێگە لای سەرجەم مرۆڤان هەمان زانینە (بۆ نموونە یاسا ماتماتیکییەکان). لێرەوە ئیبن روشد ئەم دەرئەنجامە دەباتەوە: دەبێت ئەو سەنتەرەی مرۆڤیش کە تایبەتە بە ناسین، لە لای سەرجەم مرۆڤان هەمان سەنتەر بێت. هەروەها ئەرگومێنتێکی دیکە لە خودی زەینی هێزەکییەوە دەکەوێتەوە: زەینی هێزەکی، پێش ئەوەی بهزرێت، توانستی پەتییە. ئیبن روشد بەم چەشنە پێناسەی دەکات: زەینی هێزەکی بریتییە لەو توانستە «کە هێزەکییانە بریتییە لە شیمانەی سەرجەم ئەو فۆرمە (هۆشەکی)یانە کە سەر بە فۆرمە گەردوونییە ئەستووییەکانن»، ئەو هەروەها جەخت دەکات، کە «پێش ئەوەی (زەینی هێزەکی) لێیان (لە فۆرمەکان) تێبگات، خۆی بە هیچ شێوەیەك بوونەوەری کردەکی نییە». بەڵام زەینی هێزەکی وەك توانست ناجەستەییە، هەروەها وەك توانست هەمیشە هەر هەیە، ئەم تێڕوانینەش دەگونجێت بۆ ئەوەی گریمانەی یەك تاکە زەینی هێزەکی بکرێت کە ئەزەلییە و بەڕێی چالاکییە (فەلسەفییە)کەیەوە گەرەنتی بە نەمریی ڕەگـەزی مرۆڤ دەدات - بێگومان نەك بە نەمریی تاکە مرۆڤ.

سەرچاوە:

Ulrich Rudolph, Islamische Philosophie, München ٢٠٠٤

فەرهەنگۆك

پارافراز: دەربڕین لەسەر دەربڕراوێك، بۆ نموونە تێکستێکی تایبەتی بە وشەی دیکە بدرێتەوە.

زانستی پێوەر: (علم القیاس / سیلۆگیزم) کە ئەرِیستۆتێلیس گۆڕانی پێدا. پێناسەکەی بەپوختی بەم چەشنەیە: دەرکێشانی دەرەنجامێك لە دوو بڕیارەوە/پێشدانراوەوە بە مەرجێك نێوانە تێگەیەکیان هەبێت. بۆ نموونە: سۆکرات مرۆڤە (بڕیاری یەکەم)، مرۆڤ بمرە (بڕیاری دووەم)، کەواتە سۆکرات بمرە (دەرەنجام)؛ لێرەدا مرۆڤ نێوانە تێگەیە.

هێزەکی/کردەکی: ئەرِیستۆتێلیس لە پرۆسەی مەعریفەدا جیاوازی لە نێوان دوو جۆر زەیندا دەکـات: یەکەم زەینی هێزەکی کە تەنیا توانست لە خۆ دەگرێت و بمرە، ئەم زەینە وەك توانست دەرکی شتەکانی جیهانی دەرەکی دەکات (بۆ نموونە ڕوانین)، بەڵام توانستەکان تەنیا بەڕێی زەینی چالاکەوە کردەکێتی وەردەگرن. زەینی چالاك پێش ژیان هەبووە و پاش ژیانیش دەمێنێت - لێرەدا بێگومان مەبەست لە نەمریی تاکەکەس نییە.

پرۆسەی مەعریفە لای ئەرِیستۆتێلیس بەم چەشنەیە: بەڕێی دەرككردنەوە پێشبینییەك چێدەبێت کە پێشبینییەکی گشتییە، ئەوجا دوای ئەوە کە چەند پێشبینییەك لەنێو زاکیرەدا کۆدەبنەوە، مرۆڤ دەتوانێت لێوەیان پێشبینیی دیکە چێبکات و ئەم پێشبینیانە گشتیترن لە ئەوانەی پێشوو. بۆ نموونە مرۆڤ پێشبینیی درەختێکی تایبەتیی هەیە کە سنەوبەرێکە، ئەم پێشبینییە گشتێتییەکە، پاشان لە کۆمەڵێك پێشبینیی دیکەی لەم جۆرەوە، وەك دارسێو، دارگوێز، دارهەرمێ و هتد، پێشبینیی درەخت بەگشتی دێتە ئاراوە. بەڵام ئەم پێشبینییە جارێ سێنسییە (مەحسوسیە) و لەنێو دەروونی بمردایە. ئەم زەینە ناچالاکە. پاشان زەینی چالاك (نووس) دەستی بەسەردا دەگرێت و لێوەی کرۆکی تێگەیی دەردەکێشێت. ئەم کرۆکە هێزەکیانە یان بە شیمانەیی لەنێو ئەندێشەدا هەیە، بەڵام (نووس) بەڕێی چالاکیی هزرینەوە کردەکێتیی پێدەدات یان تێگەی پەتی چێدەکات.

تێبینی: ناونیشانی ئەم ئیشەی ئولریش رودۆلـف بریتییە لە: «گەڕانەوە بۆ ئەرِیستۆتێلیس»، پاشان وەك ژێرناونیشان هاتووە: «ئیبن روشد». کەواتە ئەو پتر لە کێشەکانەوە ڕوو لە فەیلەسوفەکان دەکات. بەڵام دانانی ناونیشانی «ئیبن روشد» بۆ ئەم وەرگێڕانە بۆیە شیا، چونکە لە کۆنتێکستەکەی کە مێژووی فەلسەفەی ئیسلامییە، دەرکێشراوە. (ك.ج)

# دیوارە نەبینراوەکان... ئایا ئێمە ڕەگەزپەرست و خێڵەکین یان نا؟

نووسینی: هاشم ساڵح
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

ئایدۆلۆژیای عەرەبی باو پێت دەڵێ ڕەگەزپەرستی تەنها تایبەتە بە خۆرئاوا، عەرەب و موسڵمانەکان لێی بێبەرین و هیچ پەیوەندییەکیان پێوەی نییە و نایناسن. هەمان شت بۆ تایفەگەری و پەتا کۆمەڵایەتیەکانی دیکەش ڕاستە. لە خوا بەزیادبێت میللەتەکەمان میللەتێکی باشە و نە خێڵەکییە و نە ڕەگەزپەرست. پەنا بەخوا ئەم ئافاتانە تەنها تایبەتە بەوانی دیکە و لە دەرەوە هاوردەکراون. بگرە ئیمپریالیزم پێش ئەوەی بڕوات و بەجێمانبێڵێ، ئەو پەتایانەی لەناوماندا چاند. هەرکەسێ باس لە بوونی شۆڤێنیەتی عەرەبی دژ بە نەتەوەکانی دیکە بکات، یاخود باس لە خێڵەکی و تایفەگەری ئیسلام دژ بە ئاینەکانی دیکە بکات، بە مازۆشیەت و شەیدای ئازاردانی خود تۆمەتبار دەکرێت، ئەمە ئەگەر سیخوڕ و بەکرێگیراوی دوژمنانی نەتەوە نەبێت و ژێر بەژێر دەستی لەگەڵیاندا تێکەڵ نەکردبن. چ کەلتوورێک بەم عەقڵیەتە دۆماگۆییەوە،

**گومانی تێدانییە هەندێ فەیلەسوفی ڕۆشنگەری هەیە دژ بە کۆلۆنیالیزمن، وەك ڕۆسۆو دیدرۆو ئەوانی دیکە. بۆ نمونە ڕۆسۆ دەڵێ: (ڕژێمی کۆیلایەتی تەنها لەبەر ئەوە ڕەتناکرێتەوە کە شەرعیەتی نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە بێ کەڵكو بێهودەیەو هیچ مانایەکی نییە. ڕژێمی کۆیلایەتیو یاسا بە هیچ جۆرێ پێکەوە کۆنابنەوە، ئەوانە دژی یەکترن**



هاشم سالح

دەتوانێ یەک هەنگاو بەرەو پێشەوە بڕوات؟ ئەی کێ بڕوا بەم گوتارە بۆشانە یان بەم گوتارە سواو و تەختەبیانەی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن دەکات؟ ئەی گوتاری ڕاستەقینە لە کوێی هەمو ئەم شتانەدایە؟ ئەوە تەنها فیکری ڕەخنەییە دەتوانێ مەسەلەکان چارەسەر بکات و بیانجولێنێت، نەک فیکری گوێڕایەڵ کە بەردەوام لە خود ڕازییە و هەمیشە کێشە و گرفتەکانمان بە عەلاگەی ئەوانی دیکەدا هەڵدەواسێت.

بۆ ئەوەی زوڵم لە کەس نەکەم یان بۆ ئەوەی هەروا لە خۆڕا قسە نەکەم، سەرەتا مەسەلەکان بەسەر خۆمدا پراکتیک دەکەم و دەپرسم: ئایا لە قوڵایی ناخمدا پاشماوەی ڕەگەزپەرستی دژ بە ڕەشپێستەکان هەبوو؟ ڕاستەوخۆ و بێ هیچ دوودڵییەک دەڵێم بەڵێ. بەڵگەش بۆ ئەوە، ئەوەیە کاتێ من گەشتمە فەرەنسا و لە فرۆکەخانەی (لۆبۆرجی) دابەزیم، سەرمسوڕما لەوەی هەندێ لە پیاوانی ڕەشپێست پۆلیس بوون. ئەوە یەکەم شت بوو لە فەرەنسا بینیم و بە ڕاستی سەرنجی ڕاکێشام. سەرمسوڕما و لە دڵی خۆمدا وتم: ئایا لە فەرەنسا ڕەشپێست هەیە؟ ئایا فەرەنسییەکی شارستانی دەکرێ ڕەشپێست بێت؟ چۆن دەکرێ ڕەشپێستێک فەرمانبەری دەوڵەت بێت و جورئەتی ئەوەی هەبێت لێپرسینەوە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بکات؟ تۆ بڵێی عەقڵ لە سەریدا هەبێت؟ ئاخۆ دەکرێ ڕەشپێستێک ڕۆشنبیر بێت یان تەنانەت خوێندەوار بێت؟ ئەو کێیە تا سپیپێست ڕاوەستێنێت و ڕوبەڕو قسەی لەگەڵدا بکات؟

ئەوە یەکەم بیرەوەریمە کاتێ لە بەرواری ٨-١٠-١٩٧٦ گەشتمە وڵاتی فیکتۆر هیگۆ. بەڵام سەرسوڕمانم لەم ئاستەدا نەوەستا، بەڵکو ئەو کاتەی بۆ فێربوونی زمان گەشتمە شارە شۆخ و شەنگەکەی (بیزانسون) کە لە سنوری سویسراوە نزیک بوو، بینیم مامۆستاکەمان کچێکی تابڵێی شۆخ و شەنگی قژ زەرد بوو، ئەوە گەورەترین خۆشی و کامەرانی بوو بۆ ئێمە، کە کۆمەڵێ خوێندکاری عەرەب بووین. ئێمە بێ ئەوەی تێبگەین مامۆستاکەمان دەڵێ چی، زۆربەی



ڤیکتۆر هیگۆ

کاتمان بە حەپەسان و سەرسامییەوە لە لەنجەولار و بەرزیونزمی جەستە ئارەزوو بزوێنەکەیەوە دەبردە سەر. ئەمە بەبێ ئەوەی هەرگیز لەو تێنەگەشتنە بێزار و بێتاقەت ببین. ئێمە هێندەمان بەس بوو وەک دەبەنگێک لە پۆلەکەدا دانیشین و لەزەت لە بینینی ئەو وەربگرین. من ئەمە دەڵێم بە تایبەتی کاتێ مامۆستاکەمان (مینی جۆب)ی لەبەر دەکرد یان تەنانەت کە پانتۆڵکی زۆر تەسکی لەبەر دەکرد کە خەریکبوو لە تەسکیدا دەتەقی.
مەسەلەکان هەرچۆنێک بێت ئێمە لە حاڵەتێکدابووین شایانی بەزەیی بووین. بەڵام ئەو کارەساتەی کە چاوەڕوانمان نەدەکرد ڕویدا، ئێمە کاتێ بە ڕێکەوت بە شەقامەکانی شاردا دەڕۆشتین، مامۆستاکەمان بینی لـەگـەڵ گەنجێکی ڕەشپێستدا لەئامێزی یەکتربوون و یەکتریان ماچدەکرد! من لە هەندێ لە تێکستە دڵدارییەکانمدا، لە ترسی ئابڕوچوون، تا ئێستا جورئەتی ئەوەم نەکردووە بڵاویانبکەمەوە، باسی ئەوەم کردووە. دروست ئالێرەدا دەستمان لەو مامۆستایەمان بەرداو کەوتینە قسە وتن بە مامۆستاکە و بەم ڕەشپێستە ناشرین و دزێوە، چونکە ئەوەی ئەو بەدەستیهێناوە، ئێمە تەنانەت نەماندەتوانی خەونیشی پێوە ببینین! زۆر بە زەحمەت توانیمان لە ترسناکی ئەم شۆکە ڕزگارمان بێت، ئەمە ئەگەر ڕزگارمان بوبێت. ئەو کات لەبەر پێناخۆشبوون و ئیرەیی و خەمباری، خەریکبوو خۆمان بکوژین، قەیدیناکا خۆکوشتنەکەمان دواخست.
لـەو کاتەدا بۆمدەرکەوت ئێمە زۆر لە میللەتی فەرەنسی، کە تۆمەتبار دەکرا بەوەی میللەتێکی ڕەگەزپەرستی لووتبەرزی ئیمریالیزمن، ڕەگەزپەرست ترین. من تەحەدای هەر کچێکی عـەرەب دەکەم کە بتوانێت لەم شەقامەدا، لەگەڵ ئەم گەنجە ڕەشپێستەدا، تەنها بڕوات، چ جای ئەوەی ماچی بکات یان خۆی وا پیشانبدات کە ئەو گەنجە ڕەشپێستە خۆشەویستەکەیەتی. من ئەوە دەڵێم و ئەو گەنجە ڕەشپێستە داماوە، تەنانەت لەناو ڕەشپێستەکانی دیکەشدا جوان نەبوو. چونکە هەندێ ڕەشپێست هەیە جوانە و هەندێکی دیکەیان هەیە کەمتر جوانن. بەڵام ئەو کچە فەرەنسییە گەر خۆشەویستی کرد، ئەوا بێ هیچ ترس و بەربەستێک دەیکات و ئەوەش بە ئاشکراو بە بەرچاوی هەموانەوە ڕادەگەیەنێت و نایشارێتەوە. پێویستە بزانین ئەوە دوای شۆڕشی خوێندکارانی مایسساڵی ١٩٦٨ ڕویدا، کە دەروازە داخراوەکانی کۆمەڵگای فەرەنسی خستە سەرپشت و لە بەشێکیدا داوای ئازادی سێکسی دەکرد.
بەڵام لە سەردەمی «بۆدلێر»دا، واتە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا، مەسەلەکان تەواو پێچەوانە بووە. لەوە دەچوو کە ئەمڕۆکە لای ئێمەی عەرەب باوە. مەسەلەکان لەو سەردەمەدا پڕ بووە لە حوکمی پێشوەخت دژ بە ڕەشپێستەکان. ئاشکرایە دۆستە

سەرەکییەکەی «بۆدلێر» خانمێکی ڕەشپێست بووە و ناوی «جان دۆڤال» بوو، یان ئەگەر بتانەوێ ناوەکەی بکەن بە عەرەبی ئەوا ناوی «حنە دوفال» بوو. دایکی و سەرجەم ئەندامانی خێزانە بۆرجوازییەکەی «بۆدلێر» بەو مەسەلەیە دووچاری شۆک بوون، دایکی ڕازی نەبوو بیبینێت یان لەماڵەوە پێشوازی لێ بکات، دایکی هەستی بە ترسناکی و بێزاری و ڕشانەوە دەکرد. هەموان لەوە دەترسان کۆمەڵگا بەوە بزانێت کە دۆستی کوڕەکەیان کچێکی قولەڕەشی ڕەشپێستە، چونکە ئەوە سومعەی خێزانەکەی لەکەدار دەکرد و لە بەهای خێزانەکەی کەمدەکردەوە.

بەڵام «بۆدلێر»، بە دەستی ئەنقەست لە ناوەڕاستی شەقامەکاندا لە ئامێزی دەگرت، تاکو ڕق و قینی بۆرجوازیەتی فەرەنسی بوروژێنێت، بەم کارەش تا ئەو پەڕی سنور لەزەتی وەردەگرت و خۆشی لێدەبینی. ئاشکرایە «بۆدلێر» چەند ڕقی گەورەی لە پلە و پایە و پابەندە کۆمەڵایەتییەکان بووە. «بۆدلێر» بەشێک لە جوانترین شیعرەکانی، لەوانە شیعرە بەناوبانگەکەی «بەلەکۆنە» پێشکەش بەو کچە ڕەشپێستە کردووە. وەلێ خەڵکی هەمویان «بۆدلێر» نین! خەڵکی هەمویان شێت یان شاعیرە نەفرەتلێکراوەکان نین کە لە دەرەوەی هەرکۆت و بەندێکی کۆمەڵایەتی دەژین، یان لە دژی هەر کۆت و بەندێکی کۆمەڵایەتی ڕادەوەستن و پێش سەردەمەکەی خۆیان دەکەون.

ئاخۆ دەبێ نهێنی ئەم حوکمە پێشوەختانە دژ بە ڕەشپێستەکان لە چیدا بێت؟ بە تەواوی نازانم. بە دڵنیاییەوە مێژویەکی کۆنی هەیە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە هەرە دێرینەکان. هەموو ئەوەی من دەیزانم ئەمەیە: من پێش ئەوەی بڕۆم بۆ فەرەنسا، لە تەواوی ژیانمدا ڕەشپێستێکم نەبینیبوو، ئایا لە زانکۆی دیمەشق و لەنێو برا سودانییەکانماندا ڕەشپێستێکم بینی بوو؟ لەوانەیە، نایەتەوە بیرم. یاسایەکی نە نوسراو هەیە دەڵێ: سپی سپییە و ڕەش ڕەشە، ڕەنگی سپی هەمیشە لە ڕەنگی ڕەش باشترە. ئایا ڕۆژ لە شەو جوانتر نییە؟ کەواتە مەسەلەکە سروشتییە، ئەبەدییە، سەرمەدییە و ئێمە لەم مەسەلەیەدا هیچ خەتایەکمان نییە. (ئەمەیە ڕەگەزپەرست لە قوڵایی ناخی خۆیدا دەیڵێت، چونکە چیتر ناتوانێت بە ئاشکرا باسی ڕەگەزپەرستیەکەی بکات، بەتایبەتی دوای دەرچونی یاسای سزادانی هەر کەسێک کە تۆمەتبار بکرێت بە ڕەگەزپەرستی



بۆدلێر

و تایفەگەری لە فەرەنسا و هەمو وڵاتانی دیکەی پێشکەوتوو).
بەڵام یەکێک لە نوسەرە ڕەشپێستە بەڕێزەکانی فەرەنسا، ئەم پەرەگرافە جوانە دەڵێت: (ئەگەر پێستەکە ڕەشبێت، ئەوا ڕۆحەکە سپییە. بەڕێزان ڕۆح ڕەنگی نییە. ڕۆحی مرۆڤێکی ڕەشپێست لەوانەیە ڕۆحێکی باش و ڕوون و پڕ بەزەیی بێت و تەواو لە ڕۆحێکی سپی بچێت، یان لەویش زیاتربێت. بۆ نا؟ بۆیە تکایە چیتر لەسەر بنەمای ڕەنگی قژ یان ڕەنگی پێستی دەموچاومان دادگایمان مەکەن).

لە واقیعدا قسەکانی ڕاستن، تەنها ئەوە بەسە لە ئێستادا تەماشایەکی ڕوخساری خانمی یەکەمی ئەمریکا: «میشێل ئۆباما» بکەین، تاکو لەو قسانەی سەرەوە دڵنیابین. ئەوەندە بەسە لە سیماو لە جوانیە ڕەشەکەی و لە مانا مرۆڤانەییەکەی و لە خەندە تاڕادەیەک شەرمئامێزەکەی وردبینەوە، تاکو هەست بکەین ئەو بەڕاستی خانمێکی شکۆمەندە و لە «لۆرا بۆش»ی قژ زەردی ساردوسڕ جوانترە.
بەڵام کێشەکە ئەوەیە حوکمە ڕەگەزپەرستییەکان، حوکمێکی کەللەرەقانەیە و لە دڵ و دەرونەکاندا جێگیرە و ڕەگی داکوتاوە، ئاسان نییە بە تەواوی لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵیکێشیت، لەمەشدا ڕێک لە تایفەگەری یان لە خێڵەکی دەچێت، بگرە لەوانیش زیاترە، چونکە ڕەگەزپەرستی دیارە و بە چاو دەبینرێت. لەبەر ئەم هۆیەیە پێویستە ڕۆشنبیری ڕۆڵی خۆی ببینێت تاکو سنورێک بۆ مەترسییەکانی دابنێت. ئالێرەدا جیاوازییەکی گەورە و فراوان لەنێوان ڕۆشنبیری عەرەبی و ڕۆشنبیری خۆرئاوادا دەبینین. ئەوەی یەکەمیان تا ئێستا ڕەخنەیەکی ڕادیکاڵی لە بیروڕا ڕەگەزپەرستییەکان یاخود لە بیروڕا خێڵەکی و تایفەگەرییەکان نەگرتووە کە تێدا



میشێل ئۆباما

بڵاوبوەتەوە، وەک ئەوەی لە ئەوروپا و لەسەرەتای سەدەی ڕۆشنگەرییەوە تاکو ڕۆژی ئەمڕۆ ڕویداوە.
ڕۆشنبیری عەرەبی وەک دەڵێن هێشتا بەردەم ماڵەکەی خۆی پاکنەکردوەتەوە، سەرجەم ڕۆشنبیری ڕابردوو ئێستامان، پڕە لە حوکمی پێشوەختی ڕەگەزپەرستی و تایفەگەری و خێڵەکی، بەبێ ئەوەی کەسێک جورئەتی ئەوەی هەبێت بەشێوەیەکی جدیی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات. بگرە ئەو حوکمە پێشوەختانە وەک شتێکی ئاسایی و سروشتی لێهاتووە، وەک ئەوەی تەحسیلٌ حاسڵێک بێت و هیچ سەرسوڕمانێک یان هەڵچونێک نەوروژێنێت. ئەگەر یاسا فەرەنسییەکە یان ئەوروپییە شارستانیەتەکە، بەسەر ڕۆشنبیرییەکەمان و میدیاکەمان و کەناڵە ئاسمانیەکانمان و پرۆگرامەکانی خوێندنماندا پیادەکرا، ئەوا ڕۆژانە بە دەیان بێژەر و ڕۆژنامەنوس، بگرە بە دەیان ڕۆشنبیر و مامۆستایانی زانکۆ و بیرمەندە ناسراوەکان، ڕاپێچی دادگا دەکرێن. ئێمە هەندێجار بێ ئەوەی هەست بکەین، حوکمە ڕەگەزپەرستی و تایفەگەری و خێڵەکییەکان دەردەبڕین. هۆکارەکەشی ئاسانە: ئەویش ئەوەیە



لۆرا بۆش

ڕۆشنبیری و کەلتووری عەرەبی ئیسلامی، بە پێچەوانەی ڕۆشنبیری و کەلتووری ئەوروپییەوە، هێشتا دووچاری ڕەخنەیەکی توند نەبوەتەوە، ڕەخنەیەک سەرجەمی کەلتوورەکەمان لە بێژنگ بدات. لە ئەوروپا، نزیکەی دوو سەدە لەمەوبەر تا ڕۆژی ئەمڕۆمان، هیچ شتێکی گەورە و بچوک، لە مەسیحییەدا نەماوە قسەی لەسەر نەکەن و لێکیهەڵنەوەشێننەوە.

کێ دەوێرێ ئەوە لەگەڵ ئیسلامدا بکات؟ ئێمە نزیکەی بیست ساڵ نەمانوێرا کتێبێکی وەرگێڕدراو بە ناونیشانی: ڕەخنە لە عەقڵی ئیسلامی بڵاوبکەینەوە، پەنا بەخوا، ئایا دەکرێ ڕەخنە لە عەقڵی خودایانە بگیرێت؟ تۆ شێت بویت، دۆزەخ بەحاڵت، تۆ چیت لێ بەسەر هاتووە؟ تۆ خۆت دووچاری سەربڕین دەکەیەت، دووچاری مەترسییە گەورەکە دەکەیت. ئەمە لە کاتێکدایە ڕەخنەگرتن لە عەقڵی مەسیحی یان لە ئوسوڵییەتی مەسیحی یاخود لە دەمارگیری کوێرانەی مەسیحی، دەیان ساڵە لە هەمو ناوچەکانی ئەوروپا بووەتە شتێکی سادە و ئاسان، بگرە خەڵکی لێی بێزاربوون.

«محەمەد عابد جابری» بە قسەکردن لەسەر ڕەخنە لە عەقڵی عەرەبی، توانی فێڵ لە مەسەلەکە بکات و خۆی ڕزگار بکات. بەڵام ئێمە دەزانین ڕەخنە لە عەقڵی عەرەبی هیچ مانایەکی نییە، ئەگەر ڕەخنە لە عەقڵی لاهوتی ئاینی نەگرین کە تا ئاستێکی زۆر کۆنترۆڵی عەقڵی کردووە. هەمان شت بۆ ڕەگەزپەرستیش ڕاستە. لە فەرەنسا دەیان یان سەدان کتێب هەیە قسە لەسەر چۆنیەتی دەرکەوتنی ڕەگەزپەرستی فەرەنسی دەکات. باس لەوە دەکات ڕەگەزپەرستی فەرەنسی کەی بووە ڕەوتێکی ئایدۆلۆژی سیاسی لە سەدەی نۆزدەهەمدا و تێزە سەرەکییەکەی چییە و چۆن و بە چ شێوەیەک دەکرێ بەری پێبگیرێت و ڕەتبکرێتەوە...هتد.

لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی ڕابردودا، پێم سەیربوو لە فەرەنسا دیاردەی «جان ماری لۆپین» بەهێز بوو. ئاخۆ هەڵوێستی ڕۆشنبیرە فەرەنسییەکان لە بەهێزبونی ئەو دیاردەیە چۆن بووە؟ تەواو پێچەوانەی هەڵوێستی ڕۆشنبیرە سورییەکان یان بەشێوەیەکی گشتی عەرەبەکان بوو لە دیاردەی تایفەگەری، کە تارادەیەک لە هەمان کات و ساتدا و بە هۆی هەڵکشان و گەشەکردنی ڕەوتە خومەینی و ئیخوانەکانەوە، دیاردەی تایفەگەری بەهێزبیوو. ڕۆشنبیرە فەرەنسییەکان ئەم گوتارە دەبەنگ و گێلەیان نەوت کە هیچ مانایەکی نییە: میللەتەکەمان میللەتێکی باشی نایابە و هیچ دەربارەی ڕەگەزپەرستی نازانێت، ئەم شتانە لە دەرەوە هێنراون یان هەڵبەستراون و ئامانجیشی شێواندن و لەکەدارکردنی میللەتی مەزنی فەرەنسایە! نەخێر، هەرگیز شتێکی لەو شێوەیەیان نەوت. ڕۆشنبیرە فەرەنسییەکان وتیان ڕەگەزپەرستی دیاردەیەکی ڕاستەقینەیە و کۆمەڵ

چین و توێژی دیاریکراو لە دانیشتوان دەگرێتەوە و چەندین هۆکاریشی هەیە، هۆکاری فیکری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەروونی...هتد. بگرە ڕەگ و ڕیشەی بە قووڵایی مێژودا ڕۆچووە. بۆیە پێویستە قسەوباسی لەسەر بکرێت، لێکبدرێتەوە و توێکاری بۆ بکرێت و بەشێوەیەکی جدیی و بە توندی و بێ ڕەحمانە ڕوبەڕوی ڕاستڕەوی پەڕگیر کە دنەی دەدا ڕاوەستین.

ئەمە هەڵوێستی بەشی هەرە زۆری ڕۆشنبیرانی فەرەنسا بوو، بێگومان جگە لە هەڵوێستی ڕۆشنبیرانی گروپی ڕاستڕەوی پەڕگیر و فاشی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە ڕۆشنبیرە پێشکەوتوخوازە لەرزۆکەکانیش، کەوتنە داوەکەوە، وەلێ ئەوانە کەمینەیەکی زۆر کەم بوون. دواتر جەنگەکە لەنێوان هەردوو بەرەکەدا بە ئاشکرا تاوی سەند، تا ئەو کاتەی هەموو لایەکانی کێشەکە دەرکەوت و ڕوون بووەوە، ئیدی ڕەگەزپەرستی لە چوارچێوەی سنورە بەرتەسکەکەیدا مایەوە و توانیان کۆنترۆڵی بکەن.

من ئەمەم بە چاوی خۆم بینی و تێیدا ژیام. بە سەرسوڕمان و سەرسامییەوە، بینیم چۆن دەکرێ فیکری مرۆڤانەی ڕۆشنگەر، لەگەڵ فیکری شۆڤێنی فاشی کە لەسەر ژێی غەریزە تایفی و خێڵەکییە بەرتەسکەکان ئیشدەکات و دەبێتە وەحشێکی ئایدۆلۆژی تێکدەر و بە مەلاین کەس لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە، بچێتە جەنگەوە.

بیرمە لەو کات و سەردەمەدا من کچێکی فەرەنسی هاوڕێم بوو، ناوی «ناتالی» بوو، باوکی و دەوربەرەکەی تاڕادەیەک لەو ڕەوتە ڕاستڕەوە نزیکبوون. بگرە یەکێکیان ڕازی نەدەبوو تەوقەم لەگەڵدا بکات و کەمەکێک پێش ئەوەی من بگەمە



لیۆنێل جۆسپان



محەمەد عابد الجابری



جان ماری لۆپین



ڕێنیە دیکارت

ماڵی کچەکە، ئـەو دەهـاتـەدەرەوە و ماڵەکەی بەجێدەهێشت. «ناتالی» زۆر لەو کەسە بێزار بوو، چەندینجار دەمەقاڵێیان بووە، تا ئەو ئاستەی من ناچاربووم «ناتالی» هێوربکەمەوە و پێم وت سەلام و تەوقەنەکردنی ئەو، هەرگیز بێزارم ناکات. گرنگ ئەوەیە لێمنادات! یان ڕاستەوخۆ جوێنم پێ نادات. پێم وت: ئەم شتە (ڕەگەزپەرستیـ ـە) لەو بەهێزترە و ئەو ناتوانێت لەوە زیاتر بکات. ئیدی کەوتمە لێکدانەوە و باسکردنی نەفسیەتی مرۆڤی دەمارگیر و چۆن ناچارە ئەو کارە بکات کە دەیکات. لای ئەو مرۆڤی عەرەب، هەر لە ڕۆژگاری «شارل مارتل» و جەنگی (بواتییە)ی ساڵی ٧٢٣ زاینی، کەسێکی هەمەجییە و زەرەر و زیانی فەرەنسای دەوێـت. بەتایبەتی مەغریبییەکان دەیانەوێت فەرەنسا داگیربکەن، وەک ئەوەی «لۆپێن» دەیڵێت و قیرەقیرێکی ناوەتەوە و بانگەشەی بۆ دەکات، تاکو لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگی زیاتر بەدەستبێنێت.

بە کورتییەکەی ناچاربووم بەرگری لەو کەسە بکەم، تاکو بە هۆی منەوە لە ماڵەوە کێشە دروست نەبێت. من ئەمە دەڵێم هەرچەندە ڕقەبەرایەتی و دوژمنایەتی ئەو پیاوە بۆ من، ڕقەبەرایەتی و دوژمنایەتیەکی شارستانیانە بوو، ئەمە ئەگەر ئەو دەربڕینە گونجاوبێت. بەو مانایەی ئەو تەنها بەوەندە وازیدەهێنا پێش ئەوەی من بگەم، دانیشتنەکەی بەجێدەهێشت، تاکو ناچار نەبێت تەوقەم لەگەڵدا بکات. ئەمە هەموو مەسەلەکە بوو. بەڵام لە هەندێ چرکەساتدا مەسەلەکان لەگەڵ ئەم ڕەوتەدا، جۆرێک لە شەرمەزای لەخۆدەگرت. بە ڕادەیـەک کاتێ ئێمە لـەشاری (فۆنتنبلۆ) لەناو ئۆتۆمۆبێلدا بووین و وێنەی «لۆپێن» لە هەمولایەکەوە دەورەی دابووین، دوای ئەوەی چوینە ناوجەرگەی ڕاستڕەوەکانەوە، باوکی کچەکەم بینی لەناکاو ڕوخساری من گۆڕا، دەستی خستە سەر شانم و پێی وتم: مەترسە کاکە هاشم، مەترسە..

فێندەمێنیتاڵیزمەکان چی بوو؟ تەواو پێچەوانە بوو. ڕۆشنبیرانی عەرەب سواری پشتی شەپۆلەکە بوون و شانازییان بەوەوە دەکرد کە ئەوان چوونەتە پاڵ میللەت! با لێرەدا باش لە قسەکانم بگەن: ئەمە بەرگریکردن نییە لە سیستمە پۆلیسییە کەساس و فشۆڵەکان کە تاقە خەمیان ئەوەیە چاودێری خەڵکی بکەن و هەناسەکانیان بژمێرن، بگرە لەسەر جیاوازی بیروڕا زیندانییان بکەن.. بەڵام هیچ کەسێ ناتوانێ قەناعەتم پێ بکات ڕۆشنبیرێک باوەڕی بە گەشەکردن و پێشکەوتن و فەلسەفەی مۆدێرن و ڕۆشنگەری هەبێت، دەتوانێ بەو ئاسانییە گوێڕایەڵی ڕێخراوە تێرۆرستییەکان بێت کە لە بنەڕەتدا لەسەر فیکرەی جیاوازی تایفیی نێوان هاوڵاتیان ڕاوەستاوە. ئەم شتە ناچێتە عەقڵمەوە.

ئایا لەو بڕوایەدان هەندێک لە ڕۆشنبیرانی فەرەنسا، لەژێر کاریگەری تێزەکانی ڕاستڕەوی پەڕگیر نەبوون کە ئیشی لەسەر ژێی مەزنی ئیمپراتۆریەت و نەمری فەرەنسا دەکرد؟ ئایا لەو بڕوایەدان لۆپێن کە گوتاربێژێکی دەنگ زل بوو، بە گوتارەکانی کاتێ ئیشی لەسەر ئەم ژێیە هەستیارانە دەکرد، ڕۆشنبیرانی لەناوەوە هەژانێکی گەورە دەیهەژاندن، وەلێ ئەوان لەقوڵایی ناخی خۆیاندا بەرەنگاری ئەم مەیلە دەمارگیرە بونەوە و خۆیان نەدا بەدەستییەوە.

بیرمە «لیۆنێل جۆسپان» کە لە نەوەکانی «ڤۆڵتێر» و «جان جۆریس» و هەمو بزوتنەوە پێشکەوتوخوازەکانی فەرەنسایە، لە مونازەرەیەکی فیکری و سیاسی نایابدا، هاتە ناو گۆڕەپانەکەوە. ئەو کات «لۆپێن» لەوپەڕی سەرکەوتنیدا بوو، هەموو سەرکردەکانی فەرەنسای دەترساند و لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە بەسەر هەمویاندا سەرکەوتبوو.

ئالێرەدا سەنگی مەحەکی ڕاستەقینەی هەر ڕۆشنبیرێک دەردەکەوێت کە پێویستە لەسەر ئەو

بەڵام ئاخۆ هەڵوێستی ڕۆشنبیرانی عەرەب، لە هەمان ئەو کات و ساتەدا، بەرامبەر بە ئاراستەی بوژانەوە و گەشەکردن و هەڵکشانی بزاوتە ئیخوانی و خومەینی و بە شێوەیەکی گشتی بزاوتە



ڤۆڵتێر

سەنگی مەحەکەی دادگایی بکرێت: ئایا ئەو ڕۆشنبیرە لە توانایدا هەیە لەکات و ساتی گونجاودا، بەرامبەر بە ڕەگەزپەرستیە شاراوەکەی ناخی خۆی ڕاوەستێت؟ هەمومان لە ناخی خۆماندا هەڵگری هەندێ لەو ڕەگەزە تایفی و مەزهەبیانەین. بەڵام جیاوازی نێوان ڕۆشنبیر و پیاوێکی باش و سادەی سەر شەقام، لەوەدایە ڕۆشنبیر دەتوانێ کار لەسەر خودی خۆی بکات، دەتوانێ چاودێری پەرچەکردارەکانی بکات، بارودۆخەکە لە هەموو لایەکیەوە شیبکاتەوە و هەڵیسەنگێنێت. زۆر بە کورتی ڕۆشنبیر دەتوانێ بە ئاسانی خۆی ڕادەستی ڕەگەزپەرستییە شاراوەکانی نەکات، ئەگەرنا ئەوا نابێت بە ڕۆشنبیر. لە هەندێ لە دەربڕینەکانمدا کە تاڕادەیەک پەرگیرە وتومە: یەکەم سیفەتی ڕۆشنبیر بریتییە لەوەی ڕۆشنبیر کەسێکە لە خودی خۆی یاخییە! ئەو پێش ئەوەی موحاسەبەی خەڵکانی دیکە بکات، موحاسەبەی خۆی دەکات، چاودێری خۆی دەکات.

لێرەدا هەمیشە پشت بە دەقێکی دیکارت دەبەستم کە شتێکی ئاوا دەڵێ: بڕیارمدا بە هەموو بیروڕا و فیکرەکانی پێشومدا بچمەوە، بگرە تەنانەت لەناویانبەرم! مەبەستی ئەو بیروڕا و فیکرانەیە کە لە ماڵەوەو لە منداڵی و لە قوتابخانە و لەو تەمەنە بچوکەیدا وەریگرتبوون، تەمەنێک نەیتوانیوە ڕاست لە هەڵە، حەق لە ناحەق جیابکاتەوە. بەڵام دوای ئەوەی گەورە بوو، دوای ئەوەی ڕێگای حەقیقەتی دۆزییەوە، لەگەڵ خودی خۆیدا کەوتە ململانێیەکی سەختەوە و بڕیاریدا هەموو بەڵگەنەویستەکانی پێشوو، هەمو خەڵتە کەڵەکەبووەکانی ناو قوڵایی ناخی وێران بکات و تێکیان بشکێنێت. ئەوە پرۆسەیەکی زۆر دژوارە و دەبێتە هۆی نەزیفێکی ناوخۆیی توند. چونکە تۆ لەو ساتەوەختەدا بەرەنگاری ئازیزترین شتی خۆت دەبیتەوە، بەرەنگاری ئەو زانیارییەی لە ماڵەکەت یان لە ژینگەکەت و لە



سپینۆزا

تەمەنی منداڵیدا، فێری بویت.
کێ لە ئێمە گوێبیستی ئەم ئەحکامە تایفی و ڕەگەزپەرستییە پێشوەختانەی خـوارەوە نەبووە دژ بەوانی دیکە؟ کێ لە ئێمە ئەم ئەحکامانەی نـەخـواردوەتـەوە و تێر نەبووە لێی: تەنها ئێمە لەسەر حەقین و ئەوانی دیکە، هەمو ئەوانی دیکە، لەسەر ناحەقن. ئێمە تاقە گروپی فریادڕەسین کە یەزدان پشتوپەنامانە! ئێمە تەنها میللەتێکین کە یەزدان هەڵیبژاردوین، یان باشترین میللەتین هاتوینەتە دەرەوە بۆ خەڵکی. بەڵێ ڕاستە ئێمە لە ساتێک لە ساتەکاندا باشترین میللەت بووین، ئەوە ڕەتناکەمەوە. بەڵام ئایا تا ئێستاش هەر واین؟ ئایا ئەمریکا دوای ئەوەی «ئۆباما»ی ڕەشپێستی هەڵبژارد و لەسەر عەرشی ئەمریکا داینا، باشترین میللەت نییە؟ ئایا ئەمریکا بەسەر خودی خۆیدا و بەسەر ڕەگەزپەرستیەکەیدا سەرنەکەوت کە نەوە دوای نەوە لەسەری پـەروەردە دەبوو؟ ئایا وانەیەکیان فێرنەکردین کە هەرگیز لەبیرناچێتەوە؟ ئاشکرایە ئەو زانستەی لە منداڵیدا وەریدەگریت، وەک نەخشی سەر بەرد وایە و بەزەحمەت دەسڕێتەوە یان دواتر بە زەحمەت دەتوانی خۆتی لێ ڕزگار بکەیت. بەڵام «ڕێنیە دیکارت» لەگەڵ ئەو جیهانە جێگیرە یان لەگەڵ ئەو پاشماوە کەڵەکەبووەی ناو قوڵایی ناخی جەنگاو بە سەرکەوتوویی لێیهاتەدەرەوە. لە ڕاستیدا ئەگەر ئەو جەنگە نەبوایە، ئەوا شتێک نەدەبوو ناوی «ڕێنیە دیکارت»بێت و نەیدەتوانی لـەو کـودەتـا گـەورەیـەدا سەرکەوتوبێت کە دژ بە کەلتوورە چەق بەستووەکەی سەردەمەکەی ئەنجامیدا، نەیدەتوانی فەلسەفەی سکولائیی لابەرێت و لە شوێنیدا فەلسەفەی مۆدرێن دانێت. لەبەر ئەو هۆیەیە «هیگڵ» لەبارەیەوە دەڵێت: ئەو پاڵەوانی سەرکەوتوی فیکرە.
من کاتێ ئەو قسانە دەڵێم، مانای وا نییە چاو لە خراپەکارییەکانی ئەمریکا لە ناوچەکەماندا و لە کێشەکەماندا دەپۆشم، بەڵام من لە هەموو لاکانەوە لە وێنەکە دەڕوانم، نەک تەنها لە یەک لاوە. ئەگەر بۆ تەنها ساتێکیش بێت با کێشەکەمان لەبیر بکەن.
دواجـار هەستدەکەم ئێمە لە مـرۆدا و لە پێناو لێکهەڵوەشاندنەوە و ڕوتکردنەوەی هەموو فیکرە ڕەگەزپەرستی و تایفەگەرییەکان کە لە قوڵایی کەلتوور و دەرونماندا ڕەگی داکوتاوە، پێویستمان بە کەسێتی لە جۆری «دیکارت» و «سپینۆزا» و «ڤۆڵتێر» و ئەوانی دیکە هەیە. بۆچی جولەکە دەمارگیرەکان هەوڵیاندا «سپینۆزا» بکوژن؟ چونکە لە تایفەکەیان هـاتـەدەرەوە، ئەمە پێش ئەوەی لە هەموو تایفەکانی دیکەش بێتەدەرەوە. هەروەها «سپینۆزا» ویستی بنەما قووڵەکانی ئاینی جوولەکە دەرخات و ڕووتی بکاتەوە کە بە درێژایی قۆناغی منداڵی و هەرزەکاری، پێی گۆشکرابوو، لەسەری پەروەردە کرابوو. لێرەوە ئەو یاخیبونی لە دژی خودی خۆی بەرپاکرد و پێش ئەوەی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بجەنگێت، لەگەڵ خودی خۆیدا کەوتە جەنگ. مەزنی «سپینۆزا» ئالێرەدایە. ئەو گەر تەسلیمی ویستی تایفەگەری بوایە و تەنها بەوە وازیبهێنایە کە ئیدانەی تایفەی زۆرینەی مەسیحی دەوروبـــەری بکردایە، ئـەوا شتێکی ئەوتۆی لێ نەدەمایەوە شایەنی باسکردن بێت. بەڵام جەنگ لەگەڵ خود، لە هەمو جەنگەکانی دیکە سەخت و دژوارترە. لەبەر ئەم هۆیەیە لە هەموو سەردەمەکاندا یان لە هەموو نەوەکاندا، چەندین نووسەر هەیە، بگرە چەندین توێژەری ئەکادیمی و مامۆستای بەڕێزی زانکۆ هەیە، بەڵام تەنها ژمارەیەکی زۆر کەم و دەگمەن لە فەیلەسوفی گەورە هەیە کە ڕێڕەوی مێژوویان گۆڕیوە.

سەرچاوە: الاوان، ٧- شوبات- ٢٠٠٩

# ئۆبلۆمۆڤیزم چیە؟

نووسینی: نیکۆلای دۆبرۆلیۆبۆڤ

و. لە ئینگلیزیەوە: سیامەند شاسواری

### تێبینی وەرگێڕ

ساڵی ١٩٩٣ وتارێکی درێـژم نووسی بە ناونیشانی «پەتای ئوبلۆمۆڤیزم، کورد و رێکخراوە سیاسیەکان». ئەو وتارە بە بیانووی ئەوەی زمانەکەی قورسە، بەڵام لەڕاستیدا لەبەر ئەوەی زمانەکەی توند بوو، لەلایەن ئەو لایەنەوە کە کارم لەگەڵ ئەکرد، بڵاو نەکرایەوە؛ هەرچەند دەستاودەست گەڕا. ئەو وتارە بۆچوون و تێگەیشتنی خۆم بوو لە پەتای ئوبلۆمۆڤیزم و بڵاوبوونەوەی لەناو کورددا و بڵاوکردنەوەی لەلایەن رێکخراوە سیاسیەکانەوە... کـە ئوبلۆمۆڤیزم نـەک هـەر پاسیفیسم، بەڵکوو پەتایەکە ویژدانی نەتەوەی لە روانگەی سایکۆلۆجی کۆمەڵایەتیەوە هاڕیوە و وای کردووە کە نەتەوە متمانەی بە خۆی نەمێنێ، بەڵام ئەمەیان، پوختەی ئەو یەکەم وتارەیە کە ساڵی ١٨٥٩ واتە دەسبەجێ لە پاش چاپ و پەخشی رۆمانی «ئوبلۆمۆڤ»ی ئیڤان گەنچارۆڤ وەکوو رەخنە و هەڵسەنگاندنی ئەو رۆمانە، لەلایەن نیکۆلای دۆبرلیۆبۆڤەوە نووسرا و لە گۆڤاری رادیکاڵی Sovremennik واتـە (هـاودەم) بڵاو کرایەوە. کورتەی رۆمانەکە ئەمەیە: بەشی یەکەم ئوبلۆمۆڤ لەسەر قەنەفەکەی راکشاوە، بەشی دووەم ئەچێ بۆ میوانی و دڵی ئەچێتە سەر ئۆڵگا و ئەویش عاشقی ئەم ئەبێ، بەشی سێیەم ئۆڵگا هەست ئەکا هەڵەی کردووە و لێی جیا ئەبێتەوە، بەشی چوارەم ئۆڵگا شوو بە شوڵتز ئەکا و ئەویش بێوەژنێک ئەهێنێ و قوتار!... بەڵام هەر ئەمە بوو بە یەکێک لە ئەستێرە گەشەکانی ئەدەبی رووسی؛ تۆلستۆی بە شاکارێکی مەزن ناوی ئەبا و دۆستۆیڤسکی بە بەرهەمی بیرێکی داهێنەری ئەزانێ... ئەم رۆمانە بە زۆربەی زمانەکان وەرگێڕاوە و کـراوە بە فیلم و شانۆگەری و ئۆپرا و کەسان و توخمەکانی لە هەموو بوارەکانی هونەر و فەلسەفە و سیاست و سایکۆلۆجی کۆمەڵایەتی و تاد... رەنگدانەوەی کاریگەریان هەبووە و تا ئێستەش بەردەوامە و لە توویتر و فەیسبووکیش هەیە. لنین لە چەندەها بۆنەدا ئەماژەی پێ‌ئەکا و بە ماوەیەکی کەم پێش مردنی ئەڵێ ئەم نەخۆشیە هێشتا ماوە: «ئەم کۆنە ئۆبلۆمۆڤە ئەبێ بیشۆی، خاوێنی کەیتەوە، بیکوتی و رایوەشێنی، ئەگەر شتێکی لێ‌مایەوە...» دۆبرۆلیۆبۆڤ کە تەنها بیست و پێنج ساڵ ژیا (١٨٣٦-٦١)، کاتی نووسینی ئەم وتارە بیست و سێ ساڵ تەمەنی بوو، بەڵام لەهەمان کاتدا بە یەکێک لە پێشڕەوانی رەخنەی ئەدەبی رووسی ئەژمێردرا و ئەم وتارەی بۆ بە خۆلقێنەری ئوبلۆمۆڤیزم و یەکێک لە پرشنگدارترین بەرهەمەکانی.

**لە کوێیە ئەو کەسەی دروشمی پیرۆزی «بۆ پێشەوە» بە زمانێك هاوار بكات كە كار بكاتە سەر گیانی رووسەكان. سەدەكان بەدوای یەكدا تێئەپەڕن و ملیۆنەها لە ماڵ خزاوی بێ مێشك و دەست قورس لە سستیەكی قووڵدا خنكاون و تۆ بڵێی كەس هەبێ لەم رووسیەدا كە ئەو هاوارە پیرۆزە بەرز بكاتەوە...**

گۆگۆڵ



نیکۆلای دۆبرۆلیۆبۆف

ئوبلۆمۆڤ لە ئەدەبی رووسـیدا بە هیچ شێوەیەک کەسایەتیەکی تازە نییە. بەڵام هەرگیز بەو سادەیی و رەسەنیەی لە رۆمانەکەی گەنجارۆڤدا ئەبینرێ، پیشان نەدراوە. بە بێ ئەوەی پێویست بکا زۆر بۆ رابردوو بگەڕینەوە، تایبەتمەندییە بنەڕەتیەکانی کەسایەتی ئوبلۆمۆڤ لە ئونەگیندا[1] ئەبینین و لە چەندین شوێنی تریش لە باشترین سەرچاوە ئەدەبیەکانی روسیدا چاومان پێی ئەکەوێ. گرنگ ئەوەیە نموونەی ئوبلۆمۆڤ، ئەو نموونە بوومی و نەتەوەییەیە کە هیچکام لەو هونەرمەندانەی کە بەڕاستی حەزیان لە کارەکەیان بووە، نەیانتوانیوە پشت گوێی بخەن. بەڵام لەگەڵ رەوتی کات و لەگەڵ گۆڕانی تێگەیشتنی کۆمەڵایەتی جەماوەر، ئەم روخسارەش گۆڕاوە و پەیوەندییەکی نوێی لەگەڵ ژیان پێک هێناوە و چەمکێکی تازەی وەرگرتووە. سەرنجدان لەم قۆناغە تازانەی بوونی ئەم نموودە و لێکۆڵینەوەی ماهەکی ئەو چەمکە نوێیەی، هەمیشە کارێکی دژوار بـووە و ئـەو هونەرمەندە بەهرەمەندەی کە سەرکەوتوانە ئەو کارەی ئەنجام داوە، خزمەتێکی مەزنی لە پێشخستنی ئەدەبی ئێمەدا هەلگرتووە و؛ گەنجارۆڤ بە رۆمانی ئوبلۆمۆڤ چووەتە ریزی ئەو بەهرەدارانەوە. ئێمە، لێرەدا لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی کەسایەتی ئوبلۆمۆڤ ئەکۆڵینەوە و پاشان لایەنە لێکچووەکانی نێوان ئوبلۆمۆڤ و کەسانی چوون ئەو کە لە سەردەمە جۆراوجۆرەکان لە ئەدەبی ئێمەدا دەرکەوتوون، بەکورتی ئەخەینە روو.

تایبەتمەندییە گرنگەکانی کەسایەتی ئوبلۆمۆڤ کامانەن؟ سستی و بێوازی لە ڕادەبەدەر، کە ئەنجامی بێلایەنی ئەوە بەرامبەر بە هەموو دیاردەکانی ئەم جیهانە. ئەم بێخەیاڵبوونە، بەشێکی هۆکاری دەرەکی هەیە و بەشێکی بەرەنجامی چۆنێتی پێگەیشتنی ئاوەز و رەوشتی ئەوە. هۆکاری دەرەکی واتە باری کۆمەڵایەتی ئەو. نووسەر ئەنووسێ: «ئەو زاخارێکی[2] لەبەردەست دایە و سێسەد زاخاری تریش». ئیلیا ئیلیچ (ئوبلۆمۆڤ) تازیاری[3] باری کۆمەڵایەتی خۆی بەمجۆرە بۆ زاخار بەیان ئەکات:

1- پاڵەوانی رۆمانە شیعری پوشکین «Eugene Onegin».

2- زاخار، جووتبەندەیەکی خزمەتکاری ئوبلۆمۆڤە و سێسەد زاخارەکەی تریش ئەو بەندانەن کە هی ئەون و بەشێکن لە زەوی و داراییەکەی.

3- ئیمتیاز.

«ئایە من هەڵپەمە و نیگەرانم؟ من کار ئەکەم؟ من کەم ئەخۆم؟ من لەڕ و لاوازم؟ مرۆڤ دڵی بۆم ئەسووتێ؟ لە هیچم کەمە؟ بە ئەندازەی پێویست مرۆڤم نییە خزمەتم بکەن؟ شوکری خوا، هەرگیز گۆرەویەکانیشم خۆم لە پێم نەکردووە. تۆ پێت وایە لە داهاتوودا کێشەم ئەبێ؟ بۆ ئەبێ کێشەم هەبێ؟ ئەم قسانە بۆ کێ ئەکەم؟ مەگەر تۆ خۆت هەر لە مناڵییەوە خزمەتکاری من نەبوویت؟ تۆ خۆت هەموو ئەم شتانە باش ئەزانی. تۆ بینیوتە لە چ ناز و خۆشگوزەرانیەکدا گەورە بووم. تۆ ئەزانی هەرگیز سەرما و برسیەتیم نەچەشتووە. هەرگیز دەستم تەنگ نەبووە و بۆ پاروە نانێک کارم نەکردوە و بەگشتی هەرگیز کارم نەکردووە.




ئەوەی ئوبلۆمۆڤ ئەیڵێ راستیەکی تەواوە. تێکڕای مێژووی پەروەردە بوونی ئەم راستیە ئەسەلمێنن. لە هەمان سەرەتای مناڵیەوە ڕاهاتووە بە تەوەزەلی و کارنەکردن و تەمەڵی. چونکە هەمیشە کەسانێکی هەبوو کە هەموو کارەکانی بۆ بکەن. بەمجۆرە ئەگەر نەشیویستایە، ناچاری ئەو ژیانە تەوەزەل و بێخەیاڵە بوو. جا خۆت سەرپشک بە، کەسێک کە بەوجۆرەی لە خوارەوە باس ئەکرێ، گەورە بووبێ، چی لێ چاوەڕوان ئەکرێ:

زاخار، دایەنەکەی (دایەنی ئوبلۆمۆڤ)، هەروەک لە ڕابردوودا، گۆرەوی و پێڵاوی لە پێ ئەکا و ئیلیۆشا کە ئێستە چواردەساڵانە، خۆی ئەڕەنجێنێ و لە کاتێکا ڕاکشاوە، سەرەتا قاچێک و پاشان ئەوی تری بۆ لای زاخار رائەکێشێ و ئەگەر شتێکی بەدڵ نەبێ، لەقەیەک ئەکێشێ بە کەپۆی زاخاردا. ئەگەر بێت و زاخار لەو کردەوەیە بڕەنجێ و سکاڵا ببا بۆلای گەورەی ماڵ، خۆی تووشی گوێ بادان کردووە. پاشان زاخارکا قژی ئیلیا ئیلیچ شانە ئەکا و ئێلەکەکەی بۆ رائەگرێ و بە پارێزەوە دەستەکانی ئەکا بە قۆڵی ئێلەکەکەدا، بۆ ئەوەی جەنابی خۆی نەڕەنجێنێ. پاشان ئەیخاتەوە بیری کە ئەبێ وا بکا و وا بکا و وا بکا: بۆ وێنە بەیانیان کە لە خەو هەڵئەسێ، دەست و چاوی بشوا و لەم بابەتە.

ئەگەر ئیلیا ئیلیچ پێویستی بە شتێک هەبێ، ئەماژەیەک بەسە بۆ ئەوەی سێ چوار خزمەتکار فڕکە بکەن بۆ ڕاپەڕاندنی داخوازییەکەی. یان ئەگەر شتێک لە دەستی بکەوێتە خوارەوە، یان ئەگەر بە دوای شتێکەوە بێ و دەستی نەکەوێ، یان بۆ بەدەستهێنانی شتێک هەوڵ بدا: چونکە مناڵێکی بزۆزە و هەندێجار هەوڵ ئەدا خۆی کارەکەی ڕاپەڕێنێ، باوک یان دایک و سێ پوورەکەی یەک لەوی تر بەرزتر ئەقیژێنن:

-«بۆ کوێ ئەچی؟ بۆچی ئەچی؟ ئەی ڤاسکا و ڤانکا و زاخارکا چی ئەکەن؟ هۆی ڤاسکا و ڤانکا و زاخارکا

چی ئەکەن لەوێ خڕبوونەتەوە؟ راوەستن تا دەستم پێتان ئەگا.»
بەمجۆرەیە کە ئیلیا ئیلیچ رێگە نادرێ خۆی هیچ کارێک بکات. بەڵام پاشتر حەز لەو دارەتە ئەکات و فێر ئەبێ کە ئەویش لە ئاستی خۆیەوە دەنگ هەڵێنێ و هاوار بکا: «هۆی، ڤاسکا، ڤانکا ئەو شتەم بەرێ، ئەو شتەم بۆ بێنە! نا، ئەمەم ناوێ، ئەوەم بەرێ، خێرابە، زووکە!...»
کارتێکردنی ئەو بارودۆخەی ژینگەی منداڵەکە لەسەر پەروەردەی داهاتووی ئاوەز و رەوشتی ئەو، پێویستی بە شرۆڤەکردن نییە. وزەی دەروون و شۆری جەوانی منداڵ «سست ئەبێ و دائەمرکێ.» تەنانەت ئەگەر منداڵەکە هەندێجار وزەی خۆیشی تاقی بکاتەوە، بە هەوەس ئەو کارە ئەکا و لەوپەڕی دفرە و خۆبەزل زانین چاوەڕێی ئەوەیە دەست و پێوەن کارەکانی بۆ راپەڕێنن. ئاشکرایە کە جێبەجێکردنی حەزەکانی منداڵ ئەبێتە هۆی لاوازی کەسایەتی و، لە ڕاستیدا دفرە و خۆبەزل زانین لەگەڵ گەورەیی و دڵفراوانی ناگونجێ. ئەو منداڵەی کە رادێت داواکاری نابەجێی لە خەڵکانی فەراگەردی خۆی هەبێ، دەسەڵاتی سنووردانان بۆ ئارەزووەکانی خۆی لەدەست ئەدا و توانای ئەوەی نامێنێ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی کەڵک لەو ئامێرانە وەربگرێ لەبەردەستی دایە و، هەر ئەوەندەی تووشی لەمپەرێک بوو کە لابردنی پێویستی بە تێکۆشان هەبێ، تێدا ئەمێنێتەوە و دەستەوەسان ئەبێ. منداڵێکی وەها کاتێکە گەورە ئەبێ کەموزۆر ئوبلۆمۆڤێکی لێ دەرئەچێ کە سستی و لاوازی ئەوی هەیە و هەرچەند بتوانێ تا رادەیەکیش بیشارێتەوە، بەڵام هەمیشە لە هەوڵدانی راستەقینە و سەربەخۆ بێزارە و ئەترسێ.
هۆکارێکی گرنگ لێرەدا خەمڵین و گەشەکردنی بیر و بۆچوونی کەسانی وەکوو ئوبلۆمۆڤە کە دیارە ئەویش لە ژێر کاریگەری ژینگەی دەرەوەدا ئەخەملێ و فۆرم وەرئەگرێ. کەسانی لە بابەتی ئوبلۆمۆڤ لە هەمان منداڵیەوە جیهانی فەراگەردی خۆیان بە ئاوەژوو ئەبینن و تا کۆتایی ژیان لەوە تێناگەن کە پەیوەندی ئەوان لەگەڵ جیهانی دەوروبەر و مرۆڤەکانی ئەبێ بە چ شێوەیەک بێ. پاشان زۆر لە دیاردەکانیان بۆ روون ئەکرێتەوە و تازە ئەگەن بەوەی کە شتێکی لێ تێبگەن. بەڵام ئەوەی لە سەرەتای منداڵیەوە فێریان کراوە و ئاخنراوە بە مێشکیاندا، لە سووچێکا خۆی مەڵاس ئەدا و بەردەوام سەرەتاتکێیەتی و رێگە لەوە ئەگرێ بۆچوونی تازە دروست ببێ و لە دڵدا رەگ داکوتێ... لە ئەنجامدا مێشکیان پڕە لە پشێوی و غەڵبەغەڵب. هەندێجار ئەیانەوێ هەنگاوێک هەڵبگرن، بەڵام نازانن چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەن و... ئەمەش سەیر نییە. مرۆڤێکی ئاسایی هەمیشە ئەیەوێ کارێک بکات کە ئەتوانێت. بۆیەشە دەسبەجێ ئەوەی کە ئەیەوێ، ئەیکات... بەڵام ئوبلۆمۆڤ رانەهاتووە هیچ کارێک بکات. بۆیە لەڕاستیدا ناتوانێ ئەوە بزانێ کە چ کارێکی بە لێبڕاوی پێ ئەکرێ و چ کارێکی پێ ناکرێ– ئەنجام ئەوەیە کە هیچ شتێکی هەتەر و چالاکی ناوێ... ویستەکانی ئەو هەمیشە ئەم شێوازە هەڵئەبژێرن: «خۆزگە ئەو کارە بکرایە.» بەڵام نازانێ ئەم کارە لە چ رێگەیەکەوە جێبەجێ ئەبێ. لەم سونگەیەوە هەمیشە حەزی لە خەیاڵ و زیندەخەونە و لەو کاتە ئەترسێ کە خەیاڵی لەگەڵ رۆژەڤی ژیان یەکانگیر ئەبێ. لەم ساتانەدا هەوڵ ئەدا بارەکەی خۆی بخاتە سەر ئەستۆی یەکێکی تر و ئەگەر ئەو کەس و ئەستۆیە لە ئارادا نەبێ، جا چییە، خوا گەورەیە، رەنگە رێگەیەک پەیدا ببێ...
هەموو ئەم ئەدگار و تایبەتمەندییانە لە نەخشاندنی کەسایەتی ئوبلۆمۆڤدا، سوودیان لێوەرگیراوە و بەوپەڕی تواناوە جەختیان لەسەر کراوە. نابێ هەرگیز وا بیربکەینەوە کە ئیلیا ئیلیچ لە رەگەزێکی تایبەتە و سستی و بێزاری لە جووڵان لە تایبەتمەندییە سەرەکی و بنەڕەتیەکانی ئەوە. هەرگیز نابێ وای دابنێین کە سروشت، گەوهەری ئەوی لە توانای جووڵان بە ویستی

خۆی بێوەری کردووە. هیچ شتی وا نییە. سروشت، تێکڕای ئەو بەهرانەی بە هەموو مرۆڤێکی داوە، بەویشی بەخشیوە. ئەوسا کە منالْ بوو ئەیویست ڕاکەڕاکە بکات و لەگەلْ منالانی تر شەڕەتۆپەلْ و خلیسکێن بکات و یان ئەو شتانەی کە ئەیویست خۆی بەدەستیان بهێنێ. هەلْێ بۆ ناو شیو و گەلیی و خۆی بکا بەناو سپیندارەکاندا و بەسەر پەرژینەکاندا خۆی هەلْدا و لە ئاودڕەکان بپەڕێتەوە. لە مالْی ئوبلۆمۆڤ، کاتێک کە هەرکەسە و سووچێکی ئەگرت و وەک هەمیشە لێی ڕائەکشا تا وەنەوزێک بدات، ئەو بە هەلی ئەزانی و هەلْئەسا، «... بە ترس و لەرزەوە چووە بەرهەیوان (کە کەس بۆی نەبوو بچێتە ئەوێ، چونکە بۆی هەبوو لەپڕ دارمێ.) و تەختە ڕزیوەکان لە ژێر پێیدا جیرەیان لێوە ئەهات، دەوری دایەوە و چووە کۆترخانەکەی سەر و بە دزیکەوە چوو بۆ ئەوبەری باخەکە و گوێی لە ویزەویزی زەرگەتەیەک ڕاگرت و سەیری فڕینی کرد تا لەچاو ونبوو.» هەندێجار «خزایە خوارەوە بۆ ناو گەلییەکە. لەوێ کەوتە گەڕان و ڕەگی هەندێ گیای لە خاک دەرئەکێشا، پێستەکەی لێ ئەکردەوە و بە تامەزرۆییەوە ئەیخوارد و لەو سێو و مرەبایەی دایکی پێی ئەدا لەلای خۆشتر بوو.» ئەم ڕەفتارانە ئەبوایە ببن بە هۆی ڕسکانی ئاکارێکی ئارام و لەسەرخۆ، بەلام هەرگیز نەئەبوونە هۆی سستی و تەوەزەلی. جگە لەمەش ئارام بوون کە ڕەنگە بگۆڕێ بە کەمڕوو بوون و خووگرتن بەوەی کە شان بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبای خەلْکی دانەوێنی، هەرگیز ئەدگارێکی خۆڕسک و سروشتی نییە، هەروەکوو دفرە و رووداماڵراوی و کەلْەگایی کردن، خوو و ڕەوشتی بەدەست هاتوون و نێوانی ئەم دو ئەدگارە ئەوەندە زۆر نییە کە بەڕوالەت بەرچاو ئەکەوێ. کەس ناتوانێ بە ئەندازەی نۆکەرێک لووتی بەرز ڕابگرێ و کەسیش ئەگەر خۆی کوڕنشبەر و مەراییکەر نەبێ ناتوانێ لەگەلْ بندەسیەکانی خۆی بە ڕەقی هەلْسووکەوت بکات و چاوەڕوانی ئەوە بێ کە کوڕنشی بۆ ببەن و ماستاوی بۆ بکەن. ئیلیا ئیلیچ سەرەڕای هەموو ئارامی و خانەدان بوونی، هیچ لەوە ناپرنگێتەوە کە لقە لە کەپۆی زاخار بدات، ئەگەریش لە خولەکانی دواتری ژیانیدا ئەو کارە ناکات تەنها لەبەر ئەوەیە کە ئەترسێ بەرەنگاری ببنەوە و ئەویش ناچار ببێ بۆ داکۆکی کردن لە خۆی کۆششێک بکات. هەرچی چۆن بێ ئەو چالاکیەکانی خۆی بەو سێسەد زاخارەوە گرێ ئەدا کە هەیبوو و، ئەگەر ژمارەی زاخارەکانی سەد یان هەزاریش زیاتر بوایەت، لەگەلْیان تووشی کێشەی بەرەنگاربوونەوە نەئەبوو و پەیوەندی لەگەلْ هەرکەس هەرجۆرێک بوو، هەر بەو جۆرە لەگەلْی ئەجوولایەوە. بەلام ناکرێ ئەم شێوە ڕەفتارکردنە بە بەلْگەی ڕەوشتێکی توورە و دلْڕەقانە دابنرێ. خودی ئوبلۆمۆڤ و کەسانی دەوروبەریشی ئەمجۆرە ڕەفتارەیان بە شێوازێکی سروشتی و پێویست ئەزانی... بە بیری هیچکامیاندا نەئەهات کە ئەکرێ شێوە ڕەفتارێکی تر بەکار بهێنن. بەلام خوشبەختانە یان بەدبەختانە ئیلیا ئیلیچ بە وردەمالیک لەدایک ببوو و داهاتی زەویوزارەکەشی لە دە هەزار ڕوبلی ئەسکەناس٤ تێپەڕی نەئەکرد. لە ئەنجامدا تەنها لە خەیالْدا تەوەری چارەنووسی جیهانی بەدەستەوە ئەگرت و، لەو زیندەخەونەشیدا حەزی ئەکرد نەبەرد و جەنگاوەر بێ و، ویستی بەرزەفڕی و شەڕخوازانەی هەبوو.

هەندێجار وازی ئەوەی هەبوو خۆی بە سەردارێکی هەمیشە براوە بزانێ کە نەک هەر سپای ناپلیۆن، بەلْکوو تەنانەت یارۆسلان لازارۆڤیچیش٥ لە بەرامبەریدا خۆی ڕانەگرێ. ئەو خۆی بە سەرداری ئەم سپا جەنگاوەرە ئەزانێ. ئەو سپایەی دژی هۆزەکانی باکووری ئەفریقا سازدراوە کە ئورووپایان داگیرکردووە. یان ئەوەی

٤- روبلیکاغەز یان بە فەرانسی **Assignat** و بە ڕووسی **Assignatsia** پارەیەک بوو کە نرخی لە روبلی زیو کەمتر بوو و لە ١٧٦٩ تا سالْی ١٨٤٣ کە خڕیان کردەوە و لە بازاڕ دەریان هاویشت، لە رووسیە باو بوو. هەرچەند تا ئێستاش لە هەندێ ولاتی وەکوو ئێران بە پارەی کاغەز ئەوترێ ئەسکەناس.

٥- گوایە هەمان ئەمیر ئەرسەلان بێ.



ئیڤان تۆرگینۆف

کە جەنگی نوێی خاچپەرستانی بەرپا ئەکردەوە و ئەکەوتە داگیرکردنی وڵاتان و یاخیەکانی سزا ئەدا یان گوناهەکانیانی ئەبەخشی و لە جوامێری و مەزنیدا هاوتای نەبوو.

هەندێجار خۆی بە بیرمەندێکی پیتۆڵ یان هونەرمەندێکی گەورە ئەزانی کە شەپۆلی لایەنگران بە دوایدا بەڕێوەن. دیارە کە ئوبلۆمۆڤ پیاوێکی دەبەنگ و دڵمردوو نییە و هەستی خودپەرستی و بەرزەفڕی تێدایە. تەنانەت ئەویش لە ژیان دا بەدوای شتێکدا ئەگەڕا و بیری لە شتێک ئەکردەوە. بەڵام ئەو خووە ناپەسەندەی کە هەرچی پێویست بێ، نەک بە وزە و توانای خۆی، بەڵکوو بە هێزی بازووی ئەوانی تر بەدەستی بهێنێ، سستی و تەمەڵیەکی لەودا بەدی هێنابوو، ئەوی لە گێژەنی ملکەچیی رەوان و رەوشتدا نوقم کردبوو. ئەم ملکەچ بوونە وەها لەگەڵ خوو و خدەی خانەدانبوونی ئوبلۆمۆڤدا لێک ئاڵابوون، کە بە شێوازێکی دوولایەنە دژەیان ئەکردە ناو یەک و کاریان ئەکردە سەریەک، کە جیاکردنەوە و سنووردانان بۆ ئەو دوو دیاردەیە دژوار و رەنگە نەگونجاو بوو. ئەم کۆت و بەندە دەروونیەی ئوبلۆمۆڤ رەنگە سەرنج ڕاکێشترین رواڵەتی کەسایەتی و سەرتاپای ژیانی ئەو بێ... بەڵام چۆن ئەبێ کەسێک سەربەخۆیی ئیلیا ئیلیچی هەبێ، کەچی بکەوێتە گەرداوی کۆیلەتیەوە؟ هەرکەس چێژ لە ئازادی وەربگرێ هەر پێی ئەگا. ئەو فەرمانبەری میری نییە و ناچار نییە لەگەڵ خەڵکی هەڵسوکەوت و هاتوچۆ بکات و داهاتێکی مسۆگەریشی هەیە... بەوە دفرەیە کە کوڕنش بۆ کەس نابا و سووکایەتی لە کەس قبووڵ ناکا و وەکوو «ئەوانیتر» نییە بەردەوام کار بکات و بەیانی تا ئێوارە راکەڕاکەی بێت و رۆژێک کار نەکات، شەو نەیبێ بیخوات... ئەو گرێ ئەوینێکی ئامێتەی رێز لە ناخی بێوەژنەکەی پشەنتیسینادا دائەگیرسێنێ، چونکە ئەو خانەدانە، چونکە ئەو پۆشتە و پەرداخە و ئەدرەوشێتەوە، چونکە ئازاد و سەربەست بۆ هەموو شوێن ئەچێ و چێ بوێ ئەیڵێ: «چونکە بەردەوام خەریکی کۆپیکردنی نامە و سکاڵا نییە؛

لەوە ناترسێ درەنگ بگاتە سەر کار؛ نیگای پڕ نییە لە پاڕانەوە و خەمی ئەوەی نییە کورتانی بکەن و سواری ببن. بەڵکوو بەوپەڕی بوێرییەوە ئەڕوانێتە هەموو شتێک و ئەیەوێ هەموان کوڕنشی بۆ ببەن.» بەڵام سەرەڕای ئەمەش تێکڕای ژیانی ئەم پیاوە نقوم بووە چونکە هەمیشە بەندەی ویستێکی ترە و هەرگیز رانابێ و بچووکترین نیشانەی سەربەستی دەرنابڕێ. ئەو کۆیلەی هەموو ژنێک و هەموو تازە پێگەیشتوویەکە؛ کۆیلەی هەموو ئە فێڵەبازانەیە کە ئەیانەوێ بیخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. کۆیلەی زاخاری نۆکەری خۆیەتی؛ بەڕادەیەک کە نازانرێ کێ زیاتر فەرمانبەری ئەویترە؟ هەرچی چۆن بێ، ئەگەر زاخار نەیەوێ کارێک بکات، ئیلیا ئیلیچ ناتوانێ ناچاری بکات؛ ئەگەریش زاخار بیەوێ کارێک بکات، ئەیکات، هەرچەن ئاغەی دژی ئەو کارە بێ و-ئاغە کۆڵ ئەدا... ئەمەش دیاردەیەکی ئاساییە: هەرچی چۆن بێ زاخا توانای ئەوەی هەیە کارێک ئەنجام بدا، بەڵام ئوبلۆمۆڤ ناتوانێ هیچکارێک بکات. پێویست بەوە ناکا باسی تارانتیەڤ و ئیڤان ماتڤەیچ بکەین کە لە روانگەی توانایی بیر و تێگەیشتن و هەروەها چۆنیەتی رەوشتەوە زۆر لەو لەخوارترن و هەر کارێکیش بیانەوێ ئەیکەن... هۆی ئەمە ئەبێ چی بێ؟ وەڵام دیسانەوەش ئەمەیە، چونکە ئوبلۆمۆڤ «خانەدانە» و حەز ناکا کار بکات. ناتوانێ بیکا ئەگەر بشیەوێ؛ واتە ناتوانی لە پەیوەندی نێوان خۆی و دەوروبەرەکەی تێبگات. ئەگەر جووڵان و هەڵسووڕان لە کەوشەنی خەیاڵ تێنەپەڕێ لێی بێزار نییە: کەوابوو گەڵاڵەیەک بۆ هەندێ چاککاری لە زەویوزارەکەیدا دائەڕێژێ و زۆر ئازایانە، هەڵبەت لە دنیای خەیاڵدا، خۆی بۆ تەرخان ئەکات. بەس «وردەکاری و قرساندنی تێچوو و ژمارەکان» تووشی ترس و خۆفی ئەکا و بەردەوام ئەم تێبینیانە پشت گوێ ئەخا، چونکە ئەو کارە بەو هەڵناسووڕێ... ئەو مرۆڤێکی خانەدان و نەرمونیانە و، وەک خۆی بۆ ئیڤان ماتڤەیچی روون ئەکاتەوە:

-من کێم؟ من چیم؟ ئەتانەوێ بزانن؟... بڕۆن لە زاخار بپرسن. ئەو پێتان ئەڵێ کە من «پیاوێکی پیاوانەم». بەڵێ «پیاو»م و جگە لەوەش نابم و هیچ کارێکیش بە من ناکرێ. ئەگەر ئێوە ئەتوانن یارمەتیم بدەن، کارەکەم بۆ بکەن و هەقدەستی خۆشتان هەڵگرن-شارەزایی و کارزانی نرخی خۆی هەیە.

ئایە پێتان وایە کە ئەو تەنها بەم شێوەیە خۆی لە کار ئەدزێتەوە و، تەمەڵی و تەوەزەلی خۆی لە بن سەرپۆشی نەزانیدا ئەشارێتەوە؟ نەخێر، ئەو بەڕاستی نازانێ هیچ کارێکی سوودمەند ئەنجام بدا و بەڕاستی ناتوانێ هیچ کارێکی بەکەڵک بکات؛ بەڕاستی توانای ئەوەی نییە لە هیچ پلانێکی بەکەڵک سەردەر بکا. سەبارەت بە زەویوزارەکەی (کە نەخشەیەکی بۆ چاککاری و نۆژەنکردنی داڕشتووە) بەم شێوەیە لەلای ئیڤان ماتڤەیچ دان بە نەزانی خۆیدا ئەنێ:



ئیڤان ئەلکساندەرۆڤیچ
کەنجارۆڤ

-ئەوەتا من نازانم جووتبەندە٦ چییە؟ جووت و بێگار چییە؟ جیاوازی نێوان جووتیاری هەژار و دەوڵەمەند کامەیە؟ نازانم کیلێک جۆ چەندە و گیشەیەک وێنجە بایی چەندە. نازانم تۆوی ئەو بەرهەمە کەی ئەچێنن و کەی ئەیدوورن و هەڵی ئەگرن و چ کات ئەیفرۆشن! نازانم خۆم دەوڵەمەندم یان هەژارم و ساڵێکی تر ئەمکاتانە هیچم ئەبێ بیخۆم یان کەوتوومەتە گەدایی. هیچ نازانم!... جا تۆ قسە بکە، ئامۆژگاریم بکە بەوجۆرەی مناڵێک ئامۆژگاری ئەکەی...

ئیلیا ئیلیچ بـەم شێوەیە ئەیڕوانیە ژیـان. ئەو بەختەوەرییەی ئەو بۆ شوڵتزی باس ئەکا بریتی بوو لە ژیان لەوپەڕی ئاسایش و خۆشی، لە نێوان گەرمخانەکان و گوڵخانەکان و سەیران و نانخواردن لە جەنگەڵ و بە دەوری سەماوەر و هتد؛ سارغی لەبەردا، خەوی قووڵ و ئارام و لە بەینیشیاندا، هەر بۆ خۆشی و رابواردن، پیاسەیەک لەگەڵ هاوسەرێکی خرپن و ژیکەڵە و سەیرکردنی جووتیارەکان لە کاتی کارکردندا. بیر و هۆشی ئوبلۆمۆڤ لە سەردەمی مناڵیەوە بە جۆرێک دەقـی گرتووە کە ئەتوانێ، تەنانەت لە کاتی ئەبسترەترین مشتومڕەکان و، لەکاتی ئارمانی ترین تیۆریەکان، دەسبەجێ لە کاتی ئێستەدا بچەقێ و سەرەڕای هەموو دوانێک لە کاتی ئێستا دوور بکەوێتەوە. ئیلیا ئیلیچ لە کاتی وێناکردنی خۆشبەختی ئارمانی خۆیدا هەرگیز بیری لەوە نەئەکردەوە سەبارەت بە چەمکی خودی ئەو خوشبەختیە، پرسیار لە خۆی بکا، یان گومان لە راستی یان رەوابوونی بکات. هەرگیز لە خۆی نەئەپرسی کە ئەم گوڵخانە و جامخانەیە لە کوێوە و چۆن پێک ئەهێنرێ، کێ ئاگای لێیان ئەبێ و ئەوە چۆنە کە ئەو بۆی هەیە چێژیان لێوەرگرێت؟... چونکە نەی ئەتوانی ئەم پرسیارە بکات و نەی ئەتوانی جۆری پەیەندی خۆی لەگەڵ ئەو ژینگە و کۆمەڵەی تێیدا ئەژیا روون بکاتەوە. هەڵبەت نەی ئەتوانی لە چەمکی ژیانی خۆیشی بگات و لە ئەنجامدا هەموو ئەو کارانەی کە ئەبوایە بیکات لەلای ماندووکەر و بێزارکەر ئەینواند. کاتێکە فەرمانبەری میری بوو نەی ئەتوانی لەوە تێبگات کە ئەو هەموو کاغەزە بۆ ئەبێ بنووسرێ؛ کە لەوە نەئەگەیشت بیری لە هیچ نەئەکردەوە جگە لەوەی خۆی کارکەنار بکا و لە نووسینی نامە رزگاری ببێ. خرابوویە بەر خوێندن، بـەڵام نەی ئەتوانی لە سـوودی ئەوەی کە خوێندبووی تێبگات و؛ کە نەی ئەتوانی لەوە بگات، هەموو پەرتووکەکانی لە سووچێکا هەڵچنیبوو و گوێی لەوە نەبوو تۆز دایان ئەپۆشێ. چووە ناو کۆمەڵ و جەماوەر، بەڵام لەوە تێ نەئەگەیشت کە خەڵکی بۆچی سەردانی یەکدی ئەکەن و؛ کە لەوە تێ نەئەگەیشت لە هاوڕێکانی دوورکەوتەوە و رۆژانی لە دوای یەک بە بـەردەوامـی لەسەر قەنەفەکەی راکشابوو. هەوڵی دا لەگەڵ ژن تێکەڵ ببێ، بەڵام کە لە خۆی پرسی چی لە ژنان ئەوێ، مرۆڤ چی لە ژن ئەوێ؟ کاتێکە زۆری بیر لێکردەوە و وەڵامی بۆ نـەدۆزرایـەوە؛ لە ژنان دوورکـەوتـەوە... هەموو شتێک ماندووی ئەکرد و ئەبوویە هۆی وەڕەسبوونی. خۆی ئەدا بەسەر قەنەفەکەیدا و بە سووکایەتی و بێزارییەوە ئەیڕوانیە ئەو مۆڵگەی مێروە ئینسانەی لێک ئاڵابوون و بە هەموو لایەکدا فڕکەیان ئەهات و خوا ئەیزانی بە دوای چیدا ئەگەڕێن...

کە لە وێناکردنی کەسایەتی ئوبلۆمۆڤدا گەیشتینە ئەم قۆناغە، بە پێویستی ئەزانین بگەڕێینەوە سەر ئەو خاڵە هاوبەش و لێکچوانەی نێوان ئوبلۆمۆڤ و ئـەو نـموودانـەی تر کە لە ئـەدەبـی رووسـیدا نەخشێنراون و پیشتر ئەماژەمان پێکرد. ئەوەی لـەسـەرەوە وتـرا بۆمان دەرئـەخـات کە ئوبلۆمۆڤ بوونەوەرێک نییە کە لە ناخ و سروشتی خۆیدا توانای جووڵان و تێکۆشانی بە ویستی خۆی نەبێ. سستی و کەمتەرخەمیەکەی ئەو بەرەنجامی شێوازی

---

٦- بارشچینا Barshchina واتە بێگاری سیرڤ یان جووتبەندە لەسەر زەوی ئاغە، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە، سێ ڕۆژ بوو لە حەفتەدا.

پەروەردەبوون و ژینگەی فەراگەردی ئەوە. ئەوەی گرنگە و لێرەدا ئەبێ ئەماژەی پێبکرێ، ئوبلۆمۆڤ نییە، بەڵکو نەخۆشیەکەی ئەو واتە ئوبلۆمۆڤیزمە. چما ئەگەر ئوبلۆمۆڤ کارێکی دڵخوازی خۆی پەیدا بکردایەت، دەستی ئەکرد بە کارکردن. بەڵام ئەمەش کاتێک ئەلوا کە لە هەلومەرجێکی تردا پەروەردە ببوایەت. لەم هەلومەرجەی ئێستایدا ناتوانێ کارێکی گونجاو و دڵخوازی خۆی بدۆزێتەوە، چونکە بەگشتی چەمک و ئامانجێک لە ژیاندا نادۆزێتەوە و ناتوانێ پەیوەندی نێوان خۆی و دەوروبەرەکەی دیاری بکات. لێرەدایە کە ئێمە باشترین هەلمان دەست ئەکەوێ بۆ بەراوردکردنی ئەو و هەموو ئەو نموودانەی تر کە مەزنترین نووسەرانی ئێمە نەخشاندوویانن. لە زووەوە ئەوەمان بینیوە کە تێکڕای پاڵەوانانی باشترین و جوانترین چیرۆکە رووسیەکان ئەو دیاردەیە ئازاریان ئەدا کە هیچ چەمک و ئارمانجێک لە ژیاندا نادۆزنەوە و ناتوانن کار و پیشەیەکی دڵخوازی خۆیان بدۆزنەوە. لە ئەنجامدا هەموو پیشەکان بە وەڕەزکەر و نالەبار ئەزانن و لەم روانگەیەوە بە شێوەیەکی زۆر سەمەرە لە ئوبلۆمۆڤ ئەچن. وەرن «ئونەگین»، «پاڵەوانێکی سەردەمی مە»٧، «کێ تاوانبارە؟»٨، «روودین»٩، «نەویستراو»١٠ یان زۆری تر بکەنەوە و لێی بڕوانن، لە هەرکام لەمانەدا کەسایەتیەکی دەقاودەق وەکوو ئوبلۆمۆڤ ئەدۆزنەوە. ئونەگین وەکوو ئوبلۆمۆڤ لە کۆمەڵ کلا ئەگرێ، چونکە:

*لە ناسازگاری کەسان بێزار بوو و*
*لە هاوڕێیان و هاوڕێیەتی کردنیان*
*جا بەمجۆرە دەستی ئەکرد بە نووسین؛*
*رابواردنی خستە لاوە*
*ئونەگین لە ماڵ خزی*
*بە دەم باوێشکەوە پێنووسی هەلگرت*

*ئەوەی لە دڵی دایە هەڵیڕێژێ*
*بەڵام تێکۆشان لای سووکایەتی بوو*
*جا ئەو پێنووسە کەی بێ بنووسێ*

روودینیش زۆر حەزی لەوە بوو لەم مەیدانەدا ئەسپی خۆی تاو دا و ئارەزووی ئەوە بوو «یەکەم لاپەڕەکانی ئەو وتار و بابەتانەی ئەینووسێ بۆ دەستەی هەڵبژێراوان بخوێنێتەوە. تەنتێتنیکۆڤیش ساڵانێکی دوورودرێژ لە خەیاڵی خۆیدا هەوڵی ئەوەی دا «بەرهەمێک بەدی بهێنێ کە بڕیار بوو ببێ بە شاکارێکی مەزن و سەرانسەری رووسیە لە هەموو روانگەیەکەوە بگرێتەوە.» بەڵام لێرەشدا «ئەو هەوڵدانە لە قۆناغی خەیاڵکردن تێنەپەڕی. پێنووسەکەی لەبن ددانیدا چاڵ چاڵ بوو، هەندێ نەخش و نیگار لەسەر کاغەز نەخشێنران و لە کۆتاییدا هەموو شت لەبیر برایەوە». ئیلیا ئیلیچیش لەم رووەوە لە براکانی دواناکەوێ. ئەویش ئەنووسێ و وەرئەگێڕێ، تەنانەت بەرهەمێکی سەی١١ وەرگێڕا. شوڵتز لێی ئەپرسێ: «بەرهەمەکانت کوانێ؟ کوا وەرگێڕانەکەت؟» وەڵام ئەداتەوە: «نازانم. رەنگە زاخار فڕێی داوەتە سووچێکەوە. ئەبێ هەر لەم ناوە بێ.» بەمجۆرە وا پێ ئەچێ کە ئیلیا ئیلیچ تەنانەت لەوانی کەش پێش کەوتووە کە وەکوو ئەو بەگوڕ و لێبڕاوی دەستیان دابوویە کارکردن... کەموزۆر هەموو دەستەبراکانی ئوبلۆمۆڤ، سەرەڕای جیاوازی لە باری ژیان و گەشەکردنی بیر و بۆچوونیان، لەم زەمینەیەدا هەوڵیان داوە. تەنها پچوورین١٢ بە سووکایەتیەوە سەیری «چیرۆکبێژ و درامانووسانی بورژوا» ئەکات. بەڵام تەنانەت ئەویش بیرەوەرییەکانی خۆی ئەنووسێتەوە. سەبارەت بە بلتۆڤ١٣ ئەویش ئەبێ شتێکی هەر نووسیبێ. جگە لەمە ئەو هونەرمەند بوو. ئەچوو بۆ مۆزەخانەی هەرمیتاژ و لە بەردەم سێپایەیەک دا دائەنیشت و نەخشەی ئەوەی ئەکێشا

٧- A Hero of Our Times: a novel by Lermontov
٨- Who Is To Blame: a novel by Herzen
٩- Rudin: a novel by Turgenev
١٠- Unwanted: a novel by Turgenev

١١- Say
١٢- Pechorin کەسایەتی سەرەکی «پاڵەوانێکی سەردەمی مە»ی لرمانتۆڤ.
١٣- Beltov پاڵەوانی رۆمانی «کێ تاوانبارە»ی هرزن.

تابلۆیەکی گەورە دەربارەی پێکگەیشتنی بێرن کە لە سیبری ئەگەڕایەوە و موونیچ کە ئەگەڕایەوە بۆ سیبری، بکێشێ... بەڵام خوێنەر خۆی ئەزانێ ئەو تابلۆیە چی لێ دەرچوو... هەر هەموو ئەم خێزانە بەجارێ تووشی پەتای ئوبلۆمۆڤیزم بوون...

«تازە ئەمانە ژیان نییە. ئەمە تازە فێرگەی سەرەتایی ژیانە.» ئاندرەی ئێڤابۆڤیچ تەنتێتنیکۆڤ کاتێکە وەکوو ئوبلۆمۆڤ و هەموو ئوبلۆمۆڤەکانی تر لە نێوان بابەتە بێ سوودەکاندا سەرگەردان ئەبێ، مێشکی خۆی لەگەڵیان خەریک ئەکا و هەڵیان ئەکرێنێ، ناتوانێ تۆزقاڵێکیشی لە ژیانی راستەقینەدا بەکار بهێنێ، ئەمە بە خۆی ئەڵێ و درێژەی ئەدا: «ژیانی راستەقینە ئەوەیە کە ئەبی بە فەرمانبەری میری.» بەمجۆرە هەموو پاڵەوانەکانمان جگە لە ئونەگین و پچوورین هەموویان ئەبن بە فەرمانبەری حکوومەت و؛ هەر هەمووشیان کارەکەیان بە بێکەڵک و بێسوود ئەزانن و هەمووشیان پێش کات و ئابڕوومەندانە ئەکشێنەوە و خۆیان کارکەنار ئەکەن. بلتۆڤ کە چواردە ساڵ و شەش مانگی مابوو بۆ ئەوەی خانەنشین ببێ، لە سەرەتاوە زۆر بە جۆش و پەرۆشەوە کاری ئەکرد بەڵام هەر زوو دڵی لە کاری فەرمانگە سارد بوویەوە و تووشی دەمارگرژی بوو، بەخێرایی تووڕە ئەبوو و گوێی نەئەدایە کارەکەی... تەنتێتنیکۆڤ لە بەرپرسەکەی هەڵگەڕایەوە و لێی تووڕە بوو و جگە لەوەش ئەیویست خۆی کاروباری زەویوزارەکەی بگرێتە ئەستۆ و لەم رێگەیەوە خزمەت بە وڵاتەکەی بکات. روودین لەگەڵ بەڕێوەبەری






ئەو فێرگەی ئامادەییەی لەوێ مامۆستا بوو کردی بە دەمەقاڵە. ئوبلۆمۆڤ لـەوە وەڕەس بـوو کە فەرمانبەرانی فەرمانگەکەی بە شێوازێکی ئاسایی لەگەڵ سەرۆکی فەرمانگە قسە ناکەن «دەنگی خۆیان ئەگۆڕن و ئاوازێکی وەکوو جیکەجیک و قێزەونی ئەدەنێ» کە ئەو لێی بێزار بوو. بیرکردنەوە لەوەی کە ئەویش بەو دەنگە ناحەزە بۆ بەرپرسەکەی روون بکاتەوە «ئەو نامەیەی کە ئەبوایە بچێ بۆ ئاستراخان بۆچی گەیشتۆتە ئارخانگلسک» وەڕەزی ئەکرد، بۆیە دەستی لەکار هەڵگرت و خۆی کارکەنار کرد... لە هەموو شوێنێک هەمان ئوبلۆمۆڤیزم ئەبینین...
ئوبلۆمۆڤەکان لە ژیانی تایبەتیشدا زۆر لەیەک ئەچن:



ئەلکساندەر هرزن

*ئەویکی خۆش و سەیرانێک و پەرتووکێکی سەرگەرمی*
*مێرگێک لە لێرەوار و خوڕەی جۆگەیەک*
*چاوڕەشێکی شەنگ و شۆخ،*
*گەنج و تەرچک، جارجار ماچی لێو*
*ئەسپی سەرکەشی رامکراو*
*خوانچەی خواردنی خۆش و بەلەزەت*
*قاپێک شەرابی سازگار*
*تەنها و ئاسوودە*
*ئەی کە ژیانی ئونەگین ئاسمانییە*

ئەسپەکەی لێ دەربکەین، وشە بە وشە، ئەمە ئەو ئارمانجی بەختەوەرییە کە ئیلیا ئیلیچ وەکوو ژیانی ناوخۆ حەزی لێیەتی. ئوبلۆمۆڤ تەنانەت ماچی چاوڕەشە شەنگ و شۆخەکەش لەبیر ناکا:
«یەکێک لە ژنانی گوند،» ئیلیا ئیلیچ ئەورووژێنێ «گەردنێکی سووتاو، قۆڵی هەڵکراو تا لای ئانیشک، چاوانی لە شەرمان داخستوو بەڵام پڕ لە چەتوونی، حەزی لە نەوازشی پڕ لە میهری ئەربابەکەی، بە نـازەوە بەس تۆزقاڵێک خۆی لائـەدا، ئەویش بۆ ڕواڵـەت... بەڵام-هاوسەرەکەی نابێ بیبینێ، خوا پێی خۆش نییە» (ئوبلۆمۆڤ لە خەیاڵی خۆیدا هاوسەری هەیە)...
ئەو روخسارانەی کە هەرکام لە نووسەرە گەورەکان خولقاندوویانە ماوەیەکی دوورودرێـژ ماونەتەوە؛ تەنانەت ئەمڕۆ هی وا ئەبینین کە ئەڵێی کتومت روخساری ئونەگین یان پچوورین یان روودین و ئەوانی ترن، ئەویش نەک بڵێی لە هەلومەرجێکی تردا سەریان هەڵدابێ، بەڵکوو دەقاودەق بەو شێوەیەی کە پووشکین یان لرمانتۆڤ یان تورگنییێڤ نەخشاندوویانن. ئەوانە بەس لە بیر و مێشکی جەماوەردا زیاتر و زیاتر ئەبن بە ئوبلۆمۆڤ. هەڵبەت ناتوانرێ بگوترێ کە ئەو دۆنادۆنە هەر ئێستە جێبەجێ بووە. نەء! ئەوەتا تەنانەت ئەمڕۆش هـەزاران کەس هەن کە جگە لە قسەکردن، کارێکی تر ناکەن و هەزارانی تریش هەن کە قسەکانی ئەوان بە کردەوە دائەنێن. بەڵام هەر

ئەوەندەی کە گەنچارۆڤ، ئوبلۆمۆڤی خولقاندووە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ئەم فورم گۆڕان و دۆنادۆنە دەستی پێکردووە. ئەگەر کۆمەڵ یان لانیکەم بەشێکی لەوە تێ بگەیشتایەت کە تێکڕای ئەو بەهرە خاو و خلیچکانەی لە رابردوودا پەسن و ستایشیان کردوون، تا چ رادە لاوازن، سەرهەڵدانی روخساری ئوبلۆمۆڤ نەئەگونجا. لە رابردوودا ئەوانە خۆیان لە بن بەرەک١٤ و بارۆکەدا بە شێوازی جۆراجۆر ئەڕازاندەوە و بە هۆی هونەرە جیاوازەکانیانەوە سەرنجیان رائەکێشا، لە کاتێکا ئوبلۆمۆڤی ئەمڕۆی ئێمە بە رەنگە راستەقینەکانی خۆیەوە، لە بەرچاومان دەرئەکەوێ. کەم دووە و لەبری ئەوەی لە پشت تریبوونێکی شکۆداردا وەستابێ و بەرەکێکی گەورە و گرانی لەبەردا بێ، پێجامەیەکی لەبەردایە و لەسەر قەنەفەیەک لێی ڕاکشاوە. پرسیارەکان: «خەریک چییە؟ چەمک و مەبەستی ژیانی چییە؟» بەڕاشکاوی دێنە ئاراوە و هیچ پرسیارێکی لاوەکیش لە روونی و رەوانی ئەوانە کەم ناکاتەوە. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە کاتی چالاکی کۆمەڵایەتی گەیشتووە یان بەمزووانە ئەگات... هەر لەبەر ئەمەش بوو کە لە سەرەتای وتارەکەدا وتمان کە رۆمانی گەنچارۆڤ نیشانەی گیانی سەردەمی ئێمەیە.

راستەکەی سەرنجی ئەو گۆڕانە بدەن کە لە بیر و بۆچوونی گشتیدا بەدیهاتووە، سەبارەت بەو بیکارە زمانلووسە خوێندەوارانەی لە رابردوودا بە رابەرانی رەسەنی کۆمەڵ ئەژمێردران.

گەنجێکی زۆر قۆز و خوێندەوار و زیرەک لە بەردەممان راوەستاوە، هاتوچۆی میوانیە گەورەکانی ئاستی باڵای کۆمەڵ ئەکا و لە هەموو شوێن ئەدرەوشێتەوە. ئەچێ بۆ شانۆگەری و بەزمی سەما و باڵماسکە١٥. زۆر خۆش جلوبەرگە و خۆشخۆری شارەزایە. پەرتووک ئەخوێنێتەوە و جوان ئەنووسێ... مەگەر رووداوەکانی میوانیە مەزنەکان، ئەگینا هیچ شتێک خورپە لە دڵی ناهێنێ، بەڵام لەگەڵ رووداوە گرنگەکانیش بێگانە نییە. حەزی لەوەیە دەربارەی خولیا و دڵداری بدوێ،

*دەربارەی دەمارگیری و ئازاری سەرەکان و*
*دەربارەی رازە ترسناکەکانی گۆڕ...*
*ئەو هەندێ قانوونی جوامێرانەی هەیە: ئەو ئەتوانێ*
*بێکارییەکی سووکتریان پێ بکا*
*لەبری تەوقی کۆنینەی بارشچینا*

هەندێجار ئەتوانێ چاوداگرتنی ژنێکی کراوە و ئازادکردار پشت گوێ بخات و چون عاشقی نییە، خۆی لێ لائەدا و دەس لە روویەوە ئەنێ. پێشکەوتنی خۆی لە کۆمەڵ و کۆڕی گەورەکاندا لەو رادەی کە گرنگیان هەیە بە گرنگتر ناگرێ. ئەوەندە لەو کۆمەڵەی تێیدایە بەرزترە، کە هەست بە بێنرخی و نزمیەکەی ناکات. تەنانەت ئەتوانێ دەست لەم کۆمەڵە هەڵبگرێت و بچێ بۆ گوند و لە خانووەکەی خۆی دابنیشێ. بەڵام ئەمکارەش وەڕەزی ئەکا و نازانێ چی بکات و خۆی بە چ کارێکەوە خەریک بکات... لە بێکاری و بێوازی خۆیدا لەگەڵ هاورێکەی ئەیکا بە شەڕ و لەوپەڕی گەوجیەتی خۆی، لە دوێلێکدا١٦ ئەیکوژێ... پاشی چەند ساڵان ئەگەڕێتەوە ناو جەماوەر و عاشقی ئەو ژنە ئەبێ کە پێشتر دەستی لە روویەوە نابوو، چونکە وەڵامدانەوە بەو ئەوینە بریتی بوو لەوەی کە دەست لە ئازادی خۆی هەڵبگرێ و بکەوێتە گەشت و گەڕان بە جیهاندا. ئەم کەسایەتیە روخساری زیندووی ئونەگینە. بەڵام ئەگەر باشتر و وردتر لێی بڕوانین، ئەبینین ئەمە هەمان ئوبلۆمۆڤە.

پیاوێکی تر ئەبینین بە گیانێکی بەجۆشتر و بەرەگەی بەرزەفڕیی فراوانتر. وا پێئەچێ سروشت بەهرەی وای پێ بەخشیوە کە لەلای ئونەگین نرخێکی زۆریان هەبوو. ئەو پێویستی بەوە نییە خۆی بڕازێنێتەوە و جلی باش لەبەر بکات. چونکە بەبێ کردنی ئەمکارانەش لەناو کۆمەڵدا سەرکەوتووە. بۆ هەڵبژاردنی وشە پێویستی

١٤- جبە، عابا، رۆب.
١٥- میوانی سەماکردنی ئاریستۆکراتی بە دەمامک و جلی رازاوەی تایبەتەوە.
١٦- Duel جەنگی تەن بە تەن.



نیکۆلای گۆگۆل

بەوە نییە خۆی زۆر خۆی ماندوو بکات و بە گوتنی نوکتە و جەفەنگ خۆی دەربخات. چونکە زمانی لە خۆڕا وەک گوێزان تیژە. بەڕاستی سووکایەتی بە هەموان ئەکا، چەنکە خاڵە لاوازەکانیان ئەناسێ. ئە ئەتوانێ بەڕاستی دڵی ژنان بۆ لای خۆی رابکێشێ، ئەویش نەک بۆ ماوەیەکی کورت، بەڵکوو بۆ درێژخایەن و رەنگە بۆ هەمیشە. ئەو هەموو کۆسپێک لەسەر رێگەی لائەدا یان ئەیهاڕێت و بەسەریدا تێئەپەڕێ. تەنها لە یەک روانگەوە بەخت یاری نییە، ئەویش ئەوەیە کە نازانێ چ رێگایەک هەڵبژێرێ. دڵی بەتاڵە و سەبارەت بە هەموو شت ساردوسڕە. ئەو هەموو کارێکی کردووە و بە گەنجێتی لە هەموو ئەو خۆشیانەی بە پارە ئەکڕدرێ، تێر بووە. لە ئەوینی ژنە شۆخەکانی میوانیەکان ماندوو بووە، چونکە ئەم عەشقانە هیچ ئارامیەک بە دڵی نابەخشێ. لە فێربوونیش وەڕەز بووە چونکە تێگەیشتووە ئەم رێگەیەش نە ناوبانگی بەدواوەیە و نە بەختەوەری. گەمژەکان لە هەموان بەختەوەرترن و ناوبانگیش کاری بەخت و ناوچاوە. مەترسی مەیدانی جەنگیش بەخێرایی جاڕسی کرد، چونکە ئەمجۆرە جەربەزەکردنەی بە بێ‌واتا هاتە بەرچاوی و زۆر زوو لەگەڵی راهات. لە کۆتاییشدا، تەنانەت خۆشەویستی کچێکی سادەدڵ و پاک و سەرکەش کە دڵی رفاندبوو، ماندووی کرد، چونکە وا تێگەیشتبوو کە تەنانەت ئەو عەشقەش ناتوانێ بەدیهێنەری حەز و ئارەزووەکانی بێ. بەڵام ئەم حەزانە چین؟ بۆ کوێ پەل ئەکێشن؟ بۆ بە هەموو هەست و نەستیەوە خۆی رادەستی ناکات؟ چونکە خۆیشی لێیان تێناگات و خۆی ماندوو ناکات بیر لەوە بکاتەوە ئەبێ چی لەگەڵ ویستی دەروونی بکات. بەمجۆرە ژیانی بە گاڵتە پێکردنی نەزان و رەبەنان تێئەپەڕێنێ، دڵی شەنگە ژنانی ساویلکە ئەهەژێنێ، خۆی لە کاروباری عاشقانەی ئەوانی تردا هەڵئەقورتێنێ، شەڕ هەڵایسێنێ، دلاوەری خۆی لە بابەتی بێ‌نرخدا پیشان ئەدا و دەست ئەداتە دوێل کردن لەسەر هیچ و خۆڕایی... لەبیرتە کە ئەمە سەربردەی پچوورینە، بەوجۆرەی کە خۆی کەسایەتی خۆی بۆ ماکسیم ماکسیمۆڤیچ روون ئەکاتەوەوە، کە تۆزێ کورت کراوەتەوە، ئەگینا هەمووی وەک خۆیەتی... تکایە تۆزێ وردتر لێی بڕوانن: ئەوەتا

ئێوەش ئوبلۆمۆڤ ئەبینن...
بەڵام لێرەدا سەرنجی پیاوێکی تر بدەن کە شارەزای ئەو ڕێگەئە، پێیدا ئەڕوا. ئەو نەک هەر توانای بەتوانای خۆی ئەناسێ، بەڵکوو ئەشزانێ کە ئارمانجێکی مەزنی لەبەرە... تەنانەت وا پێئەچێ چەند و چوونی ئارمانجەکەشی ئەناسێ و کەم تا کورتێک ئەزانێ لە کوێ لەنگەری گرتووە. ئەو پیاوێکی بەڕێز و راستگۆیە (هەرچەند هەندێجار لەبیری ئەچێ قەرزەکانی بداتەوە.) نەک لەسەر شتێ ڕۆتین، بەڵکوو لەسەر بابەتە گرنگەکان بە جۆش و خرۆشەوە ئەدوێ و، زۆر بە جەختەوە رای ئەگەیەنێ ئامادەیە گیانی لەپێناوی جەماوەردا بەخت بکات. هەموو دیاردەکان لە مێشکی ئەودا چارەسەر کراون و هەموو شت بە زنجیرێکی زیندوو و هەماهەنگ لێک گرێ دراون. ئەو بە گوتارە ئاگراوییەکانی خۆی گەنجانی ساویلکە ئەکا بە خولیای خۆی و ئەوانیش بە بیستنی ئەو وتارانەی ئەو هەست ئەکەن کە چارەنووس ئەوانی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە مەزنەکان دیاری کردووە... بەڵام خۆی چۆن ژیان ئەباتەسەر. دەست بۆ هەموو کارێک ئەبا، بەڵام هیچ کارێک ناگەیەنێتە کۆتایی. بەوپەڕی وازەوە چاودێری هەموو کارێک ئەکا و هەموو هەوڵی خۆی ئەدا، بەڵام لە هیچ کارێکدا سەرکەوتوو نابێ... عاشقی کچێک ئەبێ و لە کۆتاییدا کچە پێی ئەڵێ ئامادەیە خۆی بدا بەدەستەوە، هەرچەند دایکی پێی وتووە نابێ ئەو کارە بکات. ئەو بەمجۆرە وەڵامی ئەداتەوە: «دەک بە قوربانی خوا بم، دایکت رای لێ نییە؟ دەک لەو زەبرە گورچووبڕە! چەندە زوو!... کەوابوو هیچ چارەمان نییە، ئەبێ خۆمان بدەین بەدەست چارەنووسەوە!...» تێکڕای ژیانی بەمجۆرەیە... کەوابوو زانیتان کە ئەم پیاوە روودینە... بەڵام نەء، تەنانەت ئەویش ئێستە ئیتر ئوبلۆمۆڤە. ئەگەر ئێوە بەوردی ئەم کەسایەتیە بخەنە بەر تاقیکردنەوە و لەگەڵ هەلومەرجەکانی ژیانی ئەمڕۆدا بەراوردی بکەن، بۆتان دەرئەکەوێ بەڕاستی ئوبلۆمۆڤە.

تایبەتمەندی هاوبەشی هەموو ئەم کەسایەتیانە ئەوەیە کە هیچ شتێک لە ژیاندا بۆ ئەوان پێداویستی ژیانی نییە. هیچ شتێکی پیرۆز لە دڵیاندا نییە، وەکوو ئایینێک لەلایان بەڕێز بێ و لەگەڵ ناخیان تێکەڵ ببێ و لە نەبوونیدا هەست بکەن لە سەرچاوەی ژیان دابڕاون. لەلای ئەوان هەموو شت رووکەشە. هیچ شتێک لە سروشتی ئەواندا رەگی دانەکوتاوە. رەنگە ئەگەر سونگەیەکی دەرەکی ناچاریان بکات، دەس بۆ کار ئەبەن، هەر بەوجۆرەی کە ئوبلۆمۆڤیش بە ناچار ئەکەوتە شوێن شوڵتز و ئەچوو بۆ میوانی، نۆتەی مووسیقا یان پەرتووکێکی بۆ ئۆڵگا ئەکڕی و ئەوەی ئەو ئەیوست و ناچاری ئەکرد، ئەیخوێندەوە. بەڵام دڵیان لای ئەو کارە نییە کە هۆکارێکی دەرەکی ناچاری کردوون بیکەن. هەرکام لەمانە، ئەگەر بێت و هەموو ئەو دەسکەوتە دەرەکیانەی کە لە رێگەی کارکردنەوە بەدەستی ئەهێنن، بە خۆڕایی و بێ ماندووبوون بخرێتە بەردەستیان، زۆر بە پێخۆشحاڵیەوە دەست لە کارکردن هەڵئەگرن. بە گوێرەی ئوبلۆمۆڤیزم، فەرمانبەرێکی رەوشت ئوبلۆمۆڤ ئەگەر بۆی بلوایەت، لەبری ئەوەی هەموو رۆژێک بچێتە سەرکار، مووچەکەی وەربگرێ و لە کاتی خۆیشیدا پلەی بەرز بکرێتەوە، هەرگیز نەئەچوو بۆ فەرمانگە. ئوبلۆمۆڤێکی سەرباز ئەگەر بیتوانیایەت بەبێ ئەوەی بچێ بۆ جەنگ مووچە وەربگرێ و جلوبەرگی سەربازییەکەی، کە لە هەندێ شوێن بەکاری دێت، لەلای خۆی رابگرێ و لەبەر بکات، هەرگیز دەستی بۆ چەک نەئەبرد. ئوستاد وانەی ئەئەوتەوە و خوێندکار راهێنانی نەئەکرد و نووسەر نەی ئەنووسی و هونەرپیشە نەئەچوویە سەر شانۆ و هونەرمەند ئەسکەنە و تەختەرەنگەکەی فڕێ ئەدا و؛ بە شێوەی گشتی ئەگەر ڕێگەیەک بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی بە خۆڕایی ئەو شتانەی دەست بکەوێ، کە ئێستە بە کارکردن بەدەستی ئەهێنێ. ئەمانە هەموویان

باسی هەوڵدانی راستگۆیانە ئەکەن و پڕۆپاگەندە بۆ شارەزابوون لە ئەرکی ویژدان و بەرژەوەندی گشتی ئەکەن، بەڵام کە گەیشتە کاتی تاقیکردنەوە، ئەوسا دەرئەکەوێ کە ئەمانە هەمووی هەر قسە بووە، تەنها قسە. پاکترین و دڵسۆزانەترین هەوڵیان لە پێناوی ئاسوودەیی و رۆبەکەیان دایە و هەموو ئەو هەوڵانەیان هیچ نییە جگە لە رۆب و پێجامەیەکی بەرێزانە (ئەمە دەستەواژەی گشتیە و بەکارمان هێناوە)، بۆ ئەوەی نزمی و شکست و بێکەڵکی خۆیانی لەبن‌دا بشارنەوە. تەنانەت راستگۆترین و رووناکبیرترین کەسان، کەسانێک کە سروشتێکی پڕ خرۆش و دڵێکی بەجۆشیان هەیە، کاتێکە دێتە سەر کردەوە زۆر حەزی ئەوەیان تێدایە کە پلان و بۆچوونەکانی خۆیان بخەنە لاوە و بە ئاسانی مل بۆ رۆژەڤی ژیان دانەوێنن، ئەو رۆژەڤانەی کە رادەستی و ملکەچکردن بۆ ئەوانە بە کارێکی دزێو و ناشیرین ئەزانن. ئەمە دەری ئەخا هەموو ئەو شتانەی دەربارەی ئەدوێن هیچ پەیوەندی بە قووڵایی ناخیانەوە نییە. لە قووڵایی دڵی ئەوانەدا تەنها یەک خەیاڵ، خۆشخەیاڵە و جگە لەوە هیچ ئارمانجێکی تریان نییە و ئەیش ئارامیەکی بێخەوشە، ئاسوودییە و ئوبلۆمۆڤیزمە. هەندێکیان تەنانەت ئەگەنە ئاستێک ناتوانن بڕوا بەوە بکەن کە مرۆڤ ئەتوانی بەدڵخوازی خۆی و بە پەرۆشەوە کار بکات. بڕواننە ئەم سەلماندنەی رۆژنامەی رابەری ئابووری کە ئەڵێ: ئەگەر سامان بە شێوەی یەکسان لە نێوان جەماوەردا دابەش بکرێ، ئەوسا خەڵکی هاندەری نامێنێ کە سامان و دارایی کۆ بکاتەوە و کار ناکات و لە ئەنجامدا هەموو لە برسان ئەمرن!...١٧

*ئەوا مەتەڵەکە هەڵهێنرا،*

*ئەو وشەی کە پێویست بوو، دۆزرایەوە.*

*ئەو وشەش ئەمەیە: ئوبلۆمۆڤیزم.*

ئەمڕۆ، کاتێک کە ئاغەیەکی گوندی ئەبینم باسی مافی مرۆڤ و پێداویستی گەشەکردنی کەسایەتی ئەکا، لە یەکەم وشەکانیەوە بۆم دەرئەکەوێ ئەو مرۆڤە یەک ئوبلۆمۆڤە.

کاتێکە کارمەندێکی پایەبەرز ئەبینم کە لە ئاڵۆزی سیستم و کێشەکانی ئەدوێ، بۆم دەرئەکەوێ ئەوە ئوبلۆمۆڤە.

کاتێکە ئەفسەرێکی سپا ئەبینم سکاڵای لەوە دەرئەبڕێ کە سانی سەربازی کارێکی بێسوودە و زۆر بوێرانە ئەیسەلمێنێ کە پیاسەی سەرباز کارێکی بێهوودەیە و لەو بابەتانە... هیچ گومانم لەوەدا نامێنێ کە ئەوە ئوبلۆمۆڤێکی تەواوە.

کاتێکە لە گۆڤارەکان‌دا ئەخوێنمەوە، لیبرالەکان دژی هەڵەخەرجی و بەفیڕۆدان ئەنووسن و لە هەمان کات‌دا شادمانی خۆیان دەئەبڕن لەوەی لانیکەم کارێک کراوە کە لە زووەوە چاوەڕانی جێبەجێکردنی بووین، لای خۆم ئەڵێم ئەمانە هەمووی بە ئوبلۆمۆڤکا نووسراوە.

کاتێکە لەگەڵ ئەو خوێندەوارانەم کە بە گوڕ و تینەوە لایەنگری دابینکردنی پێداویستیەکانی مرۆڤن و ساڵەهایە هەمان چیرۆکە کۆنەکە (بە رووداوی تازەوە) سەبارەت بە بەرتیلخۆری و رەفتاری دڕندانە و هەموو جۆرەکانی تری پێشێلکردنی قانوون، بە جۆش و خرۆشی بێپایانەوە ئەگێڕنەوە، سەرەڕای حەزی خۆم، وا هەست ئەکەم بۆ ئوبلۆمۆڤکا پەلکێش کراوم...

جا سەرەنجام کێ هاوارێ پیرۆزی «بۆ پێشەوە» هەلئەهێنێ، کە گۆگۆڵ ئارەزووی لێ بوو و رووسەکان ماوەیەکی دوورودرێـژە چاوەڕوانی بیستنین تا لەو شوێنە هەڵیانکەنێ کە رەگیان لێ داکووتاوە؟ هەتا ئێستەش نە لە کۆمەڵگەدا وەڵامێکمان بۆ ئەم پرسیارە هەبووە و نە لە ئەدەب‌دا. تەنەنەت گەنچارۆڤیش کە ئاشنای دەردی بێدەرمانی ئوبلۆمۆڤیزمە، نەیتوانیوە وەڵامێکمان پێ بداتـەوە. نەیتوانیوە لە پەسن کردنی ئەو هەڵەیەی کە تا ئێستەش لە هەموو

١٧- Ekonomicheskii UkazateY رۆژنامەی رابەری ئابووری لە سەنت پترزبۆرگ دەرئەچوو.

شوێنێکی کۆمەڵگەی ئێمەدا هەیە، خۆی ببوێرێ. ئەو ئوبلۆمۆڤیزم ئەنێژێ و لەسەر گۆڕەکەی شین ئەگێڕێ. ئەو لە زمانی شوڵتزەوە ئەڵێ: «ماڵاوا ئوبلۆمۆڤکای دێرین، سەردەمی تۆ وا تێپەڕی.» بەڵام ئەوەی ئەو ئەیڵێ ڕاست نییە. هەموو ئەو رووسانەی کە ئوبلۆمۆڤیان خوندۆتەوە یان ئەخوێننەوە ئەزانن کە ئەو هەڵە ئەکا. ئوبلۆمۆڤکا نیشتمانی هەموومانە و خاوەنەکانی مامۆستاکانمانن، سێسەد زاخارەکەی بۆ هەمیشە وان لە خزمەتماندا. یەکە یەکەی ئێمە بڕێکی باش ئوبلۆمۆڤی تێدایە، جارێ هێشتا زۆر زووە بۆ ئەوەی سەردۆلکەی بۆ بچڕین، ئێمە و ئیلیا ئیلیچ شایانی ئەو پیاهەڵگوتنە نین کە لە خوارەوە هاتووە:
«ئەو خاوەنی شتێکی بەنرختر لە وشیارییە: دڵێکی پاک و بەوەفا! خوویەکی زێڕین کە هەموو ژیانی خۆی پاراستوویەتی و لێی جیانەبۆتەوە. ئەو لەژێر زەبری قورسدا کەوتووە، تاساوە، شکستی هێناوە، هیوابڕاو بووە و وزەی ژیانی لەدەست داوە، بەڵام وەفاداری و ڕاستگۆیی خۆی نەدۆڕاندووە. هیچ ئاوازێکی نالەبار دڵی ڕەش نکردووە، ئەو زەلکاوەی لێی چەقیوە چەپەڵی نەکردووە، هیچ درۆیەکی گڵاو فریوی نەداوە و هیچ هێزێک ناتوانی بەلاڕێیدا بەرێ. دەبا لە دەریای پێسیدا نوقم ببێ، دەبا تەواوی دنیا ژەهراوێ بێ و ژێرەوژوور بێ؛ ئوبلۆمۆڤ هەرگیز کوڕنش نابات بۆ بتی درۆ... ئەو گیانێکی روون و پەرداخە وەک بلوور. مرۆڤی وەک ئەو یەکجار کەمن، مرواری ناو جەماوەرە! بە هیچ بەرتیلێک ناتوانی هەڵیخڕێنی، ئەتوانی پشتی پێ ببەستی بۆ هەمیشە و تاهەتایە.»
لێرەدا زۆر لەسەر ئەم بابەتە ناڕۆین، بەڵام هەموو خوێنەرێک ئەزانێ ئەوەی لە سەرەوە هات، ڕاست نییە. هەڵبەت ئوبلۆمۆڤ خاوەنی ئاکارێکی باشە و ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز نەیویستووە کەس فریو بدات و، هەمیشە وا خۆی پیشان ئەدات کە هەیە: واتە تەوەزەلێکی بێکار. بەڵام بزانە چ کات ئەتوانی پشتی پێ ببەستی؟ ڕەنگە تەنها ئەو کاتەی کە هیچکارێک پێویست نییە ئەنجام بدرێ؛ لە کاتی وەهادا دیارە کەسێکی زۆر لەبارە. بەڵام ئەوسا کە پێویست بە کارکردن نییە، چ پێویستمان بەو هەیە. ئەو لەبەردەم خوداوەندی خراپەدا کوڕنش نابا و چۆک دانادا. بەڵام بۆچی؟ چونکە ئەمە پێویستی بەوە هەیە لەسەر قەنەفەکەی رابێ. بەڵام ئەگەر بەزۆر بەرزی بکەنەوە و ناچاری بکەن لە بەرامبەر ئەم بتەدا چۆک دابدا، ئەوسا هێزی هەڵسانەوەی نییە. ناتوانرێ بە بەرتیلخۆر بکرێ. بەڵام چی لەوێدا هەیە لەبەر ئەوە بەرتیلی بدەنێ؟ بۆ ئەوەی بجووڵێ؟ وایە، ئەمە کارێکی دژوارە. چەپەڵی پێوە نالکێ. بەڵێ، ئەمە ڕاستە. بەڵام تەنها تا ئەو کاتەی لەسەر قەنەفەکەی ڕاکشاوە، هەموو شت تەواوە. کەچی هەر ئەوەندەی تارانتییێف، زاترتی و ئیڤان ماتڤەیچ بگەن، یەع! چیها شتی سەیر و قێزەون لە دەروبەری ئوبلۆمۆڤ روو ئەدا. تاڵانی ئەکەن، شەرابەکەی ئەخۆنەوە و شەرابی



میخایل لرمانتۆف

دەرخوارد ئەدەن، بەڵگەیەکی بە زیانی خۆی پێ واژۆ ئەکەن (کە شولتز بە ئاسانی و بە شێوازی رووسی، بەبێ دادگا و لێکۆڵینەوە، بۆی وەرئەگرێتەوە.) کۆڵەی ئەکوتن و ئەڵێن سووچی جووتیارەکانیەتی. بڕێکی باش پارەی لێ دەرئەکێشن بە خوت و خۆڕایی و ئەو لەبەرامبەر ئەم هەمووەدا بێدەنگە و دیارە لەبەر ئەوەی جارێکی تر بەڵگەی ساختە نەنووسێ...

سەبارەت بە رێزدانان بۆ سەردەمی خۆی، جەنابی گەنچارۆڤ، دژەژەهرێکی بۆ ئوبلۆمۆڤ ئافراندووە لە روخساری شوڵتزدا؛ بەڵام سەبارەت بەو کاراکترە ناچارین ئەو بۆچوونە دووپات بکەینەوە کە لە ئەدەبدا نابێ لەڕادەبەدەر لە سەردەمی خۆمان پێش بکەوین. شوڵتز، واتە ئەو کاراکترە پڕ جۆش و چالاکەی کە هەموو بیرۆکەیەک هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە ئەکا بە بڕیار و دەسبەجێ رای ئەپەڕێنێ، هێشتا لە کۆمەڵی ئێمەدا لەدایک نەبووە. (لێرەدا زیاتر مەبەست توێژی رۆشنبیرانە کە توانای خەملاندنی بیر و ئایدیای باڵایان هەیە. ئەگینا لەناو کۆمەڵانی خەڵکی کە بۆچوون و بڕیارەکان شتی بەکردەوە و پراکتیکن، نموونەی ئەو زۆرن). خودی نووسەر، کاتێکە دەربارەی کۆمەڵگەی ئێمە ئەدوێ، دان بەو راستیەدا ئەنێ:

«ئەوەتا! چاوەکان لە پاش سستی خەو کراونەتەوە و هەنگاوی بڵند و خێرا هەڵئەگیرێ، دەنگی بە جۆش و بەتین بەر گوێ ئەکەوێ... چەندەها شوڵتز بە ناوی رووسیەوە ئەبێ سەرهەڵدەن...»

گومانی تێدا نییە کە ئەبێ زۆرانـی وەکوو شوڵتز بەدی بێن. بەڵام لەمکاتەی ئێستادا هێشتا زەمینەی پەروەردەکرنیان بەدی نەهاتووە. بۆیەشە ئەوەی ئێمە لە رۆمانەکەی گەنچارۆڤ هەڵئەهێنجین ئەوەیە کە شوڵتز پیاوی کارە، بەردەوام بە کارێکەوە خەریکە، لە هەڵسووڕاندایە، لە بیری بەدەسهێنانی شتی تازەدایە و پێی وایە ژیان واتە کارکردن و لەم بابەتانە. بەڵام ئەوەی کە چی ئەکا و چۆن ئەتوانێ کاری بەنرخ بکا، لە کاتێکا ئەوانی تر هیچیان بۆ ناکری ئەوە خۆی وەکوو رازێک بە بێ وەڵام ماوەتەوە. ئەو بە چاوتروکانێک کاروباری زەویوزارەکەی ئوبلۆمۆڤ بۆ ئیلیا ئیلیچ رائەپەڕێنێ. بەڵام چۆن؟ ئەمەیان ئێمە نایزانین. بەڵگەکەی ئیلیا ئیلیچ بە نەزانی واژۆی کردووە، ئەو بە کەمترین دژواری وەرئەگرێتەوە. بەڵام چۆن؟ ئەمە ئەزانین کە بەرپرسەکەی ئیڤان ماتڤەیچ ئەبینێ و پاش ئاخاوتنێکی دۆستانە، ئیڤان ماتڤەیچ بانگ ئەکرێ و نەک هەر بەڵگەکە ئەداتەوە بەڵکوو خۆیشی کارکەناری ئەنووسێ و کارەکەی بەجێ ئەهێڵێ. بەڵام بەگوێرەی ئەم بابەتە، شوڵتز هێشتا نەگەیشتۆتە پلەی سەرکردەی کۆمەڵگەی ئارمانی رووسیە. ناشتوانێ بەو پلەیە بگات. هێشتا کاتی نەهاتووە. لەم کاتەی ئێستادا، ئەگەر یەکێک زانایی سلێمانیشی هەبێ سەبارەت بە کاروباری کۆمەڵایەتی هیچی پێناکرێ. مەگەر ئەوەی وەکوو مورازۆڤ کە بە سامانی دەملیۆنی خۆیەوە کاری چاکەی ئەکرد و نانی خەڵکی ئەدا یان پیاوچاکە زەویدارەکەی تر وەکوو کۆستانژۆگلۆ۱۸. بەڵام لەمە زیاتر ناکرێ و ناگونجێ... هەروەها ناتوانین لەوە تێبگەین کە شوڵتز لە هەڵسووڕانەکانی خۆیدا چۆن ئەیتوانی خۆی لەو حەز و نیازانەی ئوبلۆمۆڤ گیرۆدەیان بوو رزگار بکات. هەوەها نازانین چۆن ئەیتوانی بەو پلەی خۆی رازی بێ، بە بەختەوەری کەسی و گۆشەگیرانە و تایبەت بە خۆی قانع بێ؟ نابێ ئـەوەش لەبیر بکەین کە زەلکاوێک لە بن پێی بوو و ئوبلۆمۆڤکا زۆر لێی دوور نەبوو. بۆ گەیشتن بە شارێ و هەڵاتن لە ئوبلۆمۆڤیزم ئەبوایە جەنگڵ لەسەر رێی پاک بکاتەوە. ئەوەی کە ئایە شوڵتز لەم بوارەدا هیچی کردووە و ئەوەی کردوویەتی لامان روون نییە و تا ئەو کاتەی ئەوە نەزانین ناتوانین لە کەسایەتیەکەی بەوجۆرەی کە گەنچارۆڤ نەخشاندوویەتی، رازی

۱۸- Murazov و Kostanzhoglo دوو کەسایەتی رۆمانی گیانی مردووی گۆگۆل.

بین. تەنها شتێکە بیڵێین ئەوەیە کە کەسایەتیەک بەو تایبەتمەندییەوە ناتوانێ دروشمی بەهێزی «بۆ پێشەوە» بە زمانێک کە رووسەکان تێی بگەن و کار لە هەست و هەناویان بکات، بەرز بکاتەوە.

رەنگە ئۆڵگا ئیلینسکایا بۆ ئەم کارە لە شوڵتز بەتواناتر بێت. چونکە ئەو لە ژیانی تازەی ئێمە نزیکترە. دەربارەی ئەو ژنانەی گەنچارۆڤ ئافراندوونی هیچمان نەوت. دەربارەی ئۆڵگا یان ئاگافیا ماتیەیێڤنا پشەنیتسینا (یان تەنانەت دەربارەی ئانسیا یان ئاکۆلینا، کە هەر کام کەسایەتیەکی تایبەتی ژنانەن). چونکە بینیمان ناتوانین شتێکی گونجاو و هەماهەنگ دەربارەیان بڵێین. ئەگەر هەوڵی ئەوە بدەین ژنانی خولقێنراوی گەنچارۆڤ بخەینە ژێر لێکۆڵینەوە، وەکوو ئەوە وایە بڵێین ئێمە لە رازی دڵی ژنان ئاگادارین. بەڵام چون ئەو شارەزاییەمان نییە، بەس پەسنی کەسایەتیە ژنەکانی خولقێنراوی گەنچارۆڤ ئەکەین. خاتوونەکان ئەڵێن لێکدانەوەی سایکۆلۆجی گەنچارۆڤ لەسەر ژنان نموونەیە، چونکە هەمووی راستە و زۆر وردبینانەیە. جا ئالێرەدا ئەبێ بۆچوونی خاتوونەکان بسەلمێنین... هەروەها رێگە بە خۆمان نادەین هیچ لەمە زیاد بکەین چونکە وەکوو ئەوە وایە پێ بخەینە کەوشەنێکەوە کە بەتەواوەتی تێیدا غەوارەین. بەڵام لە کۆتایی ئەم وتارەدا رێگە بە خۆمان ئەدەین چەند وشەیەک دەربارەی ئۆڵگا و تێڕوانینی بۆ ئوبلۆمۆڤیزم بدوێین.

لە روانگەی گەشەکردنی بیر و بۆچوونەوە، ئۆڵگا باڵاترین ئارمانجێکە کە هەر هونەرمەندێکی رووسی ئەتوانی لە ژیانی ئەمڕۆی کۆمەڵی ئێمەدا بیدۆزێتەوە. پاکیزەیی لە رادەبەدەر و سادەیی لۆجیک و هەماهەنگی سەرسووڕهێنەری دڵ و مێشکی وەها تووشی سەرسامامان ئەکات کە گومان لەوە ئەکەین تەنانەت لە خەیاڵیشدا گوڵخەندەرانێکی وەها هەبێ و ئەڵێین: «پێم وانییە ژنی وا بوونی هەبێ.» بەڵام کاتێکە شۆپی ئەگرین و لە بەستەری چیرۆکەکەدا لەگەڵی ئەڕۆین، بۆمان دەرئەکەوێ لە هەموو شوێن لەگەڵ خۆی و گۆڕانگارییەکانی خۆیدا راستگۆیە، کەوابوو کەسایەتیەکی خولقێنراوی نووسەر نییە، بەڵکوو مرۆڤێکی زیندووە، بەڵام ئێمە هێشتا بە دیداری نەگەیشتووین. ئەو زیاتر لە شوڵتز ژیانی نوێی رووسی پیشان ئەدا؛ جا ئەکرێ چاوەڕوانی ئەوەی لێبکەین ئەو وشەیەی کە ئوبلۆمۆڤیزم ئەسووتێنێ و ئەیکا بە خۆڵەمێش، لە زاری ئەوە بێتەدەر... سەرەتا عاشقی ئوبلۆمۆڤ ئەبێ، بەو بڕوایەوە کە ئەتوانێ روشت و خووی ئەو بگۆڕێ... هەوڵێکی درێژخایەن و سەرسەختانە ئەدا بۆ ئەوەی پریشکی ژیان بدا لە ناخی ئەم پیاوە و هانی بدا بۆ چالاکی و کارکردن. لەم بوارەدا زۆر ئازار ئەچێژی و ئامادە نییە دان بەوەدا بنێ کە نەخۆشیەکەی ئوبلۆمۆڤ تا ئەم رادەیە تووش و بێ چارەسەرە. بەڵام هێشتاش هیوای گەش لە دڵیدا ئەرووێنێ و بە خولقێنراوی داهاتووی خۆی ئەزانێ و لە هیچ تێکۆشانێک لەم رێگەیەدا ناپرنگێتەوە. ئۆڵگا تەنانەت نەریتە باوەکانی خۆپەرێزی ئەخاتە لاوە، تاقی تەنها و بەبێ ئەوەی بەکەس بڵێ ئەچێ بۆلای و، بەپێچەوانەی ئوبلۆمۆڤ، ئەم باکی لەوە نییە ناوبانگی بزڕێ. هەروەها بە وردبینیەکی سەمەرەوە هەموو خاڵە ناڕاستەکانی کەسایەتی ئەو دەستنیشان ئەکا و زۆر بە سادەیی بۆی روون ئەکاتەوە کە بۆچی هەڵەن. بۆ نموونە ئوبلۆمۆڤ نامەیەکی بۆ ئەنووسێ و ئەڵێ ئەم نامەیەی تەنها لە رووی دڵسۆزی و نیگەرانیە بۆ نوسیوە و خۆی فەرامۆش کردووە و لە پێناوی ئەودا بەخت کردووە و لەم بابەتە...

ئۆڵگا وەڵامی ئەداتەوە:

نەخێر، ئەمە راست نییە، ئەگەر تۆ بیرت لە بەختەوەری من بکردایەتەوە و بڕوات بەوە هەبوایە بۆ دابین بوونی بەختەوەری من پێویستە لێک جیاببینەوە، زۆر بە ئاسانی ئەڕۆیشتی بەبێ ئەوەی نامەم بۆ بنێری.

ئوبلۆمۆڤ ئەڵێ لەوە ئەترسێ کاتێکە ئەو لەوە تێگەیشت کە سەبارەت بەم هەڵەی کردووە، دڵی لەم داچڵەکێ

و

ئیتر



پۆشكین

خـۆشـی نــەوێ و عاشقی یەكێكیتر ببێ. لە وەڵامـــی ئـەمـەدا ئۆڵگا لێی ئەپرسێ:

بێبەختی و غەمباری من لە چیدا ئەبینی؟ من ئەمڕۆ تۆم خۆش ئەوێ و خۆم بە بەختەوەر ئەزانم. ئەگەر بەیانی ڕۆژ یەكێكی ترم خۆش ویست، ئەوە لەگەڵ ئەو خۆم بە خۆشبەخت ئەزانم. پێویست ناكا تۆ نیگەرانی من بی.

ئەم سادەیی و ڕونییەی بیركردنەوە لە دیاردەكانی ژیانی نوێن و لەو ڕابردووەدا نەبوون كە كۆمەڵگای ئەمڕۆ لەسەر بناغەی دامـــەزراوە... جا سەرنج بـدەن كە ویستی ئۆڵگا تا چ ڕادەیـەک پابەندی دڵیەتی. ئەو سـەرەڕای لۆمە و تەوس و تەشەری ئەم و ئەو كۆڵ نادات و لە عەشقی خۆیدا بـەردەام ئەبێ، تا ئەو كاتەی لە سستی و بێكەڵكی ئوبلۆمۆف تێئەگا و پەی بە بێئەنجامی هەوڵدانەكەی خۆی ئەبات. ئەوسایە كە بە ڕاشكاوی پێی ڕائەگەیەنێ كە هەڵەی كـردووە و ناتوانێ چارەنووسی خۆی بـەوەوە گرێ بدا. پاش دەست لەڕوونانیشی بەردەوام ئەبێ لە پەسن و ستایشی و تەنانەت پاشتریش بە هەڵوێستی بەكردەوەی خۆی وەها ئوبلۆمۆف ڕەت ئەكاتەوە كە هیچ ژنێک هیچ ئوبلۆمۆڤێكی بەوجۆرە ڕەت نەكردۆتەوە. تاتیانا لە كۆتایی ڕووداوی دڵدارییەكەی بە ئونەگین ئەڵێ:

*خۆشم ئەوێی (چ سوود گەر بیشارمەوە؟)*
*بەڵام، پەیمانم لەگەڵ یەكی دی پەیوەندم ئەدا و*
*تاسەر پێی وەفادار ئەبم.*

بەمجۆرە تەنها ئەركێكی ڕواڵەتی ڕەوشت ئەو لە دڵدارە گەمژەكەی جیای ئەكاتەوە و ئەگەر ئەم تاقە بەرگرە نەبوایە، دەستەولەملان لە ئامێزی ئەگرت. ناتالیا بۆ ئەوە لە ڕوودین جیا بوویەوە كە ڕوودین هەر لە سەرەتاوە دڵڕەق بوو و كاتێكە بەجێی هێشت، ناتالیا بۆی دەركەوت دڵبەرەكەی خۆشی ناوێ و ئەمە تووشی پەژارەیەكی زۆری كرد. سەبارەت بە پچوورین پێویست ناكا هیچ بڵێین. ئەو وای كرد كە شازادە ماری نەفرەتی لێبكا. بەڵام نەخێر، ئۆڵگا وا ناكا. بەڵكوو زۆر بە ژیری و سادەیی پێی ئەڵێ:

–ماوەیەكە هەستم بەوە كردووە شتێكم لە تۆدا خۆش ئەویست، كە حەزم ئەكرد ئەو شتە لە تۆدا هەبێ. ئەوەی كە شوڵتز پیشانی دابووم و ئەوەی كە پێكەوە بیرمان لێكردبوویەوە. من ئوبلۆمۆڤی داهاتووم خۆش ئەویست. تۆ پاک و بێفیزی ئیلیا؛ تۆ نەرمونیانی...

وەک کۆترێک؛ سەرت لەبن باڵتدا ئەشاریتەوە و چی ترت ناوێ؛ تۆ ئەتوانی هەموو ژیانت لە هەورەبان بگمێنی... بەڵام من وانیم. ئەم ژیانە بۆ من بەس نییە. من زیاترم ئەوێ. چییە ئەو شتە؟ خۆشم نازانم! بەمجۆرە لە ئۆبلۆمۆڤ جیا ئەبێتەوە و ئەکەوێتە دوای ئەو شتەی کە نییەتی و خۆیشی نازانێ چییە! کە سەرەنجام لە شوڵتزدا ئەیدۆزێتەوە. لەگەڵی ئەکەوێ و لەمە شادمانە. بەڵام لێرەش ناوەستێ و ناگاتە خاڵی کۆتایی. زۆر دیاردەی پێوار١٩ و گوماناوی ئازاری ئەدەن. زۆر شت هەیە کە ئەیەوێ تێیان بگات. نووسەر هەستە دەروونیەکانی ئەو بۆ ئێمە روون ناکاتەوە و ئێمە هەرجۆر لێکی دەینەوە، رەنگە بەهەڵەدا بچین. بەڵام وا پێئەچێ دڵ و بیری بە گیانی زیندووی ژیانی نوێوە تووشی هەڵچوون بووە کە ئەو زۆر لێی نزیکترە تا شوڵتز. ئێمە وای بۆ ئەچین لەبەر هەندێ ئەماژە کە لەم وتووێژەدا هاتووە:

«ئەی من چی بکەم؟ بەس خۆبەدەستەوەدان و ئازار چەشتن؟» ئۆڵگا ئەپرسێ.

«نەء! خۆت تەیار بکە بە جەربەزە و خۆڕاگری. ئێمە جووتێک تایتن٢٠ نین.» و لە کاتێکا ئەیگووشا بە سینگیدا: «ئێمە شوێن مانفرێد و فاوست ناکەوین تا بەرنگاری گەورترین کێشەکانی ئاڵۆزەکانی مرۆڤایەتی ببینەوە. تەنانەت بەدەم بانگێشتنیانەوە بۆ ئەو شەڕە ناچین. ئێمە سەرمان دائەخەین و مل بەکوێن چاوەڕوانی تێپەڕینی کاتە دژوارەکان ئەکەین؛ لە دوای ئەوەیە کە ژیان و بەختەوەری جارێکی تر بە دەممانەوە پێئەکەنێ...»

«ئەی ئەگەر هات و لەکۆڵمان نەبوونەوە؟ ئەی ئەگەر خەم و پەژارە زیاتر لێمان ئاڵا؟»

«ئەوسا ئێمەش وەکوو دیاردەیەکی ژیانی نوێ قبووڵی ئەکەین... بەڵام نا، وای لێنایەت، ئێمە تووشی نابین! ئەو پەژارە و دڵەخورپەیە بەتەنها هی تۆ نییە. ئەوە نەخۆشینی تێکڕای مرۆڤایەتیە. تۆ تەنها دڵۆپێکت بەرکەوتووە... ئەمانە ئەوکاتە ترسناکن کە مرۆڤ دەستی لە ژیان بەرئەبێ و پاڵپشی نامێنێ. بەڵام لەم هەلومەرجەی ئێمەدا...»

ئەو مەبەستی خۆی لە «هەلومەرجی ئێمە» روون ناکاتەوە، بەڵام دیارە کە ئەوە خۆیەتی کە «نایەوێ بەرەنگاری هێزە مەزنەکان ببێتەوە و تووشی جەنگێکی کوشندە ببێ.» ئەوە ئەوە کە ئەیەوێ سەری داخا و...» بەڵام ژنە ئامادەی ئەو جەنگەیە، بە تامەزرۆییەوە. بەس تەنها لەوە ئەترسێ ژیانی ئاسوودە و ئارامی لەگەڵ شوڵتز، وردە وردە وەکوو ژیانە کەمتەرخەمەکەی لای ئۆبلۆمۆڤی لێبێ. بە روونی دیارە ئەو نایەوێ سەر دانەوێنێ و بەملکەچی چاوەڕوانی تێپەڕینی کاتە دژوارەکان بێ، بەو هیوایەی کە ژیان جارێکی تر بە دەمیەوە پێبکەنێ. ئەوەندەی بڕوای بە ئۆبلۆمۆڤ نەما بەجێی هێشت و ئەگەر رۆژێ لە رۆژان باوەڕی بە شولتز سست ببێ، لەویش جیا ئەبێتەوە؛ ئەگەر کێشە ئاڵۆزەکان و گومانەکان بەردەوام ئازاری بدەن و شوڵتزیش پێی بڵێ ئەوانە وەکوو دیاردەکانی ژیانی تازە چاو لێباکات و سەری دابخات، دیسانەوە چارە هەر جیابوونەوە ئەبێ. ئۆڵگا زۆر باش ئۆبلۆمۆڤیزم ئەناسێ و لە هەموو شێوازێک و لەبن هەموو جۆرە دەمامکێکدا ئەیناسێتەوە، هەمیشەش ئەو توانا و جەربەزەی تیا ئەبێ بەوپەڕی بێبەزەییەوە دادگایی بکات و بڕیاری لەسەر بدات...

سەرچاوە:

Readings in Russian Civilization 1700-1917,Thomas Riha, The University of Chicago Press, Ltd., London,
First published 1964.
*https://www.amherst.edu/media/view/297815/original/Dobroliubov.pdf*

١٩ - Vague ون، نادیار؛ لێڵ.

٢٠ - لە میتۆلۆژی یۆنانیدا، تایتنەکان لە رەگەزی خودایان و لە وەچەی گایا و ئۆڕانووس، لە سەردەمی ئەفسانەیی خولی زێڕیندا حوکمیان کردووە؛ بە بوونەوەری زەبەلاح و ترسناک ئەوترێ.

# وتار و
# وەرگێڕان

* چەپی نوێ...
* ئەدەبی جیهانی
* گۆڕانکاری لە مافی مرۆڤدا...

ن. مەلیک یەحیا سەڵاحی
میلان کۆندێرا
شارۆلت بەنچ

و. لە فارسییەوە: کازان محەمەد
و. لە ئەڵمانییەوە: کەریم پەڕەنگ
و. لە فارسییەوە: عەزیز مورادی

# چەپی نوێ
# (تیۆرە ڕەخنەیی- دیالێکتیکییەکان)

نوسینی: د.مەلیك یەحیا سەلاحی
و. لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

## پێشەکی

جەنگی جیهانی یەکەم لە (١١ی تشرینی دووەمی ١٩١٨) لەگەڵ پەسەندکردنی ئاشتی لەلایەن ئەڵمانیاوە، بە کردەوە کۆتایی هات. قەیسەر ویلهلم بە ناچاریی وڵاتی هۆڵەندای بۆ نیشتەجێ بوون هەڵبژارد و سیستەمی ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانیا، فۆرمی گۆڕا بۆ کۆماری وایمار.

کۆماری وایمار لە ڕاستیدا یەکەمین ئەزموونی زانستی پەرلەمانتاریستی بوو لە ئەڵمانیادا، هەربۆیەشە دیموکراسییە لەرزۆک و زیانلێکەوتووەکەی، کۆمەڵێک کێشەی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و ململانێی ئایدۆلۆژیی گروپە چەپڕەو و ڕاستڕەو و میانڕەوەکانی لەگەڵ خۆی هێنا.

**کێشەی بنچینەیی لە فەلسەفەی مارکسیزمی ئەرتۆدۆکس لەکوێدایە کە ئایدۆلۆژیای سەرمایەداری و تەنانەت فاشیستییەکانیش هەمیشە پێگەی خۆیانی تێدا پتەوتر کردووە و، لە ساتی بردنەوەی گرەویشدان لە بزووتنەوە مارکسیستی و چەپڕەوانی لایەنگری کرێکاران**

ئەم وڵاتە دوای کۆتایهاتنی جەنگ و سەپاندنی قەرەبوو بەسەریدا، کەوتبووە بەردەم کۆمەڵێک قەیرانی ئابوری توندوتیژەوە.

دوای کۆتایهاتنی جەنگ، بزووتنەوە چەپڕەوەکان بەتایبەتی لە ساڵانی (١٩١٨ز- ١٩١٩ز) بە سەختی سەرکوت کران و هێزە لایەنگرەکانی سەرمایەداریی لە چوارچێوەی پروپاگەندەی دیموکراسیدا، سەرقاڵی پتەوکردنی پێگەی خۆیان بوون.

لەم هەلومەرجەدا رووناکبیرانی چەپڕەو و مارکسیست دەیانویست ئەوە بزانن چ لایەنێک لە فەلسەفەی مارکسیزم لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتییە هەنوکەییەکانی ئەڵمانیادا تەبا نییە، کام لەو بەشانەی فەلسەفەی هیگڵ بە دروستی پیادە کراوە یاخود پێویستی بە لێکدانەوەی نوێ هەیە.

بە کورتی کێشەی بنچینەیی لە فەلسەفەی مارکسیزمی ئەرتۆدۆکس لەکوێدایە کە ئایدۆلۆژیای سەرمایەداری و تەنانەت فاشیستییەکانیش هەمیشە پێگەی خۆیانی تێدا پتەوتر کردووە و، لە ساتی بردنەوەی گرەویشدان لە بزووتنەوە مارکسیستی و چەپڕەوانی لایەنگری کرێکاران.

هەر لەم بارەیەشەوە بوو کە لە ساڵی (١٩٢٢ز) (فلێکس وایل Flex Weil ) بیری لە دامەزراندنی ئەنجومەنێک کردەوە کە بتوانێ بە هاریکاریی هاوبیرە مارکسیستەکانی خۆی، ئەو خاڵانە دەستنیشان بکات کە چیتر لەگەڵ هەلومەرجی ئێستادا ناگونجێت، کۆمەڵێک تیۆری نوێ دابهێنێ بۆ گۆڕانکاریکردن لە ئایدۆلۆژیای مارکسیزمدا کە بە پێویست دەزانرێت.

وایل پێشتر لە (زانکۆی جینا) لە ژێر کاریگەری (کارل کورش Karl korsch)ی مامۆستایدا، ئینتیمای

بۆ مارکسیزم پەیدا کردبوو. بەو میراتەی کە لە دایکی و ئەو سامانەی لە باوکە دەوڵەمەندەکەیەوە بۆی مابۆوە، دەستی بە پشتگیری لە چالاکییە ڕادیکاڵەکان لە ئەڵمانیادا کرد.
دەبێ سەرنج لەوەش بدرێت کە لە بنەڕەتدا گرنگترین فاکتەر لەبارەی گومانکردن لە ئایدۆلۆژیای مارکسیزمی ئەرتۆدۆکسەوە لەلایەن چەپە نوێیەکان لە ئەڵمانیا، لەژێر کاریگەری ئاراستە دژە پۆزیڤیستی و دژە پیشەسازییەکانی ئایدۆلۆژیای مارکسیزمدا بوو، چونکە کاریگەری بیروباوەڕی ئەفلاتوونی و ژان ژاک ڕۆسۆیی لەنێو چەپە فرانکفۆرتییەکاندا سەبارەت بە دونیای سروشتی و کۆمۆنەی مرۆڤ زۆر بەهێز بوو.
یەکەمین چالاکی گرنگی (وایل)، وەگەڕخستنی (یەکەمین هەفتەی کاری مارکسیستی) بوو کە هەوڵی دا هاوبیرەکانی خۆی بەرەو لابردنی ئەو بۆچوونە ناکۆکانە هان بدا کە لەنێوانیاندا بوو. هاوڕێ سەرەتاییەکانی گەیشتبوونە ئەو ئەنجامەی دروستکردنی کۆمەڵێک ناوەندی بەهێزتریان پێویستە تا بتوانێ کۆیان بکاتەوە.
بەم شێوەیە دامەزراوەیەک بە هاریکاریی دارایی باوکی (فلێکس) واتا (هێرمان وایل) بە بڕی (١٢٠,٠٠٠) سەد و بیست هەزار مارک بونیاد نرا. ئەگەرچی هەوڵەکە لەپێناو ئەمەدا بوو دامەزراوەکە سەربەخۆیی دارایی و مەعنەوی هەبێت، بەڵام سەرەنجام گەیشتنە ئەو ئەنجامەی بۆ ئۆرگانیزەکردنی دامەزراوەکە، واباشترە سەربە زانکۆی فرانکفۆرت بن. هەربۆیەشە داهێنانەکانی دامەزراوەکە، بە قوتابخانەی فرانکفۆرت ناوبانگی پەیدا کرد.
لەم ڕووەوە (فرەدریک پۆلۆک Friedrich Pollok) کە خوێندنی تا وەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا لە زانکۆی فرانکفۆرت تەواو کردبوو، بووە ئاشنا و هاوبیری (ماکس هۆرکهایمەر Max Horkheimer ١٨٩٥-١٩٧٣) کە دواتر وەک یەکێک لە بەناوبانگترین تیۆرسێنەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت (چەپی نوێ) هاتە مەیدان.
هۆرکهایمەر پلەی دکتۆرای لە ساڵی (١٩٢٢ز) بە تێزێک دەربارەی (کانت) لە زانکۆی فرانکفۆرت بەدەستهێنا و بە پلەی یاریدەدەری ئوستاد مۆڵەتی هاوکاریی لەگەڵ ئوستادەکەی خۆی وەرگرت، سێ ساڵ پاشتر لەگەڵ بەرگری لە نامەی دکتۆراکەی، مۆڵەتی وانەبێژی سەربەخۆی لە زانکۆی فرانکفۆرت بەدەستهێنا، بواری وانەوتنەوە و لێکۆڵینەوەکەشی هەر کانت و هیگڵ بوو.
پۆلۆک، هۆرکهایمەر و وایل هەروەک زۆرینەی بونیادنەرانی چەپی نوێ، بە ڕەگەز جولەکە و لە خێزانە بۆرژوازی و دەوڵەمەندەکانی ئەڵمانیا بوون، ئەگەرچی دەیانتوانی لە بوارە ئابوری و بازرگانییەکان یاخود مەیدانە زانستییەکانی دیکەدا چالاکی بکەن، بەڵام ڕوویان لە فەلسەفە کرد.
کێشەی گرنگیان لەو سەروەختەدا، ڕەشبینی هاوکارە ئەکادیمییەکانیان بوو لەهەمبەر بیروباوەڕە چەپەکانیاندا و تەنها یارمەتییە داراییەکەی وایل بوو کە ئەو دامەزراوەیەی بڕیاری لێدابوو بەناوی (دامەزراوەی توێژینەوە کۆمەڵایەتییەکان) تۆمار بکات، دابیمەزرێنن و دەستبەکار ببن.
ئەگەرچی ئەم دامەزراوەیە بە فەرمی لە (٣)ی شوباتی (١٩٣٣ز) بەپێی بڕیاری وەزارەتی ڕۆشنبیری دامەزرا، بەڵام لە پراکتیکدا لە حوزەیرانی (١٩٢٤) دوای تەواوبوونی بیناکەی لە زانکۆی فرانکفۆرت دەستی بەکارەکانی کرد.
بۆ ئەوەی باشتر لە ئامانجی سەرەکی بونیادنەرانی

قوتابخانەی فرانکفۆرت بگەین، پێویستە سەرەتا چەمکی تیۆری و پاشان تیۆرە ڕەخنەییەکانیان شرۆڤە بکەین، چونکە گرنگترین ئامرازی کاریان، تیۆریزەکردنە ڕەخنەییەکانیان بوو.

## ا) تیۆرە ڕۆژانەیی و زانستییەکان

زمانی ڕۆژانەمان پڕە لە تیۆریی. لە زمانی باوی خەڵکدا، مەبەست لە تیۆریی ئەمەیە کە شیکردنەوەیەکی شیاو بۆ ڕووداوێک یاخود بابەتێکی دیاریکراو بخرێتە ڕوو تا بەم چەشنە وەڵامی پرسیارەکان بدرێتەوە.
کەواتە تیۆرەکان بە هەموو چەشنێک دەبنە مایەی زیاد کردنی زانیارییەکان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تیۆرانە تا چەند ڕەسەنن و تا چ ئەندازەیەک کاریگەرن، کاتێ دەسەلمێندرێت کە لە پراکتیکیشدا پیادە بکرێن، بەڵام ئەم تیۆرییانە تا ئەو ساتەی لە بۆتەی ئەزموون نەدراون، هەر بەهاکانی خۆیان دەپارێزن، دوای تاقیکردنەوە و ئەزموون کردنیان، بەهایان زیاد دەبێ یاخود لێی کەم دەبێتەوە یا تەنانەت لەناودەچێت.
تیۆرە زانستییەکان دەشێ لە تیۆرە ڕۆژانەییەکان جودا بکرێنەوە، بە جۆرێک تیۆرە زانستییەکان دەرەنجامی ڕەفتاری تایبەتیانەی ئەو مرۆڤانەن کە ئەو تیۆرەیان بەرهەم هێناوە. بە مانایەکی تر، تیۆرە زانستییەکان پەیوەندییەکی تایبەتی لە نێوان مرۆڤەکان و ژینگەی ژیانیان (جیهان) دروست دەکات. واتا لەگەڵ دارشتنی بەرنامەیەکی ورد و هۆشیار حکومڕانی بەسەر سروشتی ناوەکی (واتا یەکێتی زانست و توانستی مرۆڤ) و سروشتی دەرەکی (واتا ژیانی ژیرانەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر)دا دەکات.
وێڕای ئەوەش دەبێ سەرنج لەوە بدەین کە تیۆرە زانستییەکان بەپێی ئەوەی دەچنە سنوری کام لە بابەت و ڕەفتارە زانستییەکانەوە، بەدڵنیاییەوە کۆمەڵێک جیاوازی لە «پتەوی» و «نەگۆڕێتی» ئەم چەشنە کۆششانەی ناسینی مرۆیی دەهێنێتە ئاراوە.

## ب) تیۆرە دیالێکتیکییەکان

تیۆرە دیالێکتیکییەکان لە سەدەی نۆزدەهەم دا، کاردانەوەیەک بوو بۆ ڕەوتە ڕۆشنگەرییەکانی ئەو سەروەختە تا ناوەرۆکی ئەخلاقی مەسیحییەت لە فۆرمێکی فەلسەفی و شیاودا بپارێزێت.
فەلسەفەی زانستی پۆزەتیڤیستە مۆدێرنەکان لەم نێوانەدا فەلسەفەی ڕۆشنگەرییان پەراوێز خست تا فەلسەفەی کۆمەڵایەتی بتوانێ نۆرمەکانی کارنامەی سیاسی کامڵ بکات و (مەعریفەیەکی بێلایەن) و نادەمارگیر وەدەست بهێنێت.
ئەم جۆرە تێڕوانینە لەلایەن تیۆریستە دیالەکتیکەکانەوە، گەڕانەوەیەک بوو بۆ قۆناغی ڕۆمانتیک.
دوای قۆناغی جەنگ، پەیڕەوانی تیۆریزانە دیالەکتیکەکان بە پێچەوانەی پۆزەتیڤیزمەوە، ڕۆشنگەرییان بەو چەشنە هەڵدەسەنگاند کە کانت سەلماندی، واتا مەعریفە تیۆرییەکان نابێتە مایەی بێبەش کردنی ئەقڵی ئەزموونگەریی.
بوژاندنەوەی فەلسەفەی زانستی لە ئەڵمانیا تا دەگاتە ئەمڕۆ، ڕێگایەکی پڕ لە پێچاوپێچ و فرەلایەنی تەی کردووە، بەجۆرێک بەتەواوەتی خۆی لە مارکسیزمی ئەرتۆدۆکس جودا کردۆتەوە.

## ج) تیۆرە ڕەخنەییەکان

پێویستە ماکس هۆرکهایمەر بە بونیادنەری چەمکی زانستی (تیۆری ڕەخنەیی) دابنێین. ئەم چەمکە لە سەرەتادا لەنێو گروپە گچکە ڕووناکبیرییەکاندا بووبووە باو، بەڵام دواتر ناوی قوتابخانەی فرانکفۆرتی لێنرا.
هۆرکهایمەر و تیۆدۆر ئەدیرنۆ ( Theodor W. Aderno ١٩٠٣ –١٩٦٩) لەگەڵ هێربێرت مارکۆزە (١٨٩٨-١٩٧٩ Herbert Marcuse) بەناوبانگترین و ناسراوترین بونیادنەرانی ئەم قوتابخانە و چەمکە تیۆرییەن کە دواتر بووە بناغەیەک بۆ پرۆژە شۆڕشگێڕییەکان.
هۆرکهایمەر دەڵێت:» پێشڕەوان و ڕێبەرەکان لە خەباتە سیاسییەکاندا پێویستیان بە هۆش و زیرەکی هەیە، نەک ئەو ڕێنماییە زانکۆییانەی کە هەر بەناو پێگەیەکی تایبەتیان هەیە.».
تیۆرە ڕەخنەییەکان لێکۆڵینەوە دەربارەی نێوان واقیع و توانستە بەردەستەکان یاخود بە مانایەکی باشتر لەنێوان ئەو شتەی هەیە و ئەو شتەی دەشێ هەبێت، دەدوێت کە لە پرۆسە مێژووییەکەیی خۆیدا مرۆڤ بە ڕەفتاری خۆی هەنگاو بۆ گۆڕینی دەنێت. فەلسەفە و تیۆری کۆمەڵگایەک تا ئەو شوێنە دەبنە هاوشانی یەکتر کە لە ڕێگای لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەگرانەی پەیوەندییە زاڵەکانی نێو ئەو کۆمەڵگایە لەگەڵ توانستە بەردەستەکانیدا بەراورد بکات و بیانخاتەڕوو، بەجۆرێک کە ئینتیما و هێزە بەرهەڵستکارەکان لە کۆمەڵگادا، ڕێگە لە وەدیهێنانی نەگرن.
سەرچاوە: اندیشەهای سیاسی غرب در قرن بیستم، نشر قومس، چاپ اول، ١٣٨١، لاپەڕە (١٢٧-١٣١)

# ئەدەبی جیهانی

نووسینی: میلان کوندێرا
و.لە ئەڵمانییەوە: کەریم پەڕەنگ

## زۆرترین جۆراوجۆریی لە بچووکترین پانتاییدا

چ نەتەوەیی چ گەردوونیی، ڕەگداکوتاو یان لە ڕەگهەڵکێشراو، ئەورووپی بە قووڵیی لە پەیوەندی بە نیشتمانی دایکییەوە پێناسە دەکرێ؛ گیروگرفتی نەتەوەیی لە ئەورووپا – لەوانەیە – ئاڵۆزتر، لە شوێنێکی تر گرنگتر بێ، بە هەر حاڵ بە جۆرێکی ترە. تایبەتمەندییەکی تریشی دەچێتە سەر: لە پاڵ نەتەوە گەورەکانەوە نەتەوەی بچووک هەن، کە زۆریان لە ڕەوتی ئەم دوو سەدەی دواییدا سەربەخۆیی سیاسی خۆیان وەدەست هێناوە (یان جارێکی تر دۆزییەوە). لەوانەیە لە ڕێی لە ئاردابوونیانەوە بێ تێگەیشتم، کە فرەیی کولتوری بەهایەکی گەورەی ئەورووپییە. ئەو کاتەی جیهانی ڕووسی دەیویست وڵاتە بچکۆلەکەم بە وێنەی خۆی بگۆڕێ، ئیدیالم لە بارەی ئەورووپاوە بەمجۆرە دارشت: زۆرترین هەمەجۆریی لە بچووکترین پانتاییدا. ڕووسەکان ئیتر حوکمی نیشتمانەکەم ناکەن، بەڵام ئەم ئیدیالە هێشتا لە مەترسیدایە.

هەموو نەتەوەکانی ئەورووپا هەمان چارەنووسی هاوبەش دەژین، بەڵام هەریەکەیان بە هۆی ئەزمونی خۆیەوە جیاواز دەژی. لە بەر ئەوە مێژووی هەر هونەرێکی ئەورووپی (تابلۆکێشان، ڕۆمان، مۆسیقا هتد.) وەکو پێشبڕکێی دەست بە دەستگەیاندن وایە، کە تیایدا نەتەوە جیاوازەکان هەمان مەشخەڵ دەدەنە دەستی یەکترەوە. پۆلیفۆنی (فرەدەنگیی) سەرەتاکانی خۆی لە فەرەنسادا ئەزموون دەکا، لە ئیتالیا پەرە دەستێنی، لە هۆڵەندا بە ئاڵۆزییەکی باوەڕنەکردەنی دەگا و لە ئەڵمانیا، لە بەرهەمی باخدا بە چڵەپۆپە دەگا؛ قۆناغی ڕۆمانی فەرەنسی دوای گەشەکردنی ڕۆمانی ئینگلیزی سەدەی هەژدە دەکەوێ، ئەمجا ڕۆمانی ڕووسی، دوای ئەوە



میلان کوندێرا

ڕۆمانی سکاندناڤی هتد. دینامیک و هەناسەی درێژی مێژووی هونەرە ئەوروپییەکان بە بێ بوونی نەتەوەکان مایەی بیرلێکردنەوە نییە، کە ئەزموونە جۆراوجۆرەکانیان کانییەکی لەبن نەهاتووی سرووش پێکدەهێنن.

من بیر لە ئیسلەندا دەکەمەوە. لەوێ لە سەدەی ١٣ و ١٤دا کارێکی ئەدەبی چەند هەزار لاپەڕەیی سەرهەڵدەدا: داستانەکان. نە فەرەنسییەکان و نە ئینگلیزەکان لەو کاتەدا بە زمانی نەتەوەییان کارێکی پەخشانی وایان خوڵقاندبوو! تکایە مرۆڤ دەبێ ئەمە هەتا کۆتایی ڕوونبکاتەوە: یەکەم گەنجینەی گەورەی پەخشانی ئەوروپی لە بچووکترین وڵاتیدا خوڵقا، تەنانەت ئەمڕۆش سێسەد هەزار دانیشتووی نییە.

## نایەکسانیی لەچاککرنەوە نەهاتوو

ناوی میونیخ بۆتە ڕەمزی بەچۆکداهاتنی هیتلەر. بەڵام با کۆنکرێتتر بین: لە میونیخ، لە پایزی ١٩٣٨دا، چوار زلهێزەکە، ئەڵمانیا، ئیتالیا، فەرەنسا و بەریتانیای گەورە، سازشی چارەنووسی وڵاتێکی بچووکیان دەکرد، تەنانەت مافی قسەکردنیشیان لێسەندەوە. لە ژوورێکی دوورەدەستدا دەبوو هەردوو دیپلۆماتە چیکییەکە بە درێژایی شەو چاوەڕوانی ئەوە بن، کە سەرلەبەیانی بە داڵانێکی درێژدا بردرانە هۆڵێکەوە، کە چامبەرلەین و دالادیر شەکەت، لەخۆبایی، بە دەم باوێشکدانەوە حوکمی مەرگیان پێڕاگەیاندان.

«وڵاتێکی دوور، کە ئێمە کەمی لەبارەوە دەزانین». ئەم وشە بەناوبانگانە، کە چامبەرلەین پاساوی بەقوربانیکردنی چیکوسلۆڤاکیای دەدا، ئامانجپێک بوون. لە ئەوروپا لە لایەکەوە دەوڵەتە گەورەکان هەن و لە لایەکەی ترەوە دەوڵەتە بچووکەکان؛ ئەو نەتەوانە هەن کە لە هۆڵی دانوستانەکاندان

و ئەوانەی بە درێژایی شەو لە ژووری چاوەڕوانیدا چاوەڕوانن.

ئـەوەی نەتەوە گەورەکان لە بچووکەکان جودا دەکـاتــەوە، تەنیا پـێـوەری چەندێتی ژمــارەی دانیشتووان نییە؛ شتێکی لەوە قووڵترە: بوونیان بۆ خۆیشیان یەقینێکی بێگومان نییە، بەڵکو هەمیشە پرسیارێکە، بەرەنگاربوونەوەیەکە، سەرکێشییەکە؛ لە بەرامبەر مێژوودا لە بەرگریدان، لە بەرامبەر ئەو هێزەدا، کە بەسەریاندا دەڕوا، کە ڕەچاویان ناکات، تەنانەت درکیشیان پێناکات. گومبرۆڤیچ دەنووسێ: «تەنیا بەوەی ئێمە ڕووبەڕووی مێژوو دەبینەوە، دەتوانین ڕووبەڕووی مێژووی ئەمڕۆ ببینەوە.»

چەند پۆڵۆنیی هەیە ئەوەندە ئیسپانی هەیە. بـەڵام ئیسپانیا هێزێکی کۆنە، کە هەرگیز لە بوونیدا لە مەترسیدا نەبووە، بە پێچەوانەوە مێژوو پۆڵۆنییەکانی فێر کردووە، نەبوون چی دەگەیەنێ. وڵاتـەکـەیـان لـێـزەوت کـرا، زیاتر لە سەدەیەک لە مۆڵگەی مەرگدا ژیـان. «پۆڵۆنیا هێشتا لە نـاونـەچـووە» یەکەم کۆپلەی کڵۆڵی سـروودی نیشتمانیان وا دەڵێ و پێش نزیکەی پەنجا ساڵ ڤیتۆڵد گۆمبرۆڤیچ لە نامەیەکیدا بۆ چیزاو میۆوژ ڕستەیەکی نووسی، کە نەدەتوانرا بە زەینی هیچ ئیسپانییەکدا بێت: «ئەگەر زمانەکەمان سەد ساڵی تر هێشتا لەئارادا بێت ...»

با وێنای ئەوە بکەین، کە داستانەکانی ئیسلەندا بە ئینگلیزی نووسراوون. ئەمڕۆ ناوی پاڵەوانەکانیان وەکو ناوی پاڵەوانەکانی تریستان یان دۆن کیخۆتە بە ئێمە ئاشنا دەبوون؛ ئیستاتیکی دانسقەی لە نێوان کرۆنۆلۆلژیا و خەیاڵدا ئەمبەر و ئەوبەرکەرەکەی تیۆرییەکی زۆری لێدەکەوتەوە؛ مرۆڤ شەڕی لە بارەی ئەوەوە دەکرد، ئایا دەتوانرێ وەکو یەکەم ڕۆمانەکانی ئەورووپا بێنە هەژماردن یان نا. من نامەوێ بانگاشەی ئەوە بکەم، مرۆڤ لە بیری کردوون؛ پاش سەدان ساڵ بێپەروایی لە زانکۆکانی سەرجەمی جیهاندا دەخوێندرێن؛ بەڵام سەر بە «ئارکیۆلۆژیای گێڕانەوە»ن، کاریگەرییان لە سەر ئەدەبی زیندوو نییە.

لەبەر ئەوەی فەرەنسییەکان ڕانەهاتوون جیاوازیی لە نێوان نەتەوە و دەوڵـەتـدا بکەن، زۆر جار دەبیستم باسی کافکا وەکو نووسەرێکی چیکی دەکەن (لە ساڵی ١٩١٨ەوە بە ڕاستی هاووڵاتی چیکوسلۆڤاکیا بوو). بێگومان ئەمە بێمانایە. دەبێ بووترێ، کافکا، تەنیا بە ئەڵمانی دەینووسی و ڕوون و ئاشکرا وەکو نووسەرێکی ئەڵمانی لە خۆی دەڕوانی. بەڵام با چرکەساتێک وێنای ئەوە بکەین، کتێبەکانی بە چیکی نووسیبا. ئەمڕۆ کێ دەیناسی؟ پێش ئەوەی بلوێ، کافکا لە هۆشیاریی جیهاندا بسەپێنرێ، دەبوو ماکس برۆد بە درێژایی بیست ساڵ و بە یارمەتی گرنگترین نووسەرە ئەڵمانەکان کۆششێکی زۆر بکا! ئەگەر پەخشکارێکی پراگ بیشیتوانیایە کتێبەکانی کافکایەکی گریمانەیی بڵاو بکاتەوە، هیچ هاووڵاتییەک (واتە هیچ چیکییەک) ئەو دەستەڵاتەی نەبوو، ئەو دەقە ناوازانە بە جیهان بناسێنێ، بە زمانی وڵاتێکی دوور نووسراو. نەخێر، بڕوام پێبکەن، ئەگەر کافکا بە چیکی بینووسیبا ئەمڕۆ کەس نەیدەناسی.

ڕۆمانی فێردەردەرکی گومبرۆڤیچ ساڵی ١٩٣٨دا بە پۆڵۆنی دەرچوو. دەبوو پازدە ساڵ چاوەڕوان بێ، بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا لە لایەن پاخشکارێکی فەرەنسییەوە بخوێنرێتەوە و ڕەتبکرێتەوە. چەندان ساڵی درێژی تریشی خایاند، هەتا فەرەنسییەکان توانیان لە کتێبفرۆشییەکاندا بیدۆزنەوە.



باخ

### ئەدەبی جیهانی

دەتوانرێ بە شێوەیەکی گشتی کارێکی هونەری لە دوو ناوکۆییدا خانەبەند بکرێ: یان لە مێژووی گەلەکەیدا (با ناوی بنێین ناوکۆیی بچووک) یان لە مێژووی سەرو نەتەوەوەی هونەرەکە خۆیدا (با ناوی بنێین ناوکۆیی گەورە). ئێمە ڕاهاتووین زۆر بە بێ گومان مۆسیقا لە ناوکۆیی گەورەدا ببینین: بۆ مۆسیقازانێک زۆر گرنگ نییە بزانێ زمانی دایکی ئۆرلاندۆ دی لاسۆ یان باخ چی بووە؛ بە پێچەوانەوە ڕۆمانێک، لە بەر ئەوەی وابەستەی زمانەکەیەتی، لە هەموو زانکۆکانی جیهاندا نزیکەی تەنیا لە ناوکۆیی نەتەوەیی بچووکدا دەخوێندرێ. ئەوروپا نەیتوانی وا بکا، ئەدەبەکەی وەکو یەکەیەکی مێژوویی وێنا بکا و من دەستبەرداری دووبارەکردنەوەی ئەوە نابم، کە نسکۆی ڕۆشبنیریی لە چاککردن نەهاتووی لەوەدایە. چونکە بۆ ئەوەی لە مێژووی ڕۆماندا بمێنینەوە: ستێرن کاردانەوەی بۆ ڕابلی هەیە، دیدرۆ لە لایەن ستێرنەوە دەهەژێنرێ، فیدلینگ هەمیشە بۆ سێرڤانتس دەگەڕێتەوە و ستێندال خۆی بە فیدلینگ دەپێوێ، نەریتی فلاوبێر لە کاری جۆیسدا درێژەی پێدەدرێ و برۆخ لە تاودانەوەی لە بارەی جۆیسەوە پەرە بە شیعرییەتی ڕۆمانی خۆی دەدا، کافکا بۆ گارسیا مارکیزی ڕووندەکاتەوە، کە شیاوە، لە نەریت دەربچیتە دەرێ و «بەجۆرێکی تر بنووسی».

ئـەوەی ئێستا من دەیڵێم، بۆ یەکەمجار لە لایەن گوێتەوە داڕێژرا: «ئێستا ئەدەبی – نەتەوە نایەوێ زۆر شت بڵێ، قۆناغی ئەدەبی جیهانی هاتووە و ئێستا دەبێ هەموو کەسێک هەوڵبدا، ئەم قۆناغە خێراتر بکا.» ئەمە تا ڕادەیەک میراتنامەی گوێتەیە. میراتنامەیەکی ناپاکیلێکراوی تریش. ئێوە دەتوانن لاپەڕەکانی هەر پەیڕەونامەیەکی بتانەوێ، هەر ئەنتۆلۆژییەکی بتانەوێ هەڵبدەنەوە، ئەدەبی جیهانی تیایدا هەمیشە وەکو لەتەنیشتیەکەوەی ئەدەبە نەتەوەییەکان دانراون. وەکو مێژوویەکی ئەدەبەکان! ئەدەبەکان، بە کۆ!

ڕابلیش، کە هاونیشتمانەکانی هەمیشە کەمتر لە خۆی نرخیان دەگرت، هەرگیز باشتر لە ڕووسێک لێی تێنەگەیشتن: باختین؛ دۆستەیەڤسکی لە لایـەن فەرەنسییەکەوە: جید؛ ئیبسن لە لایەن ئیرلەندییەکەوە: گ.ب. شـاو؛ جەیمس جۆیس لە لایەن نەمساوییەکەوە: هێرمان برۆخ. بایەخی گەردوونی وەچەی ئەمەریکییە گەورەکانی باکور، هەمێنگوەی، فۆکنەر، دۆس پاسۆس یەکەمجار لە لایەن نووسەرەوە فەرەنسییەکانەوە بەیانکرا («من




لە فەرەنسا باوکی بزوتنەوەیەکی ئەدەبیم»، لە ساڵی ١٩٤٦ فۆکنەر ئەمەی نووسی لە هەمان کاتدا گازاندە لەو کەڕییە دەکا، کە لە وڵاتەکەی خۆیدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە). ئەم نموونە کەمانە ڕیزپەڕی تایبەتی ڕێسا نین، نەخێر، ڕیساکە ئەمەیە: میانەیەکی جوگرافی چاودێر لە ناوکۆیی ناوچەیی دوور دەخاتەوە و ڕێی پێدەدا، بە سەر ناوکۆیی گەورەی ئەدەبی جیهانیدا بڕوانێ، کە تەنیا ئەو لە توانایدایە، بەهای ئیستاتیکی ڕۆمانێک بخاتە گەڕ، واتە: ڕەهەندی هەتا ئێستا نەناسراوی بوون، کە ئەم ڕۆمانە توانیویەتی زانیاری دەربارەی بە دەستەوە بدا؛ تازەیی شێواز، کە تێگەیشت بیدۆزێتەوە.

ئایا دەمەوێ بەمە بڵێم، بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ حوکم بە سەر ڕۆمانێکدا بدات مەرج نییە زمانە ئەسڵەکە بزانێ؟ بێگومان، بە تەواوی دەمەوێ ئەوە بڵێم! جید ڕووسی نەدەزانی، گ.ب. شاو نەرویژی نەدەزانی، سارتەر دۆن پاسۆسی بە زمانی ئەسڵی نەخوێندۆتەوە. ئەگەر کتێبەکانی ڤیتۆڵد گۆمبرۆڤیچ و دانیلۆ کیش تەنیا وابەستی حوکمی ئەوانە بوونایە، کە پۆڵۆنی و سێربۆکرواتیان دەزانی، ئەوا تازەیی توندڕەوی ئیستاتیکییان هەرگیز نەدەدۆزرایەوە.

(ئەی پرۆفیسۆرەکانی ئەدەبی بیانی؟ ئایا بە تەواوی ئەرکی سروشتییان نییە، لە ناوکۆیی ئەدەبی جیهانی لە کارەکان بکۆڵنەوە؟ نائومێد. بۆ ئەوەی شارەزاییان وەکو پسپۆڕ بسەلمێنن، شەڕەنگێزانە هاوسۆزیی لەگەڵ ناوکۆیی نەتەوەیی بچووکی ئەو ئەدەبانەدا دەکەن، کە دەیلێنەوە! خۆیان دەکەنە بڵندگۆی ڕایەکان، حەز و حوکمە پێشوەختەکانیان! ئومێدبڕاو: لە زانکۆی وڵاتە بیانییەکان کارێکی هونەری بە قووڵترین شێوە لە دەڤەری وڵاتەکەیدا قەتیس ماوە.)

## ناوچەگەریی بچووکەکان

مرۆڤ ناوچەگەریی چۆن پێناسە دەکا؟ وەکو بێتوانایی (یان ملنەدان)، کەلتوری خۆی لە ناوکۆیی گەورەدا ببینێ: دوو جۆری ناوچەگەریی هەیە: ناوچەگەریی نەتەوە گەورەکان و ناوچەگەریی نەتەوە بچووکەکان. نەتەوە گەورەکان بەرهەڵستی بیرۆکەی گۆیتەیی ئەدەبی جیهانی دەکەن، لەبەر ئەوەی ئەدەبی خۆیان ئەوەندە دەوڵەمەند بۆ دەردەکەوێ، وەکو پێویستیان بەوە بێ بایەخ بەوە بدەن، کە لە شوێنێکی تر دەنووسرێ. کازیمیرتس براندیس لە یاداشتنامەکانیدا دەنووسێ. پاریس ١٩٨٥-١٩٨٧: «خوێندکاری فەرەنسی کەلێنی زانستیی لە کەلتوری جیهانیدا زۆرترە لە خوێندکاری پۆڵۆنی، بەڵام فەرەنسیەکە دەتوانێ ڕێی ئەمە بەخۆی بدا، چونکە کەلتورەکەی خۆی کەم تا زۆر سەرجەمی ڕەهەندەکان، سەرجەمی ئەگەرەکان و قۆناغەکانی گەشەکردنی سەرجەمی جیهانی لە خۆی گرتووە.»

نەتەوە بچووکەکان لەبەر هۆی بەتەواوی پێچەوانە لە هەمبەر ناوکۆییە گەورەکاندا دوورەپەرێزن: ڕێزێکی زۆریان بۆ کولتوری جیهان هەیە، بەڵام ئەمەیان وەکو شتێکی نامۆ بۆ دەردەکەوێ، وەکو ئاسمانێک بە سەریانەوە، دوور و دەستپێنەگەیشتوو، واقیعێکی ئیدیال، کە ئەدەبی نەتەوەییان پەیوەندییەکی کەمی پێیەوە هەیە. نەتەوەی بچووک نووسەرەکانی بەو قەناعەتە گۆشکردووە، تەنیا هی خۆیەتی. نیگایەک بۆ ئەودیوی سنوورەکان ئاڕاستە بکرێ، خۆ پەیوستکردن لەگەڵ ئەو هەڤاڵانەی لە دەڤەری هونەری سەرووی نەتەوە وەکو لووتبەرزیی، قێزەون لە بەرامبەر ئەوانەی خۆیدا سەیر دەکرێ. لەبەر

ئەوەیش نەتەوە بچووکەکان زۆر جار ئەزموونی بارودۆخی وا دەکەن، کە تیایدا مەسەلە مانەوەیە، بە بێ زەحمەت بۆیان دەلوێ، ئەم هەڵوێستە وەکو پاساودانی ئاکاری بخەنە ڕوو.

فرانتس کافکا لە یاداشتنامەکانیدا باسی ئەوە دەکا. لە دیدی ئەدەبێکی «گەورە»وە، واتە ئەڵمانییەوە، چاودێری ئەدەبی جوولەکە و چیکی دەکا. دەڵێ، نەتەوەیەکی بچووک، ڕێزێکی زۆر بۆ نووسەرەکانی دادەنێ، لە بەر ئەوەی فیزی «بەرامبەر ژینگەی نـەیـار» لـە لا دەخولقێنێ؛ «ئــەدەب کەمتر کاروبارێکی مێژووی ئەدەبە وەکو کاروباری گەل»؛ هەر ئەم دەڵاندنە ناوازەیە لە نێوان ئــەدەب و گەلەکەیدا بڵاوکردنەوەی ئاساندەکا «لەو وڵاتەدا، کە خۆی بە دروشمی سیاسییەوە بەستووەتەوە». ئەمجا دەگاتە ئەم چاودێرییە چاوەڕواننەکراوە: «ئــەوەی لە ناو ئەدەبی گەورە لە خـوارەوە ڕوو دەدا و ژێرزەمینێکی پێویستی بیناکە پێکدەهێنێ، لێرەدا لە بەر تیشکی تــەواودا ڕوو دەدا، ئەوەی لەوێ تێکەڵبوونێکی شێوە چرکاساتیی پێکدەهێنێ، لێرەدا هیچ شتێک لە بڕیاری ژیان و مردنی هەمووان کەمتر ناهێنێتە ئاراوە.»

دوا سەرنج کۆراڵێکی سمێتانا (ساڵی ١٨٦٤ نووسراوە) بەم شیعرانەوە بیرمان دەخاتەوە: «دڵت خۆش بێ، دڵت خۆش بێ، قەلەڕەشکەی چڵێس، خواردنێکی خۆشت بۆ ئامادە دەکرێ: تۆ دەتوانی لەزەت لە خواردنی ناپاکەکانی نیشتمان ببینی ...» مۆسیقاژەنێکی وا گەورە چۆن توانی قەشمەرییەکی وا خوێناوی پێشکەش بکا؟ گوناهێکی گەنجێتی؟ ئەمە بەهانە نییە، ئەو کاتە تەمەنی چل ساڵ بوو. جگە لەوە، ئەو کاتە ئەمە چی دەگەیاند، «ناپاکێکی نیشتمان»؟ ئەوانەی هاووڵاتییەکانیان سەر بڕی لە مەفرەزەدا ڕیز ببەستن؟ زۆر هەڵەیە: ناپاک هەموو چیکییەک بوو، کە پێی خۆشتر بوو لە پراگەوە بگوازێتەوە بۆ ڤیێنا، بۆ ئــەوەی بە ئاسوودەیی ئاوێتەی ژیانی ئەڵمانی بێ. وەکو کافکا دەڵێ، « لەوێ تێکەڵبوونێکی شێوە چرکاساتیی پێکدەهێنێ، لێرەدا هیچ شتێک لە بڕیاری ژیان و مردنی هەمووان کەمتر ناهێنێتە ئاراوە».

دەستبەسەرداگرتنی هونەرمەندان لە لایەن نەتەوەوە وەکو تیرۆریزمێکی ناوکۆیی بچووک گوزارشتی لێدەکرێ، کە هەموو مانای کارێک بۆ ئەو ڕۆڵە کورت دەکاتەوە، لە وڵاتی خۆیدا ڕوو دەیگێڕێ. مەلزەمە کۆنەکەی ڤینتسێنت دئندی کۆرسەکانی ئاوازدانان لە قوتابخانەی گۆرانی لە پاریس هەڵدەدەمەوە، کە سەرەتای سەدەی بیستەم وەچەیەکی سەرومڕی مۆسیقاری فەرەنسی پێگەیاند. هەندێکی پشت بە سمێتانا و دڤۆراک دەبەستێ، بە تایبەتی دوو ئاوازەکەی سمێتانا بۆ چوار ژەنەری ئامێری ژێدار. چی فێر دەبین؟ بانگەشەیەکی لە شێوەی جیاوازی چەندان جار دووبارە بووەوەدا: ئەومۆسیقایەی کە لە «شێوازی فۆلکلۆردا»دایە، گوایە «سروشی لە گۆرانی فولکلۆر و سەمای فۆلکلۆر وەرگرتووە». ئەگینا هیچی تر؟ هیچ. قسەی هیچوپووچ و بێ مانا؟ قسەی هیچوپووچ لە بەر ئەوەی مرۆڤ جێپەنجەی گۆرانی فۆلکلۆر لە هەموو شوێنێک دەدۆزێتەوە، لە لای هایدن، لە لای شۆپا، لە لای لیست، لە لای برامز؛ بێ مانا لەبەر ئەوەی دوو ئاوازەکەی سمێتانا بۆ چـوار ژەنــەری ئامێری ژێـدار هەتا بڵێی ددانپیدانانێکی ناوەکین، لە ژێر دڵەخورپەی تراژیدیایەکدا نووسراون: سمێتانا هەستی بیستنی لە دەست دابوو؛ ئاوازە (نایاب!)ەکانی چوار ئامێر، وەکو خۆی وتوویەتی، «کرێوەی مۆسیقان لە سەری

پیاوێکی کەڕدا». ڤینتسێنت دئندی چۆن توانی وا بە هەڵەدا بچێ؟ زۆر ڕێی تێدەچێ ئەم مۆسیقایەی نەناسیبێ و هەر ئـەوەی دووبـارە کـردووەتـەوە کە گوێی لێی بووە. دادوەرییەکەی لە گەڵ ئەو وێنایەدا دەگونجا، کە کۆمەڵگەی چیکی بۆ ئەم دوو ئاوازدانەرە دەیکرد. بۆ ئەوەی ناوبانگیان بۆ سوودی سیاسی بەکار بهێنرێ (بۆ ئەوەی بتوانرێ فیزیان «بەرامبەر دەوروبەری نەیار» پیشان بدرێ)، پارچە بچووکە دۆزراوەکانی ناو مۆسیقاکانیان کۆ کردەوە و ئاڵایەکی نەتەوەییان پێ درووی، کە بە سەر سەرجەمی کارەکانیانەوە شەکایەوە. جیهان سووکوسانا تەنیا بە نەزاکەتەوە (یان بەدخوازنە) ئەو شرۆڤەیەی قبووڵکرد کە خرابووە بەردەستی.

## ناوچەگەریی مەزنەکان

ئەی ناوچەگەریی مەزنەکان؟ پێناسەکە هاوشێوە دەمێنێتەوە: بێتوانایی (یان ملنەدان)، کولتوری خۆ لە ناوکۆیی گەورەدا ببینی. پێش چەند ساڵێک، پێش کۆتایی سەدەی ڕابردوو، ڕۆژنامـەیـەکـی پـاریـس ڕاپرسییەکی لـە نـاو سـی کـەسـایـەتـی کـاریـگـەری ڕۆشبیری ئەو کاتە کرد – ڕۆژنامەوان، مێژوونووس، کۆمەڵناس، پەخشکار و چەند نووسەرێک. هەموو کەسێک دەبـوو کتێبەکانی سەرجەمی مێژووی فەرەنسا بە ڕیز بژمێرێ کە بە لایەوە زۆر گرنگن؛ دوای ئەم سی لیستەیە بە دە کتێبەوە ئەمجا باشترین لیستەی سەد کتێب دروست کرا؛ ئەگەر پرسیارەکەش («کـام کتێبانە فەرەنسایان دروست کرد؟») توانرا بە شێوەی جیاواز شرۆڤە بکرێ، بـەڵام ئەنجامەکە وێنایەکی تا ڕادەیـەک تەواو بە دەستەوە دەدا، سەربژاردەیەکی ڕۆشبیری فەرەنسی ئەمڕۆ چی لە ئەدەبی وڵاتەکەیدا بە گرنگ دەزانێ.

لەم پێشبرکێیەدا بێنەواکانی ڤیکتۆر هوگۆ وەکو بەرندە دەرکەوت. ئەمە نووسەرێکی بیانی تووشی سەرسووڕمان دەکا. لە بەر ئەوەی نە بۆ خۆی و نە بۆ مێژووی ئـەدەب جارێک لە جارێک ئەم کتێبەی بە تایبەت بە گرنگ زانیوە، دەمودەست تێدەگا، کە ئەو ئەدەبە فەرەنسییەی ئەو حەزی لێیە، هەمان ئەدەب نییە، کە لە فەرەنسا حەزی لێدەکرێ. لە پلەی یازدەیەمدا یادەوەرییەکان ١٩٣٩-١٩٤٢ی دی گۆل دێت. کتێبی پیاوێکی دەوڵەت، سوپاییەک دەتوانرێ بە زەحمەت لە دەرەوەی فەرەنسا بایەخێکی بەو جـۆرەی بدرێتێ. بەڵام ئەمە سەرلێشێوێنەر نییە، بەڵکو ئەو حەقیقەتەی، کە شاکارەکان دوای ئەمە دێن سەرلێشێوێنەرە! ڕابلی لە پلەی چواردەیەمدا دێت! ڕابلی دوای دی



هێرمان بڕۆخ.

گۆل! لەم بۆنەیەدا، دەقی پرۆفیسۆرێکی کاریگەری فەرەنسی دەخوێنمەوە، کە تیایدا ڕوونی دەکاتەوە، ئەدەبی وڵاتەکەی دامەزرێنەرێکی وەکو دانتێ بۆ ئیتالیا، شەکسپیرێکی بۆ ئینگلتەرای کەمە هتد. مەحاڵە، ئای لەوە، ڕابلی لە دیدی هاووڵاتییانیەوە پیرۆزیی دامەزرێنەری نییە! لەگەڵ ئەوەشدا لە چاوی نزیکەی هەموو ڕۆماننووسە مەزنەکانی سەردەمەکەمانەوە لە پاڵ سێرڤانتسدا دامەزرێنەری سەرجەمی هونەرێکە، هونەری ڕۆمان.

ئەی ڕۆمانی سەدەی هەژدە و نۆزدە، ڕووپەلی شکۆمەندیی فەرەنسا؟ سوور و ڕەش بە پلەی بیست و دوو، مەدام بۆڤاری پلەی بیست و پێنج، گێرمینال پلەی سی و دوو؛ کۆمیدیای مرۆڤانە تەنیا پلەی سی و چوار (ئایا ئەمە شیاوە؟ کۆمیدیای مرۆڤانە، کە بە بێ ئەو ئەدەبی ئەورووپی وێنا نەدەکرا!)؛ دۆستایەتییە مەترسیدارەکان پلەی پەنجا؛ بوڤار و پیکوچی، ئەو داماوانە، وەکو دوو قوتابی هەناسەسوار لە دوای دواوە ڕادەکەن. چەند شاکارێکی ڕۆمانیش لە ناو سەد کتێبە هەڵبژێردراوەکاندا هەر نین: خەڵوەتگەی پارما، پەروەردەکردنی هەستەکان؛ جاکی چارەنووسگەر (بە ڕاستیش نۆژەنیی بێهاوتای ئەم ڕۆمانە تەنیا دەتوانرێ لە ناوکۆیی مەزنی ئەدەبی جیهانیدا بنرخێندرێ).

ئەی سەدەی بیستەم؟ گەڕان بە دوای کاتی ونبوودا لە پلەی حەوتەمدا. نامۆی کاموی پلەی بیست و دوو؟ ئەی چی تر؟ نزیکەی هیچ. نزیکەی هیچ شتێک کە ئەدەبی مۆدێرنی پێدەگوترێ، هیچ لە شیعری مۆدێرن. وەکو کاریگەریی گەورەی فەرەنسا بە سەر هونەری مۆدێرنەوە هەرگیز ڕووی نەدابێ! وەکو بۆ نموونە ئەپۆلۆنیر (کە لە سەر ئەم لیستەیە نییە) سەرجەم قۆناغێکی شیعری نەوروژاندبێ!

لەمەش سەرسووڕهێنەرتر: نەبوونی بێکێت و ئیۆنیسکۆ. چەند درامانووسی سەدەی ڕابردوو وزەی ئەوانی هەبوو، تیشکدانەوەیان؟ یەکێک؟ دوو؟ زیاتر نەء. بیرخستنەوەیەک: ئازادیی ژیانی کەلتوری لە چیکۆسلۆڤاکیای کۆمۆنیستدا بە سەرهەڵدانی شانۆی بچووکەوە لە سەرەتای شەستەکاندا بەسترابوو. لەوێ بۆ یەکەمجار شانۆنامەیەکی ئیۆنیسکۆم بینی، ئەویش لە بیر نەدەچووەوە؛ تەقینەوەی فەنتازیایەک، سەرهەڵدانی ئەقڵێکی بێ نەترس. من زۆر جار وتوومە: بەهاری پراگ هەشت ساڵ پێش ١٩٦٨ لە گەڵ نمایشی شانۆنامەکانی ئیۆنیسکۆ لە شانۆی بچووکی نا زابرادلی دەستی پێکرد.

دەتوانرێ بەرپەرچم بدرێتەوە، ئەم بەدوایەکداهاتنەی ناوم هێنا کەمتر گەواهیدەری ناوچەگەرییە وەکو بەرەو ئاقارچوونێکی تازەتری ڕۆشبیری، کە بە پێی ئەوە پێوەرە ئیستاتیکیەکان هەمیشە سەنگیان کەمترە: ئەوانەی دەنگیان بە بێنەواکان داوە بیریان لە گرنگیی ئەم کتێبە لە مێژووی ڕۆماندا نەکردووەتەوە، بەڵکو بیریان لە زایەڵەی گەورەی کۆمەڵایەتی ئەم کتێبە لە فەرەنسادا کردووەتەوە. ئەمە ڕوونە، بەڵام تەنیا ئەوە دەسەلمێنێ، کە بێپەروایی بەرامبەر بەهای ئیستاتیکی بە حەتمی سەرجەمی کەلتور بۆ ناوچەگەریی دەگەڕێنێتە دواوە. فەرەنسا تەنیا ئەو وڵاتە نییە، هەر فەرەنسی تێدا بژی، فەرەنسا ئەو وڵاتەشە، کە ئەوانی تر تێی دەنوارن و بەهرەی لێ وەردەگرن. بیانییەکیش ئەو کتێبانەی لە دەرەوەی وڵاتەکەیدا سەریانهەڵداوە بە پێی بەها (ئیستاتیکی، فەلسەفی)یەکان دەنرخێنێ. ڕێساکە جارێکی تر

دەسەلمینرێ: ئەم بەهایانە لە گۆشەنیگای ناوکۆیی بچووکەوە خراپ دەناسرێنەوە، ئەگەر فیزی ناوکۆیی بچووکی نەتەوەیەکی گەورەش بێ.

## پیاوەکەی ڕۆژهەلات

لە سالانی حەفتاکاندا ولاتەکەم بەجێهێشت و چووم بۆ فەرەنسا، بە سەرسووڕمانەوە دەبوو بۆم دەربکەوێ، کە من «کۆچبەرێکم لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپاوە». بۆ فەرەنسییەکان بە ڕاستی ولاتەکەم سەر بە ڕۆژهەلاتی ئەوروپا بوو. پەلەم دەکرد، لە هەموو شوێنێک فەزیحەی ڕاستەقینەی ڕەوشەکەمان ڕوون بکەمەوە: سەربەخۆیی نەتەوەییمان زەوت کرابوو، تەنیا لە لایەن ولاتێکی ترەوە داگیر نەکرابووین، بەلکو لە لایەن جیهانێکی ترەوە، جیهانی ڕۆژهەلاتی ئەوروپا، ڕەگداکوتاو لە ڕابردووی بیزەنتیدا، لە گێرمە و کێشەی مێژوویی خۆیدا، لە سیمای بیناسازیی خۆیدا، لە ئایینی خۆیدا (ئۆرتۆدۆکس)، ئەلفبای خۆی (کریلی لە نووسینی یۆنانییەوە هەلهێنجراو) هەروەها کۆمۆنیزمی خۆی هەیە (کەس نازانێ کۆمۆنیزمی ئەوروپای ناوەڕاست بە بێ سەروەریی ڕووسیا چی لێدەردەچوو ، بەلام بە هیچ جۆرێک هاوشێوەیی لە گەل ئەوەدا نەدەبوو، کە ئێمە بینیمان).

بەرە بەرە تێگەیشتم، کە من «لە ولاتێکی بچووکەوە هاتووم کە زۆر کەم شتی لەبارەوە دەزانرا». خەلکەکەی دەوروبەرم بایەخێکی زۆریان بە سیاسەت دەدا، بەلام زانیارییەکی کەمی جوگرافییان هەبوو: وەکو «بەکۆمۆنیستکراو» سەیریان دەکردین، نەک وەکو «داگیرکراو». جگە لەوەش: ئایا چیکییەکان لە کەوناراوە سەر بە هەمان «جیهانی سلاڤی» نەبوون وەکو ڕووسەکان؟ من ڕوونم کردەوە، کە لە گەل ئەوەشدا یەکەیەکی زمانی نەتەوە سلاڤییەکان لە ئارادایە، بەلام نەک کەلتورێکی سلاڤی، نەک جیهانێکی سلاڤی: مێژووی چیکەکان هەروەکو مێژووی پۆلۆنییەکان، سلۆڤاکەکان، کرواتەکان یان سلۆڤێنەکان (بێگومان هەنگارییەکانیش، کە هەر سلاڤی نین) ڕۆژئاواییەکی ڕووتە: گۆتیک، ڕێنێسانس، بارۆک؛ پێوەندییەکی توندوتۆل لە گەل جیهانی جێرمانیدا؛ تێکۆشانی کاتۆلیزم و چاکسازیی. چ پەیوەندییەکیان بە ڕووسیاوە نەبوو، کە زۆر دوور بوو، هەروەکو جیهانێکی تر بوو. تەنیا پۆلۆنییەکان لە دراوسێییەکی ڕاستەوخۆدا دەژیان، بەلام بە شەڕی مان و نەمان دەچوو.

ماندووییەکی بێ ئاکام. بیرۆکەی «جیهانێکی سلاڤی» هیچوپووچییەکی لە بننەهاتووی مێژووگەرایی ئەم جیهانە دەمێنێتەوە. من مێژووی گشتی چاپی حەوتەوانە هەلدەدەمەوە: لە بەشی جیهانی سلاڤیدا یان هوس، ئایینزانی گەورەی چیکی داماوانە لە ویکلیفی ئینگلیز (کە قوتابی وی بوو) جیا دەکرێتەوە، هەروەکو چۆن لە لوتەری ئەلمانی (کە لەودا دەستپێشکەر و مامۆستای دەبینی) جیا دەکرێتەوە و ناچارە، پاش سووتاندنی لە کۆنستانس تەحەمولی نەمرییەکی نەگبەت بە هاوەلی ئیڤانی دلڕەق بکات، کە لە گەلیدا ناتوانێ تەنیا وشەیەک قسە بکات.

هیچ بەلگەیەک لە ئەزموونی کەسانی قەناعەتپێکەرتر نییە: لە کۆتایی حەفتاکاندا دەستنووسی پێشەکی یەکێک لە ڕۆمانەکانم پێگەیشت، سلاڤیناسێکی بەناوبانگ نووسیبوی، کە هەمیشە بەراوردی (بێگومان مەراییکارانە، ئەو کاتە کەس خراپەی نەدەویستم) لە نیوان من و دۆستەیەڤسکی، گۆگۆل، بونین، پاستەرناک، ماندلستام و بەرهەلستکارە ڕووسییەکان دەکرد. بە ترسەوە ڕێم لە بلاوکردنەوەی




گرت. نەک لەبەر ئەوەی کینەیەکم بەرامبەر ئەم ڕووسە گەورانە هەبێ، بە پێچەوانەوە بە هەموویان سەرسام بووم، بەڵام لە مەشرەبی ئەواندا بوومە یەکێکی تر. هێشتا هەر ئەو دڵەخورپە سەیرەم بیر دەکەوێتەوە، کە ئەو دەقە بوو لە ناخمدا خوڵقاندی: خستنە ناو ناوکۆییەکەوە، کە هی من نەبوو، وەکو چۆن کۆچپێکردنن زۆرملێم ئەزموون کرد.

### چەقی ئەوروپا

لە نێوان ناوکۆیی گەورەی گەردوونی و ناوکۆیی بچووکی نەتەوەییدا مرۆڤ دەتوانێ وێنای پلەیەک بکا، با بڵێین ناوکۆیی ناوەڕاست. لە نێوان سوێد و جیهاندا ئەم پلەیە سکاندناڤیایە. بۆ کۆلۆمبیا ئەمریکای لاتینییە. ئەی بۆ هەنگاریا، بۆ پۆڵۆنیا؟ لە تاراوگەدا هەوڵم دا، وەڵامی ئەم پرسیارە دابڕێژم و ناونیشانی ئەو کاتەی یەکێک لە دەقەکانم بۆ گۆڤارەکان پوختەی دەکاتەوە: ڕۆژئاوایەکی ڕفێنرا و یان تراژیدیای چەقی ئەوروپا.

چەقی ئەوروپا. ئەمە لە ڕاستیدا چییە؟ کۆی ئەو نەتەوە بچووکانەی، کە لە نێوان دوو هێزدا، ڕووسیا و ئەڵمانیادان. پالێمی ڕۆژهەڵاتی ڕۆژئاوا. باشە، بەڵام ئەم نەتەوانە کام نەتەوانەن؟ سێ دەوڵەتەکەی بالتیک سەر بەوانن؟ ئەی ڕۆمانیا، لە کلیسەی ئۆرتۆدۆکسییەوە بەرەو ڕۆژهەڵات، لە زمانە ڕۆمانییەکەیەوە بەرەو ڕۆژئاوا کشاوە؟ ئەی نەمسا، کە ماوەیەکی زۆر چەقی سیاسی هەمووی پێکهێناوە؟ نووسەرە نەمساوییەکان تەنیا لە ناوکۆیی ئەڵمانیدا لێیان دەکۆڵرێتەوە و دڵیان خۆش نابێ (منیش بووام لە جیاتی ئەوان دڵم خۆش نەدەبوو)، ببینن بخرێنە ناو ئەو پشێوییە فرەزمانییەوە، کە چەقی ئەوروپایە. ئایا هەموو ئەم نەتەوانە ئەو ویستە ڕوون و هەمیشەییەیان

بەیان کردووە، گشتێکی هاوبەش پێک بهێنن؟ بە هیچ جۆرێک. بە درێژایی چەند سەدەیەک بەشێکی گەورەیان سەر بە دەوڵەتێکی گەورە بوون، ئیمپراتۆریەتی قەیسەری هابسبورگەکان، کە لە دواییدا دیانویست تەنیا لێی هەڵبێن.

هەموو ئەم سەرنجانە مەودای چەمکی چەقی ئەوروپا ڕێژەیی دەکەن، کاراکتەرە نادیار و نزیکییەکەی دەسەلمێنن، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕوونی دەکەنەوە. ئایا ئەوە ڕاستە، کە هەرگیز ناتوانرێ سنوورەکانی چەقی ئەوروپا بۆ هەمیشە و تەواو بکێشرێن؟ بێ گومان! ئەم نەتەوانە هەرگیز سەروەری چارەنووس یان سنوورەکانی خۆیان نەبوونە. کەمجار سوبژێکت بوونە، نزیکەی هەمیشە بابەتی مێژوو بوونە. یەکێتییان بە مەبەست نەبوو. لە بەر ویستی خۆیان یان سۆزیان بۆ یەکتر یان خزمایەتی زمانەکانیانەوە لە یەکتر نزیک نەبوون، بەڵکو لە بەر ئەزموونی هاوشێوە بووە، لە بەر بارودۆخی مێژوویی هاوبەش بووە، کە لە کاتی جیاوازدا لە پێکهاتەی جیاواز و لە ناو سنووری ناجێگیر و هەمیشە نایەکجارەکیدا کۆی کردوونەتەوە.

چەقی ئەوروپا بۆ «ئەوروپای ناوەند» (من هەرگیز ئەو چەمکەم بەکارنەهێناوە) سنووردار ناکرێ، وەکو ئەو کەسانە بە خۆشحاڵییەوە ناوزەدی دەکەن، کە تەنیا لە پەنجەرەی ڤێناوە دەیناسن؛ چەقی ئەوروپا فرە چەقە و لە وارشۆوە، لە بۆدابێستەوە یان زەگرییەوە لە تێشکێکی تردا دەردەکەوێ. بەڵام گرنگ نییە لە چ گۆشەنیگایەکەوە لێی دەنوانرێ، هەمیشە مێژوویەکی هاوبەش دەدرەوشێتەوە؛ لە پەنجەرەی چیکەوە یەکەم زانکۆی سێنترالی ئەوروپا لە سەدەی چواردەدا لە پراگ دەبینم؛ لە سەدەی پازدەدا شۆڕشی هوسی دەبینم، کە چاککاریی بەیان دەکەن؛ لە سەدەی شازدەدا ئیمراتۆریەتی قەیسەری هابسبورگەکان دەبینم کە بە کاوەخۆ لە بۆهیمیا، هەنگاریا، نەمساوە دادەمەزرێ؛ جەنگەکان دەبینم، کە دوو سەدە بەرگریی لە ڕۆژئاوا دەکەن دژی پەلاماری تورک؛ من بزوتنەوەی پەرچەچاکسازیی دەبینم بە گەشانەوەی هونەری بارۆکەوە، کە مۆرکی یەکێتییەکی بیناسازیی بە سەر سەرجەمی دەڤەرە گەورەکەدا هەتا وڵاتەکانی بالتیک دەسەپێنێ.

لە سەدەی نۆزدەدا نیشتمانپەروەریی هەموو ئەم گەلانە ڕچەی شکان، کە ڕەتیان کردەوە، خۆیان بگونجێنن، واتە خۆیان بکەنە ئەڵمان. تەنانەت نەمساوییەکانیش لە گەڵ پێگەی زاڵیاندا لە قەڵەمڕەوی قەیسەردا خۆیان لە هەڵبژاردن لە نێوان شوناسنامەی نەمساوی و سەر بە قەوارەی گەورەی ئەڵمانی بووندا، کە گوایە خۆیانیان تێیدا تواندووەتەوە نەیانتوانی خۆیان بدزنەوە. ئەی



مرۆڤ چۆن دەتوانێ ئەو زایۆنیزمە لە بیر بکات، کە ئەویش لە چەقی ئەورپا سەری هەڵدابوو، لە هەمان ئەو ویستەوە خۆ نەگونجێنن، هەمان ویستی جووەکان، وەکو نەتەوە، لە گەڵ زمانی خۆیاندا بژین! یەکێک لە گرفتە بنەماییەکانی ئەوروپا، گرفتی نەتەوە بچووکەکان، لە هیچ شوێنێک هێندە ئاشکرا، ئاوها چڕ و نموونەیی خۆی بەیان نەکرد. لە سەدەی بیستەمدا پاش جەنگی یەکەمی جیهانی چەندان دەوڵەتی سەربەخۆ لە وێرانییەکانی قەڵەمڕەوی هابسبوگەوە سەریانهەڵدا و هەموو جگە لە نەمسا سی ساڵ دواتر لە ژێر دەستەڵاتی رووسیادا بوون: ئەمە بارودۆخێک بوو کە لە مێژووی سەرجەمی چەقی ئەوروپادا هەرگیز رووی نەدابوو! قۆناغێکی درێژی بەرخۆدانی دژەسۆڤیەتی بە دوادا هات، لە پۆڵۆنیا، بە خوێنڕشتنێکی زۆرەوە لە هەنگاریا، ئەمجا لە چیکوسلۆڤاکیا و دیسان، دوورودرێژ و بەهێز، لە پۆڵۆنیا؛ من هیچ شتێکی لەوە سەرسامکەرتر لە ئەورووپای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا نابینم، وەکو ئەو زنجیرە زێڕینەی شۆڕش، کە لە ڕەوتی چل ساڵی قەڵەمڕەوی ڕۆژهەڵاتی بنکەن کرد، وای لێکرد حوکم نەکرێ و زەنگی کۆتایی دەستەڵاتی خۆی لێدا.

**ڕێگا پێچەوانەکانی شۆڕشی مۆدەرنیستی**

من لەو بڕوایەدا نیم، مرۆڤ مێژووی چەقی ئەوروپا وەکو ڕشتەیەکی تایبەت لە زانکۆکان بڵێتەوە. لە هۆڵی نووستنی ئەو دنیادا یان هوس هەمان بۆنی ئارەقەی سلاڤی هەڵمژێ وەکو ئیڤانی سامناک. ئایا من خۆم ئەم چەمکەم جارێک لە جاران بەو جەغدەوە بەکار دەهێنا، ئەگەر بەو جۆرە بە چارەنووسی دراماتیکی نیشتمانەکەمەوە پەرێشان نەبوومایە؟ بێگومان نەء. لە تەمتوماندا وشەگەلی خەواڵوو هەن، کە لە چرکەساتی پێویستدا خێرا فریامان دەکەون. تەنیا لە ڕێی پێناسەکەیەوە بەرنامەڕێژیی چەقی ئەوروپا درۆی یاڵتای سپی کردەوە، ئەم سەودا و مامەڵەیەی ئەم سێ براوەیەی جەنگ، کە سنووری هەزار ساڵەی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایان چەند سەد کیلۆمەتر بەرەو ڕۆژئاوا گواستەوە.

چەمکی چەقی ئەورپا جارێکی تر بە فریام کەوت، لە بەر هۆکارێکی، کە هیچ پەیوەندییان بە سیاسەتەوە نەبوو. ئەمە ڕووی دا، کاتێک من دەستم بەوە کرد بەو حەقیقەتە سەرم سووڕ بمێنێ، کە وشەگەلی «ڕۆمان»، «هونەری مۆدێرن»، «ڕۆمانی مۆدێرن» بۆ من مانایەکی تریان هەبوو وەکو لە هاوڕێ فەرەنسییەکانم. ئەمە جیاوازیی بیروڕا نەبوو، ئەمە زۆر خاکەرا بۆدەرکەوتنی جیاوازییەک بوو لە نێوان دوو نەریتدا، کە ئێمەیان خەملاندبوو. لە ڕوانگەیەکی کورتی مێژووییدا دوو کەلتورەکەمان وەکو دوو پێچەوانەی هاوتەریب لە بەردەممدا قووت بوونەوە. لە فەرەنسا: کلاسیکی، ئاوەزگەرایی، عەقڵی ئازاد، ئەمجا لە سەدەی نۆزدەدا قۆناغی ڕۆمانی گەورە. لە چەقی ئەوروپا: دەستەڵاتی بارۆکێکی بە تایبەت جەزبەگەرا، ئەمجا لە سەدەی نۆزدەدا ئیدیلەی ئاکارگەری بیدەرمایەر، هونەری مەزنی شیعری ڕۆمانتیکی و چەند ڕۆمانێکی گەورەی کەم. وزەی بێهاوتای چەقی ئەوروپا لە مۆسیقاکەیدا بوو، کە لە هایدنەوە هەتا شوێنبێرگ، لە لیستەوە هەتا بارتۆک دوو سەدە سەرجەمی ئاراستە جەوهەرییەکانی مۆسیقای ئەورووپی لە خۆی گرتبوو؛ چەقی ئەوروپا لە ژێر ناوبانگی مۆسیقاکەیدا چەمایەوە.

«هونەری مۆدێرن» لە بەر ئەو لێزمەبارانە سەرسووڕهێنەرەی یەک لە سەر سێی سەدەی

بیستەمدا چی بوو؟ شۆڕشێکی توندڕەو دژی ئیستاتیکای ڕابردوو؛ بێگومان ئەمە ڕوونە، بەڵام ڕابردووەکان هاوشێوە نەبوون. دژە ئاوەزگەرایی، دژە کلاسیکی، دژە واقیعی، دژی سروشتگەرایی، هونەری مۆدێرن لە فەرەنسا یاخیبوونی شیعریی گەورەی بۆدلێر و ڕامبۆ درێژە پێدەدا. گوزارشتی تازیاری (امتیاز) لە تابلۆکێشیی و پێش هەموو شتێک شیعردا دۆزییەوە، کە هونەری هەڵبژاردەی بوو. بە پێچەوانەوە ڕۆمان (بە تایبەتی لایەن سوریالیستەکانەوە) نەفرەتی لێکرا؛ وەکو بەسەرچوو، وەکو بۆ هەمیشە لە شێوازێکی تەقلیدیدا قەتیس سەیری کرا. لە چەقی ئەوروپادا بارودۆخەکە بە جۆرێکی تر بوو؛ بەرهەڵستیی دژی نەریتی جەزبەگەر، ڕۆمانتیکی، مۆسیقایی مۆدێرنیزمی چەند بلیمەتێکی -ڕەسەنترینیان- بەرەو ئەو هونەرە برد، کە مەودای تازیاری ڕاڤە و ڕەوانی و تەوسە: واتە ڕۆمان.

## هەسارە گەورەکەی من

لە پیاوە بێخەسڵەتەکە (١٩٣٠-١٩٤١)ی ڕۆبێرت موزیلدا کلاریسە و ڤاڵتەر وەکو «دوو شەمەندەفەری کە بە تەنیشت یەکەوە بن دەردەپەڕن» بە چوار دەست هێندە توندوتۆڵ پیانۆ لێدەدەن، «کە قاچە باریکەکانی مۆبیلەکان کەوتبوونە سەما ... تێکەڵبوون بوو، هاوشێوەی ناو زراوچوونێکی گەورە، سەدان مرۆڤ، کە لە هەموو شتێکدا جیاوازن، هەمان بزوتنەوەی سەوڵلێدانی هەڵاتن بەجێدەهێنن، هەمان هاواری بێمانا دەکەن، بە هەمان شێوە دەم و چاو بەیەکدا دەدەن ... بە قیتی و دڵخۆش لە سەر کورسییە بچووکەکانیان دانیشتبوون، لە هیچ و لە هیچدا و لە بارەی هیچەوە تووڕە نەبوون یان لە هەموو کەسێک، لە ناو یان لە بارەی هەموو شتێکەوە تووڕە، عاشق و غەمگین بوون...» تەنیا «فەرمانی مۆسیقا ئاوێتەی کردبوون ...» «ئەم جۆشە شەپۆلدەرانە و بزوتنەوە سۆزئاساکانی ناخیان، واتە ژێرەوەی ڕوحی هەژاوی هەورئاسای جەستەیان بەو زمانە سانا جاویدانە دەزانی، کە هەموو مرۆڤەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە.»

ئەم نیگا تەوساوییە تەنیا مۆسیقای نەکردووەتە ئامانج، قووڵتر دەڕوا، بۆ خوارەوە هەتا جەوهەری شیعریی مۆسیقا، بۆ ئەو ئەفسوونەی، کە ئاهەنگ بە هەمان شێوە کوشتوبڕ دەڕازێنێتەوە و تاکەکان دەکاتە مێگەلی شاگەشکە؛ بەم تووڕەییە دژە شیعرییەتەوە موزیل فرانتس کافکام بیر دەخاتەوە، کە لە ڕۆمانەکانیدا قێز لە هەموو هەستجووڵانێک دەکاتەوە (ئەمە ڕادیکالانە لە تەعبیرییە ئەڵمانەکانی جیا دەکاتەوە) بە ئەمەریکا، وەکو خۆی دەڵێ، دژی «ڕەفتاری لە هەست و سۆزدا نغرۆ» دەنووسێ؛ کافکا بەمە هێرمان برۆخم بیر دەخاتەوە، کە ئەو بە تەواوی «دژی ڕۆحی ئۆپرا» هەستەوەر بوو، بە تایبەتی دژی ئۆپرای ڤاگنەر (ئەو ڤاگنەرەی، کە بۆدلێر و پرۆست دەیانپەرست)، کە ئەو بە نموونەی کیچی دەزانێ (وەکو ئەو دەڵێ، «کیچێکی بلیمەتانە»)؛ ئەمەی برۆخیش ڤیتۆلد گۆمبرۆڤیچم بیر دەخاتەوە، کە لە دەقە بەناوبانگەکەیدا دژی شاعیران کە پەرچەکردار لە بارەی ڕۆمانسییەتی لە بنەهاتووی ئەدەبی پۆڵۆنی و هونەری شیعر وەکو ژنەخواوەندی پیرۆزی مۆدێرنیزمی ڕۆژئاوا دەنوێنێ.

کافکا، موزیل، برۆخ، گۆمبرۆڤیچ ... گروهێک، قوتابخانەیەک، بزوتنەوەکیان پێکدەهێنا؟ نەخێر تاکڕەو بوون. زۆر جار وەکو «هەسارەی ڕۆماننووسە گەورەکانی چەقی ئەوروپای ناوەڕاست» ناوزەدم کردوون، بە ڕاستیش وەکو ئەستێرەیەکی کۆمەڵە

ئەستێرەیەک بوون، هەریەکێکیان بە بەتاڵیی دەورە دراو، هەر یەکە و لەوی ترەوە دوور. لەوە سەرنجڕاکێشتر ئەوەم بۆ دەردەکەوت، کە کارەکانیان ئاڕاستەیەکی ئسیتاتیکی هاوشێوە گوزارشت لێدەکەن: هەموویان شاعیرانی ڕۆمان بوون، واتە: سەرسام بە شێوە و تازەکردنەوەی؛ بەهایان بۆ چڕیی هەموو وشەیەک، هەموو ڕستەیەک دادەنا؛ ئەو فەنتازیایە فریوی دابوون، کە هەوڵی بەزاندنی سنووری «ڕیالیزم» دەدا؛ بەڵام لە هەمان کاتدا ڕێگا بە هیچ لەخشتەبردنێکی شیعریی نادات: دوژمنی کردنی ڕۆمانە بە دانپێدانانی کەسانی؛ بە هەموو ڕازاندنەوەیەکی پەخشان هەستەوەرە؛ سەرومڕ خۆی بۆ جیهانی واقیع چڕ کردووەتەوە. هەموویان لە ڕۆمان وەکو شیعرێکی گەورەی دژە شیعرییەت تێگەیشتبوون.

## کیچ و بازاڕێتی

وشەی «کیچ» لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا لە میونیخ لە دایکبوو و پاشماوەی شیلەئاسای سەدەی گەورەی ڕۆمانتیکی ناوزەد دەکا. بەڵام لەوانەیە هێرمان بڕۆخ لە ڕاستییەوە نزیکتر بووبێتەوە، کاتێ پێوەندی ڕۆمانتیکی بە کیچەوە لە ڕێژەیەکی چەندێتی پێچەوانەدا بینی: بە ڕای وی شێوازی زاڵی سەدەی نۆزدە (لە ئەڵمانیا و چەقی ناوەڕاست)، کیچ بوو، وەکو دیاردەیەکی ناوازە، چەند کارێکی گەورەی ڕۆمانتیکیی تیایاندا دەرکەوتن. هەر کەسێک زەبروزەنگی کیچ (زوڵموزۆری گۆرانیبێژەکانی ئۆپرا)ی ناسیبێ هەست بە هەڵچوونێکی تایبەت دەکا دژی ئەو پەردە پەمەییەی بە سەر واقیعدا دراوە، دژی نمایشی شەرمنی دڵی هەمیشە شکاو، دژی «نانی بۆنخۆشکراو» (موزیل)؛ کیچ لە مێژەوە بووەتە بەرنامەڕێژییەکی زۆر تەواو لە چەقی ئەوروپا، لەو شوێنەدا کە وەکو خراپترین ناپەسەندیی ئیستاتیکی سەیری دەکرێ.

من گومان ناخەمە سەر مۆدەرنیستە فەرەنسییەکان، کە ملیان بۆ شادی هەست و کەشوفش داوە، بەڵام لە بەر نەبوونی ئەزموونێکی درێژ لەگەڵ کیچدا حەزنەکردنی حەساس نەیتوانی لە لایان سەرهەڵبدا





کامۆ

و گەشە بکا. لە ساڵی ١٩٦٠دا، واتە سەد ساڵ دوای سەرهەڵدانی لە ئەڵمانیا، ئەم وشەیە بۆ یەکەمجار لە فەرەنسا بەکار هێنرا؛ لە ساڵی ١٩٦٦دا وەرگێڕی فەرەنسی وتارەکانی برۆخ و ئەمجا ١٩٧٤ وەرگێڕی دەقەکانی هانا ئارێنت خۆیان ناچار دەبینن، وشەی «کیچ» بە «هونەری شڕە» وەربگێڕن و بەمەش بیرکردنەوەکانی دانەرەکانیان پەی پێنەبراو دەکەن.

جارێکی تر لوسیەن لۆیەنی ستێندال دەخوێنمەوە، گفتوگۆی ڕێکوپێک لە هۆڵەکەدا؛ من لە لای وشە سەرەکییەکان دەمێنمەوە، کە ڕەفتارە جیاوازەکانی بەشدارەکان پیشاندەدا: لووتبەرزیی؛ بازاڕیی؛ زرنگی («ئەو زاخەی هەموو شتێکی دەتوێنێتەوە»)؛ مایەی پێکەنین، نەزاکەت («نەزاکەتی بێکۆتایی و بێهەستیی»)؛ ڕەوشتجوانیی. من لە خۆم دەپرسم: چی وشەیەک بۆ من گوزارشت لە بەرزترین پەسەندنەکردنی ئیستاتیکی دەکا وەکو چەمکی کیچ؟ لە دواییدا دەیدۆزمەوە؛ ئەوە وشەی «بازاڕیی»، «بازاڕیبوون»ە، «مسیۆ دو پۆیریر مرۆڤێکی ناوازە بازاڕیی بوو، کە بەوە دەچوو بە ڕەفتارە نزم و نهێنییەکانی سەربەرز بێ، وەکو چۆن بەراز لە قوڕاودا خۆی دەگەوزێنێتەوە بۆ چاودێریکەر بە ئۆخژنێکی بێشەرمانەوە ...»

ڕق لە بازاڕیی بوونەوە ئەو کاتە وەکو ئێستا لە کۆمەڵگەکاندا ڕووی دەدا. با وشەناسیی بیری خۆمان بهێنینەوە: بازاڕیی (ڤولگێر) لە ڤولگوسەوە هاتووە، واتە گەل، ڤولگێر ئەو شتەیە، کە بە دڵی گەلە؛ دیموکراتێک، سۆسیالیستێک، خەباتگێڕێک بۆ مافی مرۆڤ دەبێ گەلی خۆش بوێ؛ بەڵام ئازادە لەوەی، ڕقی لە هەموو ئەو شتانە ببێتەوە کە لە سەرەوە بۆ خوارەوە بە بازاڕییان دەزانێ.

پاش نەفرەت و کردنە دەرەوەی سیاسییانەی سارتەر، دوای خەڵاتی نۆبڵ، کە ڕق و ئیرەیی بۆ هێنا، ئەلبێر کاموی لە ناو ڕۆشبیرە پاریسییەکاندا زۆر هەستی بە ناڕەحەتی دەکرد. بۆم دەگێڕنەوە، ئەوەی جگە لە گومانی بازاڕیی بوون زیانی لێی دا گوایە ئەوە بووە: بە ڕەچەڵەک لە دەوروبەرێکی زۆر هەژارارەوە هاتووە، دایکی کە نەیزانیوە بنووسێ و بخوێنێتەوە؛ پێگەی وەکو فەرەنسی- جەزائیری کە لەگەڵ فەرەنسی- جەزائیرییەکانی تردا هاوسۆز

بووە، تەنیا جوتیار بوونە بە «ڕەفتاری هێندە نهێنی» (واتە «نـرم»)ەوە؛ سادەیی فەلسەفی وتارەکانی؛ منیش واز لەم بابەتە دەهێنم. ئەو وتارانە دەخوێنمەوە، کە پێیانەوە ئەم کوشتنە ڕووی دا و بەم وشانەوە دەبەستریمەوە: کاموی «جوتیارێکە لە جلوبەرگی بۆنەدا، ... پیاوێکە لە ناو گەلەوە هاتووە، دەستکێشەکانی بە دەستەوەیە، شەپقەکەی هێشتا بە سەرەوەیە، بۆ یەکەمجار دێتە ناو سالۆنەکەوە. میوانەکانی تر ئاوڕ دەدەنەوە، دەزانن سەروبەندیان لەگەڵ کێدا هەیە.» مەجازەکە خۆی دێتە زمان: کاموی نەک هەر نەیدەزانی، مرۆڤ چۆن بیر دەکاتەوە (بڕوای بە پێشکەوتن نەبوو و هاوسۆزیی لە گەڵ فەرەنسییە -جەزایرییەکاندا دەکرد)، بەڵکو، لەوەش خراپتر، نەشیدەزانی لە سالۆنێکدا ڕەفتار بکا (بە مانای وشە یان بە مەجان)؛ ئەو بازاڕیی بوو.
پەسەندنەکردنێکی ئیستاتیکی توندتر لە فەرەنسادا نییە. هەندێ جار ناپەسنەکردنێکی ڕەوا، وەلێ ڕەنگ بێ باشترین کەسیش بپێکێ: ڕابلی. ئەی فلوبێر. باربەی دئۆرڤیل نووسیویەتی، «خەسڵەتی سەرەکی پەروەردەکردنی هەستەکان: بە پلەی یەکەم بازاڕاتییەتی. بە ڕای ئێمە ڕۆحی بازاڕیی، ئەقڵی بازاڕیی، شتی بازاڕیی لە دنیادا زۆرن، بە بێ ئەوەی پێویست بکات کە ژمارەی ئێجگار زۆری ئەم بازارێتییە قێزەونە گەورەتر بکرێ.»
یەکەم هەفتەکانی کۆچکرنم بیر دەکەوێتەوە. پاش ئـەوەی ستالینیزم بە یەکدەنگ ئیدانە کرابوو، هەموو توانییان لەو تراژیدیایە تێبگەن، داگیرکاریی ڕووسی بۆ وڵاتەکەم چێ دەگەیاند و دەیانبینم بە خەرمانەیەکی غەمگینی سەنگین دەورە دراوم. لە بیرمە، لە باڕێکی پاریسدا بەرامبەر ڕۆشبیریک دانیشتبووم، کە زۆر پشتگیریی کردبووم و زۆر یارمەتی دابووم. یەکەم دیدەنیمان بوو لە پاریس و وشەگەلی گەورەم لە هەوادا دەبینی بە بە سەر سەرمانەوە دەفڕین: ڕاونـان، گـولاگ، ئازادیی، دوورخستنەوە لە وڵات، بوێریی، بەرهەڵستی، تۆتالیتاریزم، تیرۆری پۆلیس. بۆ ئەوەی کیچی ئـەم تارماییە ئاسوودانە بڕەوێنمەوە، دەستم بە ڕوونکردنەوە کرد، کە ئەو ڕاستییەی، لە ژێر چاودێریدا بی، مایکرۆفۆنی پۆلیس لە ماڵەکەتدا بێ، هونەری پڕ لەزەتی چەواشەکردنی فێر کردووین. من و یەکێک لە هاوڕێکانم ناو و خانوەکانمان گۆڕییەوە؛ ئەو، مێبازێکی گەورە، بە بێپەرواییەکی مەزنەوە لە هەمبەر مایکرۆفۆنەکان لە ئەپارتمانەکەمدا شاکارە سەرنجڕاکێشەکانی بە جێدەهێنا. لە بەر ئـەوەی سەختترین چرکەساتی چیرۆکی ئەڤین جودابوونەوەیە، کۆچکردنم بۆ ئەو زۆر گونجاو بـوو. ڕۆژێـک ژنـە گەنجەکان و ژنـە پیرەکانی ئەپارتێمێنەکەمیان بە داخراوی، بە بێ ناوی من دۆزیبووەوە، لە کاتێکدا من لەپاریسەوە خەریکی ئەوە بووم، کارتی ماڵئاوایی بە ئیمزای خۆمەوە بۆ حەوت ژن بنێرم، کە هەرگیز نەمبینبوون.
دەمویست ئەو پیاوەی ڕێزی لە لام هەبوو دڵخۆش بکەم، بەڵام ڕوخساری هەمیشە تاریکتر دەبوو و لە دواییدا بە دەنگی وەکو تەوری ئامێری سەرپەڕاندنەوە وتی: «من ئەمە بە کۆمیدی نازانم.»
هاوڕێ ماینەوە، بە بێ ئەوەی هەرگیز حەزمان لە یەکتر بێت. بیرەوەری یەکەم دیدارمان بۆ من کلیلێک، بۆ ئەوەی لە جیاوازییە درێژە، هەرگیز ددان پیدانەنراوەکەمان تێبگەین: بەیەکدادانی دوو هەڵوێستی ئیستاتیکی لە یەکترمان جودا دەکاتەوە: پیاوە بە کیچ حەساسەکە ئەو پیاوەی بینی، کە

حەساسیەتی بە بازاڕێتی هەبوو.

## مۆدێرنیزمی دژە مۆدێرنە

ئارتور ڕامبۆ نووسی: «مرۆڤ دەبێ ڕەها مۆدێرن بێ». نزیکەی شەست ساڵ دواتر گۆمرۆڤیچ دڵنیا نەبوو، ئایا بە ڕاستی مرۆڤ دەبێ مۆدێرن بێ. لە فێردیدەرکدا (١٩٣٨ لە پۆڵۆنیا بڵاو بووەوە) کچەکە جڵەوگیریی خێزانی یونگمان دەکا، «کچەخوێندکارێکی مۆدێرن». شێت و شەیدای تەلەفۆنکردنە و ڕقی لە کلاسیکییەکان دەبێتەوە؛ بە ئامادەیی بەرێزێک، کە بۆ سەردان هاتووە، «تەنیا خۆی بەوەوە خەریک دەکا، لێی بڕوانێ و لە کاتێکدا دەرنەفیزێک لە نێوان ددانەکانیدا توند دەکا، کە بە دەستی ڕاستییەوە گرتبوو، بێ کەشوفش بە دەستی چەپ تەوقە لە گەڵ پیاوەکە دەکا».

دایکیشی مۆدێرنە؛ ئەندامی «کۆمیتەی پاراستنی منداڵی کۆرپە»یە؛ دژی سزای کوشتن و بۆ ئازادیی ڕەوشت و خوو تێدەکۆشێ»، «خاکییانە بە خۆبادان دەچێ بۆ ئاودەست»، بۆ ئەوەی «بەفیزتر لەوەی کاتێ چووە ژوورەوە» جارێکی تر بێتە دەرەوە؛ لە گەڵ پیربوونیدا مۆدێرنێتی دەبێتە تاقە «جێگرەوەی گەنجایەتی» کە بۆ ئەو زۆر پێویستە.

ئەی باوکەکە؟ ئەویش مۆدێرنە؛ هیچ بیر ناکاتەوە، بەڵام هەموو شتێک دەکا، بۆ ئەوەی بە دڵی کچەکەی و ژنەکەی بێ.

گۆمبرۆڤیچ لە فێردیدەرکدا ئەو وەرچەرخانە بنەماییەی داڕشت، کە لە ڕەوتی سەدەی بیستەمدا هاتە ئاراوە: هەتا ئەو کاتە مرۆڤ دابەش بووبووە سەر ئەوانەی، کە بەرگرییان لە بارودۆخی سەروەر دەکرد و ئەوانەی دەیانویست بیگۆڕن. واتە خێراکردنی مێژوو ئەنجامی خۆی هەبوو: لە کاتێکدا پێشووتر مرۆڤ لە هەمان ئەو شوێنەی کۆمەڵگەدا دەژیا، کە زۆر لەسەرخۆ دەگۆڕا، ئێستا ئەو چرکەساتە هاتووە، لە پڕ هەستی بەوە کرد، چۆن مێژوو وەکو چەرخە لە ژێر پێیدا دەخوولایەوە: باری ئێستا لە جووڵانەوەدا بوو! لە پڕ ڕازیبوون بە باری ئێستا هەمان ڕازیبوونی بەو مێژووە دەگەیاند کە لەگەڵ خۆیدا دەسووڕێتەوە! بە هەر حاڵ مرۆڤ دەیتوانی لە هەمان کاتدا پێشکەوتنخواز و نەریتگەر، گوێڕایەڵ و یاخی بێ!

لە لایەن سارتەر و هەوادارەکانییەوە کاموی وەکو کۆنەخواز هێرشی کرایە سەر، کاموی ئەو وەڵامە بەناوبانگەی لە بارەی ئەوانەوە دایەوە، کە «کورسییەکانیان بە ئاڕاستەی مێژوو داناوە»؛ کاموی ڕاستی دەکرد، تەنیا بۆی روون نەبوو، کە ئەو کورسییە بە نرخە چەرخەی هەیە و ماوەیەک بوو هەموو بەرەو پێشەوە پاڵیان پێوە دەنا، خوێندکارە مۆدێرنەکان، دایکەکانیان، باوکەکانیان، بە هەمان شێوە وەکو هەموو ئەندامەکانی کۆمیتەکانی پاراستنی کۆرپەکان و بێگومان هەموو ئەو سیاسییانەی، کە، لە کاتێکدا پاڵیان بە کورسییەکانەوە دەنا، ڕووی ڕوخساری بەخەندەیان کردە خەڵکی، ئەو خەڵکەی بە دوایاندا دەڕۆیشتن و پێشدەکەنین، چونکە باش دەیانزانی، تەنیا ئەو کەسەی پێخۆشحاڵ دەبێ مۆدێرن بێ، بە ڕاستی و لە ڕاستیدا مۆدێرنە.

بۆ بەشێکی دیاریکراوی میراتگرانی ڕامبۆ سامناکییەک ڕوون بووەوە: ئەمڕۆ تاقە مۆدێرنیزمێک، کە شایستەی ئەم ناوە بێ، مۆدێرنیزمی دژی مۆدێرنەیە.

# گۆڕانکاری لەمافی مرۆڤدا لەڕوانگەی فمینیستیەوە

نوسینی: شارلۆت بەنچ
و. لە فارسییەوە: عەزیز مورادی

لە ڕوانگەی فمینیستی، گۆڕانکارییەکان لە مافی مرۆڤ بۆ وڵامدانەوە بە تەنگژە گشتگیرەکانی مافی باسکراو لە چەرخی بیست و یەکەم گرنگی تایبەت بەخۆی هەیە. وەها کارێک دەبێ لە چەمکی گەشەکردن و گۆڕانکاری بزوتنەوە جیهانیەکانی ژنان لە دوو دەیەی ڕابردوو تاوتووێ بکرێت. ژنان لە دووبارە ماناکردنەوەی پرسەکانی تایبەت بە چەمکی کۆمەڵایەتی و ڕێبازە جیهانگیرەکانی وەک گەشەپێدان، دیموکراسی، مافی مرۆڤ، ئاسایشی جیهانی و پاراستنی ژینگە، خەریکن دەسەڵات دەگرنەدەست. واتا سنووری بابەتەکە لەبارەی "پرسی ژنان" کە پرسێکی جیاواز لە پەراوێزی کۆمەڵگا بەبیردێنێتەوە، فراوانتر بووە. چۆن و بۆچی لەبارەی سەرەکیترین چەمکی زاڵ لەسەر سامانی کۆمەڵایەتی، ژنانی

**بۆ تێگەیشتن لە شکڵە جۆراوجۆرەکانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ کە لەسەر ژنان پەیڕەو دەکرێت، دەبێت لەگەڵ هۆکاری وەك نەتەوە و نەژاد و چینی کۆمەڵگا، هەڵسەنگاندن و شرۆڤە لەسەر ڕەگەزیشی بکرێت**

لەپەراوێزەوە هێناوەتە چەقی ڕووداوەکـان تا چەندایەتی و چۆنایەتی ژیانی خۆیان بۆ پێگەیەکی شیاوتر بەرز بکەنەوە.

ئەگەر گۆڕانکاری لە کاروباری وەک گەشەپێدان و مافی مرۆڤ بەشیوەیەکی باشتر کاریگەری لە سەر ژیانی ئافرەتان هەبێت، گەرەنتی ئەوەمان پێدەدات پرسی ژنان بەشتێکی جیا لە گەلاڵەڕێژییە جیهانیەکان نەزانین و پێمانوابێ ئەم پرسانە ڕەهەندێکە لەم گەلاڵەڕێژییانە کە بە بێخەبەری تێپەڕیوە. لە ڕاستیدا بێخەبەری لە ئەزمون و داواکاری ژنان، کە کۆمەڵگا بۆ چارەسەرکردنی کێشەگشتیەکان گەلێک پێویستی پێی هەیە، گەیشتن بە سەرکەوتنی سەختتر کردووە.

هەڵسەنگاندنی فمینیستی، لە دانپێنان بەم بابەتەوە دەستپێدەکات کە هەرکام لە ئێمە، ڕێکخراو و چەمکە کۆمەڵایەتیەکان بەدیدێکی جیاواز، کە لە پێگە و تێگەیشتوویی ئێمە لەم کۆمەڵگایە سەرچاوەی گرتوە، ببینین. بەڵام ئەگەر مافی مـرۆڤ لە سۆنگەی ئەزمونەکانی ژنێکەوە هەڵبسەنگێنین، ژمـارەیـەک پرسی تایبەت بەخۆیان دەردەخـەن: چ کەسگەلێک لە مافی هاووڵاتیبونیان بێبەش بوون؟ دیموکراسی لە شکڵی سنووردارکراوی چۆن کاریگەری لەسەر ژنان دانـاوە؟ واتای سەقەت لە دیموکراسی چ زیانێکی بۆ سەر ژیانی ژنان بووە؟ بۆچی لایەنە قێزەونەکانی ژیانی ژنان، جێی خۆی لە تێگەیشتنی ئێمە لە پرسەکانی مافی مرۆڤ نەکردۆتەوە؟

بـۆ تێگەیشتن لـە شکڵە جـۆراوجـۆرەکـانـی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ کە لەسەر ژنان پەیڕەو دەکرێت، دەبێت لەگەڵ هۆکاری وەک نەتەوە و نـەژاد و چینی کۆمەڵگا، هەڵسەنگاندن و شرۆڤە لەسەر ڕەگەزیشی بکرێت. ژنان دەیانەوێ

بزانن دەبێت چ جۆرە گۆڕانکارییەک لە بواری پەیوەندی خەڵک و سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان بێتە ئاراوە، تا نەک تەنیا دەنگی ئەوان بەڵکوو دەنگی سەرجەم کەسانێک کە لە مافی مرۆڤ و دیموکراسی و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی بێبەشن، ببیسترێ و ئاوڕی لێبدرێتەوە. ڕیزبەندیکردنی گرووپەکان ماناهەڵگرە و بێبەشیان دەکات لە مرۆڤایەتی تـەواو و ڕەهـا و جیاوازی نیە ئەم واتایە لەسەر پاساوی ڕەگەزی یان چینایەتی و یان خواستی جنسی و یان باوەڕی ئاینی و یان سەر بە چ نەتەوەیەکن. هەرچەشنە واتابەخشی بۆ ژمارەیەک مرۆڤی تایبەت کە بێبەشی بکات لە مافی تەواو و ڕەهای مرۆڤایەتی و هەلی تەواویان لە کاروباری کۆمەڵگادا بۆ نەڕەخسێت، دەبێتە بنەمایەک بۆ چاوپۆشیکردن لە توندوتیژی دژی ئەو گرووپە و تا شوێنێک بـەردەوام دەبێ کە تەنانەت حکوومەتەکانیش جاروبار پاڵپشتی ئەو توندوتیژییانە دەکەن. هەروەها ئەگەر بڕیاربێ گرووپێک لە خەڵک لە مافی خۆیان بێبەش بکرێن، هەڕەشەی پێشێلبوونی مافی مرۆڤ بۆ هەموان دێتەئاراوە.

## مافی ژن وەك مافی مرۆڤە

ئەم ڕاستیە کە مافی ژنان بەمافی مرۆڤ نازانن وەختێک خۆی دەرئەخات کە تەنها ژمارەیەکی کەم لە حکوومەتەکانی جیهان لە سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەکیەکانیاندا یەکسانی ژن و پیاوانیان وەک یەکێک لە بنەماکانی مافی مرۆڤ ڕەچاو کردوە. تەنانەت کاتێک دەگوترێ سیاسەتی بازرگانی لەگەڵ حکوومەتەکانی تر بە لەبەرچاوگرتنی دۆسیەی مافی مرۆڤی ئەو وڵاتە پەیڕەو دەکرێت، هیچ وڵاتێک پێشێلکردنی مافی ژنان لەلایان ئەو حکوومەتە ناکاتە پێوەری هەڵسەنگاندنی مافی مـرۆڤ بۆ ئـەو حکوومەتەی بازرگانی لەگەڵ دەکـات. لەنێو ڕێکخراوە ناحوکمیەکانی مافی مرۆڤیش، ئەولەوێتدان بە مافی ژنان شازە و ناوەڕۆکی خواستی تایبەتی بەخۆگرتوە لەحاڵێکدا کە پێشێلکردنی خاڵەکانیتری مافی مرۆڤ کە گرووپە سنووردارەکان دەگرێتەوە، بۆتە بابەتێکی ئاسایی (گشتی): واتا ناهاوسەنگی مافی ژنان لە گەڵ مافی مرۆڤ، هاووڵاتیبوونی پلە دووەمی بۆ ژنـان درێـژکـردۆتـەوە و پێویستیەکمان بۆ ئاشکرادەکات کە لە خەمەکانمان بۆ مافی ژنان دەبێ لەبەرچاو بگیردرێت.

مافی ژنان بە شێوازی جۆراوجۆر پێشێل دەکرێت. بێگومان جاروبار ستەمی سەر ژنان (بۆ نموونە لەکاتی سەرکوتکردنە سیاسیەکان) بەهەمان شێوازی سەرکوتکردنی پیاوانە. بەڵام چونکوو لە خەیاڵدانماندا وێنای زاڵ بۆ توخمی سەرکوتگەری سیاسی لەگەڵ نێرینەبوونی سەرکوتکەر نزیکی هەیە، کێشەی ژنان لە ژن بوونیانەوە ڕوودەدا. ئەو ژنانەی مافیان پێشێل دەکرێت (وەک زیندانیانی سیاسی و یان پەیوەندییان لەگەڵ ئەو گرووپانەی سەر بە گەلێکی تایبەتن) زۆرجار بەهۆی ژنبوونیان دەکەونە بەر دەستدرێژیی تر وەک دەستدرێژی سێکسی. بزوتنەوەی مافی ژنان سەرەتا خۆی بەو پێشێلکارییانە ماندوو دەکات کە هۆکارەکانی بۆ مێینەبوونی ژن دەگەڕێتەوە. هۆکارەکەی لەم ڕاستیەوە سەرچاوەدەگرێ کە پێشێلکردنی ئەم مافانە بەتەواوی دیار نیە بۆیە گەوەرترین کێشەکان دەخاتە بەردەم بزوتنەوەی ژنان.

جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤی نەتەوەیەکگرتوەکان کەلەساڵی ١٩٤٨ پەسەندکرا، واتایەکی گشتی بۆ مافی مـرۆڤ هەیە و مەبەستی پاراستنی مافی خەڵکە لە سەرانسەری جیهان. مادەی ٢ی جاڕنامە بەبێ ئەوە باسی مافی ژنان بکات تەئکیدی سەرەکی کردوەتە سەر ماف و ئازادییە باسکراوەکانی ناو جاڕنامەکە و باسی هیچ جۆرە جیاوازییەک بەتایبەت جیاوازی جنسی نەکردوە. بەتایبەت ئەگەر لە دیدی ژنانەوە سەیری ئەم جاڕنامەیە بکرێ، پێشێلکاری فـراوان لە مافی ژنان وەک دەستدرێژی و توندوتیژی و جوێندان لەنێو خاڵەکانی ئـەم جاڕنامەیە بە ئاسانی دەبینرێ. بەمجۆرەیە بۆ نموونە " ناتوانی کەس بخەیتە بەردەم ئەشکەنجە یان هەڵس و کەوتی زاڵمانە، نامرۆڤانە و یان سووکایەتی پێکردن". مەسەلەکە ئەمەیە لە کاروباری تایبەت بە ژنان، شرۆڤە و جێبەجێکردنی ئەم مافانە بە شێوەیەکی ئەوتۆ ڕەچـاو نەکراوە بۆیە هیچ ڕێکخراوێکی ناسراوی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤ نیە چاودێری جێبەجێکردن و ڕەچاوکردنی یاساکە بکات. چەمک و واتاکانی مافی مرۆڤ و شێوازەکانی جێبەجێبوونی لە جیهانی ئەمڕۆدا، لەگەڵ ئەو پێشێلکارییانە هاوڕێیە کە دانەرانی جاڕنامەکەی زیاتر لە هەمووان نیگەران کردوە. چونکوو ژنان لە دانیشتن و شرۆڤەکانی تایبەت بە مافی مرۆڤ نوێنەرایەتی تەواویان نەبووە، حەقی ژنانیش لەو پێناسانەدا کەوتۆتە ناو هەمان ئەو غەفڵەتەی کە بەرامبەر پیاوە پێست ڕەنگینەکانیش کراوە.

هەڵبەت لەبیرمان نەچێت مافی مرۆڤیش وەک دیموکراسی و ئایدیاڵەکانی تر، نە چەق دەبەستێ و نە دەکەوێتە ژێر ڕکێفی گرووپێکی تایبەت. ڕاستە ئەم چەمکانە لە چرکەساتێکی مێژوویی تایبەت سەریان هەڵداوە و لە سنووری خواستی ژمارەیەکی دیاریکراو لە مرۆڤەکان مانایان پێبەخشراوە، بەڵام بزاوتی دەرونی گونجاو لەم ڕاستیەوە سەرچاوە دەگـرێ کە ژمارەیەکی بـەرفـراوان لە خەڵکی حەزیان لێیە و بە تێپەربوونی زەمەن مانای " ماف" بەربڵاوتر دەبێ تابتوانن هیوا و خواستەکانی تێدا جێبکەنەوە. لە ماوەی چل ساڵی ڕابردوودا زۆرینەی ئافراندنەکانی بزوتنەوەی پاراستنی مافی مـرۆڤ مانای بەربڵاوتریان بەخۆوە گرتوە کە بتوانن لە کاروباری وەک جیاکردنەوەی ڕەگەزی، بێسەروشوێنکردنی مرۆڤەکان، مافی کۆمەڵایەتی و ئابووری و مافی هەموان بۆ پاراستنی ژینگە باس لە کێشەکانیان بکەن. بە هەمان شێوە ژنانیش بە جۆرێک چەمکی مافی مرۆڤیان گۆڕیوە کە بتوانن بەرەنگاری بکەن لە بەرامبەر سوکایەتیپێکردن و توندوتیژی کە زیانی هەیە بۆ مرۆڤایەتی و مافی ژیان و ئازادی و ئاسایش.

چونکوو پیاوانی خوێندەوار و خـاوەن مافی موڵکداری لە ڕۆژئاوا، واتا پێشەنگەکانی ئارمانی مافی مرۆڤ، زیاتر لە هەرشتێک ترسی ئەوەیان هەبوو مافی تاکەکەسی و سیاسیان لە بوارە گشتیەکاندا بکەوێتە بەر هەڕەشە، لە نووسینی جاڕنامەی مافی مرۆڤ ئەو خاڵانەیان لەبەرچاو گرت. بەڵام ئەو پیاوانە کە ئاغای ماڵی خۆیان بوون، هیچ هۆکارێکیان بۆ پێشێلکردنی مافی نێوماڵی خۆیان نەدەبینی. بێگومان مافی مەدەنی لە بوارە گشتیەکاندا لە سۆنگەی ژنانەوە گەلێک گرنگە چونکوو ئەوان لە بەهرەمەندی لە مافەکانی ناو کۆمەڵگا بە بـەراورد لەگەڵ پیاوان زیاتر تووشی تەنگژە دەبنەوە. لە دیدی ژنان و زۆرینەی

پیاوانیش ئەو کاروبارەی لەگەڵ پێشێلکردنی مافی مرۆڤ هاوڕێیە مانا و سنووری دیاریکراوی بۆ دەستنیشان ناکرێت. دەستدرێژی بە زۆرینەی مافەکانی ژنان هەمان دەستدرێژییە لە تۆڕی بەربڵاوی پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکان دەبینرێت.

ئەو بارودۆخەی کە ژنانی چەوساندۆتەوە و هەڕەشەیە بۆ سەریان، تەنیا هۆکاری سیاسی یان حکومەتی نیە. لێرەدا جیانەکردنەوەی مافەکان بۆ گەیشتن بە وێنایەکی گشتی لە کاروباری تایبەت بە ژنان، گرنگی بنچینەیی دەبێت، واتا بەدەستهێنانی ماف لە بوارەکانی وەک خۆراک و شوێنی شیاو بۆ ژیان و هەلی کارکردن (کە لە جاڕنامەی مافی مرۆڤ بەڕاشکاوی ئاماژەی پێدراوە) و مافی کۆمەڵایەتی و ئابووری دەبێ شەرعیەتی پێبدرێت و تەئکید لە گرنگی ئەم مەسەلەیە بکرێتەوە.

ئەم ئیدعایە کە حکوومەت لە بواری تایبەت و کەلتووری هیچ بەرپرسایەتیەکی لە ئاست پێشێلکارییەکانی ژنان نیە، هێمایە بۆ ئەم ڕاستیە کە ئەم جۆرە پڕوپاگەندانە _ ئەگەر هۆکارەکەی تەنها هاووڵاتیەکیش بێ _ زۆرجار لەگەڵ کەمتەرخەمی و تەنانەت پشتیوانی حکومەتەکان بۆ ئەو چەشنە پروپاگەندانە ڕووبەڕوو دەبێت. بڕواهەبوون بە جیاوازی نێوان بابەتی شەخسی و گشتی دژایەتیەکی لەخۆ هەڵگرتوەکە بەشێوەی بەرفراوان پاساوی چەوساندنەوەی ژنان دەدا و پێشێلکردنی مافەکانی نێوماڵ جیادەکاتەوە لە ئاسایشی گشتی نێو کۆمەڵگا. لەگەڵ ئەمەشدا چالاکڤانانی بواری مافی مرۆڤ، گوشارەکانیان خستۆتە سەر حکومەتەکان تا ڕێگری بکەن لەبەردەم جۆرەکانی تری پێشێلکردنی ماف وەک کۆیلایەتی و جیاوازی ڕەگەزی. شیاوی وتنە ئەم دەستدرێژیانە لەلایان تاکەکەسەکان لە ژیانی تایبەتیان ئەنجام دەدرێ و بەزۆری بۆ نەریتە کەلتووری و کاروبارەکانی تایبەت بەدەسەڵاتی میلی دەگەڕێتەوە.

چونکوو ڕووداوەکانی تایبەت بە" ژیانی تایبەتی" توانایی هاوسەنگی ژنانە بۆ بەشداری تەواو لە بوارە گشتیەکان، بێبەشکردنیان لە دیموکراسی و مافی مرۆڤ لە ژیانی شەخسی وتایبەتیان ، بێبەشکردنی ژنانی لە مافی مرۆڤ لە بەستێنە گشتیەکان لێدەکەوێتەوە. بۆ نموونە بەپێی سیاسەتی ژمارەیەک لە وڵاتان، ژنان مافی گەشت و بەجێهێشتنی وڵات بەبێ مۆڵەتی باوک یان شوو یان برا و تەنانەت کوڕی خۆیان نیە. لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا ژمارەیەکی کەم لە ژنان ئەو جۆرە ستەمە بە دەستدرێژی بۆ سەر مافی خۆیان دەزانن و پرۆتستۆی حکوومەتەکانیان دەکەن کە هاووڵاتیانیان لەمافی گەشتکردن بۆ دەرەوەی وڵات بێبەش دەکەن و ئەو هەڵسوکەوتە بەجۆرێک لە چەوساندەوە دەزانن. هەم لە کۆمەڵگا کراوەکان و هەم لەکۆمەڵگا داخراوەکاندا، ژمارەیەک لە ژنان لەلایان هاوسەرەکانیانەوە توندوتیژیان لەگەڵدا دەکرێت و لە ماڵەکانیاندا زیندانی دەکرێن و مافیان بۆ کۆبوونەوە سیاسی یان بەشداری لە گەلاڵەکانی گەشەپێدان پێشێل دەکرێت.

یەکێک لە هۆکارەکانی لەبەرچاو نەگرتنی مافی ژن لە جاڕنامەی مافی مرۆڤ کە جیاوازی ڕەگەزی و توندوتیژییە لەوێوە سەرچاوەدەگرێت کە سەرکوتکردنی ژنان بە بابەتێکی سیاسی لە قەڵەم نادەن. قوڵایی چەوساندنەوەی ژنان تاڕادەیەکە

کە هەنوکەش بەجێی ئەوە بە دیاردەیەکی خاوەن بنەمای سیاسی و لەسەر خواستی باوکسالارانە و ئیدیۆلۆژیک و رێکخراوە کۆمەڵایەتیەکانی بزانین، بە کارێکی سروشتی و ئاسایی دەزانن. گۆڕەپانی ئەم مشتومڕە سیاسیە، جەستەی ژنانە. گرنگیەک کە کونترۆڵکردنی ژن هەیەتی بۆ بەرەنگاری توند لە بەرامبەر گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵایەتی و یاسایی دەگەڕێتەوە و ناهێڵێ ژن خاوەن جەستەی خۆی بێت و بە ئازادی زاوزێ بکا و بەکەیفی خۆی لەگەڵ هاوڕەگەز یان ڕەگەزی جیا پەیوەندی سێکسی هەبێت و لە ژیانی هاوسەرێتی بەزۆر دەستدرێژی نەکرێتە سەر. لەمبارەیەوە دەستدرێژی سێکسی بۆ سەر ژنان لەفراوانبووندایە و لێرەولەوێ هاوڕێیە لەگەڵ جۆرەکانی تر لە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ وەک کۆیلایەتی (لەشفرۆشی بە زۆرەملێ) و تیرۆریسمی سێکسی (دەستدرێژیکردن بە زۆرەملێ) یان زیندانیکردن (مۆڵەتنەدان بە هاتنەدەر لە ماڵ).

پرسیاری سەرەکی ئەمەیە: کێ پرسگریەکانی مافی مرۆڤ مانادەکاتەوە و کێ لە کاروباری دەستێوەردانی حکومەت و بە چ مەبەستێک بڕیار دەدا؟ لەمێژە هاواری حەقخوازانەی ژنان لەم بڕیاردانانە لەبەرچاو ناگرن و جێی خۆیەتی داواکاری گرووپە جیاوازەکانی ژنان لە بارەی بەشداری لە باشکردنی سیاسەتەکان لە بارەی خۆیانەوە لەبەرچاو بگیردرێ. حکومەتەکان و هەروەها ئەو کۆمەڵگایانەی لایەنگری مافی مرۆڤن بۆ بەرەنگاری لە بەرامبەر پێشێلکاریە ستەمکارانە و گەڵاڵە بۆ داڕێژراوەکانی دژ بە مافی ژنان لە سەرانسەری جیهان، دەبێ نەریتە زاڵەکانی سەر واتا پیاوسالارییەکان بخەنە لاوە و ئەمە نایەتەدی مەگەر سەرلەنوێ خواستە جنسیەکان هەڵبسەنگێنرێتەوە و مافی ژن وەک مافی مرۆڤ پەسەند بکرێت. حکومەتەکان دەبێ بەجێی بەردەوامبوون لەسەر ئەم بارودۆخە، کۆتایی بێنن بەم شەڕە کەلتووری و سیاسیە. حکومەتەکان لەسەریانە لەناو سنووری وڵاتەکەیان بەرپرسایەتی کۆتاییهێنان بەپێشێلکردنی مافی ژنان لەئەستۆ بگرن و پەیوەندییان بپچڕێنن لەگەڵ ئەو هێزانەی لە وڵاتانی ترەوە بەردەوامن لەسەر ئەو پێشێلکاریانە.

## توندوتیژی سێکسیانە – ناوەرۆکی شرۆڤەکارانەی مافی مرۆڤ

پێشێلکردنی ماف لەسەر ڕەگەز، تەنها جۆری پێشێلکردنی مافی ژنان نیە، بەڵام ئەو لایەنانەی پەیوەندیان بە ڕەگەزەوە هەیە بە ئاشکراترین شێوە دەرئەکەون. ئەگەرچی زۆرینەی توندوتیژیەکان لەسەر ڕەگەز (مێینەبوون) لەڕاستیدا پێشێلکردنی مافی مرۆڤە بە مانا گشتیەکەی، دەمارگیری پیاوانە هەندێجار بەلای لایەنە جنسیەکەیدا دەیشکێنێتەوە بۆیە لە ئەنجامدا بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ کە پیاوانیش لە قوربانیەکانین ایناسێت. بۆ نموونە لێدانی ژنان کە جۆرێکە لە توندوتیژی و لەڕێی ترس و تۆقاندنی ڕۆحی و جەستەیی یان بەندکردن لە ماڵدا ئەنجام دەدرێ. زیندانیکردنی ژن لە ماڵ بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ پیاوان نەبێ لە حاڵێکدا هاوسەرەکەی بە ئازادای ئەتوانێ گەشت بکات تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم لە وڵاتانی خستۆتە ئەو بیرە کە ئەم جۆرە کردارە بەپێی یاسا بە سزا لە قەڵەم دەدرێ. ژنان بەبێ ڕەزامەندی خۆیان

بەکاری سۆزانیەت و کاری ناشایست لە حاڵەتی چەوساندنەوە ناچار دەکەن. تەنانەت هەندێجار ژنانی کرێکار لێیاندەدرێ و کاری سێکسیان لەگەڵ دەکرێت و دەرگای ماڵیان لێدادەخەن کە نەتوانن لەماڵ بچنەدەر (وەک نموونە بارودۆخی ژنانی ئاسیایی لە کوێت و ئەو ئەمریکیانەی ڕەگەزی مەکسیکیان هەیە و دانیشتووی لۆس ئەنجلیسن). دووگیان بوونی نەخوازراو، هەم ژنان دەستەویەخەی مردن دەکا و هەم ناچار بە کاری زۆرەملێیان دەکا. هاوسەرگیریگەلێک کە کەسانی تر بڕیاریان لەسەر داوە و ژن ناچار بەکاری سێکسی لەگەڵ ڕەگەزی نەیاری خۆی دەکەن بە مانای بێ ڕێزی کردن بە جەستەی ژن و بێبەریکردنیەتی لە مافی بونیادنانی بنەماڵە. ژن هەیە بۆ ڕزگاربوون لەم کۆیلایەتیە دەستی داوەتە خۆکوشتن یان پەنای بردۆتە بەر سۆزانیەتی. ژنان لەسەر شەقامەکان و شوێنی کار و بە بیانووی پێدانی موچە هەڕەشەی دەستدرێژی سێکسیان لەسەرە.

نەتەوە یەکگرتوەکان دەستدرێژی سێکسی لەلایان پۆلیس و فەرمابەرانی حکوومەتی وەک سزا پێناسەکردوە. هەندێجار (بۆنموونە بۆسنیا) ئەوکەسانەی دەستدرێژییان کراوەتەسەر، وەک قوربانی جەنگ ناسراون. ئەمە هەنگاوێکە بۆ پێشەوە، بەڵام دەستدرێژی سێکسیانە تەنانەت کاتێک کە کەسێکی ئاسایی ئەو کارەی کردبێ، پێشێلکردنی مافی مرۆڤە. دەستدرێژی سێکسی وەک جۆرەکانی تری ئەشکەنجە و تیرۆریسم کەرەسەیەکە بۆ بەرگریکردنی ژنان لە شوێنە تایبەتەکان وەک دەستدرێژی گەلەکۆمەیی (گروپی) وەختێک ڕوودەدا کە ژنێک بچێتەناو مەیخانە - شوێنێک کە پیاوان تێیدابالادەستن- . ئەگەر ژنێک وەک مافی خۆی بۆ خواردنەوەی بیرە بچێتەناو مەیخانە ــ ئەو کارەی پیاوێکی تر پێیهەستاوە - پێدەچێت بکەوێتە بەر تیرۆریسمی سێکسی. مەبەست لەمجۆرە پێشێلکارییانەی مافی ژنان ئەوەیە بە ترس و تۆقاندنی ژنان نەهێڵن بچنە ناو ئەو شوێنانە. کەم ژنێک دەست ئەکەوێ لە بیرەوەری خۆیدا ترس و تۆقاندنی کەوتنەبەر دەستدرێژی سێکسی نەبێ، بۆیە کەم ژن هەیە بۆ دوورکەتنەوە لەم جۆرە تیرۆریسمە خۆی نەخستبێتە تەنگانەوە.

کوشتنی کۆرپەی کچ و گەنەخۆری کچان، جۆرێکە لە قڕکردنی کچان. بەپێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی، کچان لە وڵاتانی گەشەنەکردوو بە بەراورد لەگەڵ کوڕان گەنەخۆرترن و کەمتر لە کوڕان کاتی نەخۆشی دەیانبەنە لای پزیشکان. کچان لەکاتی لە دایکبوونیانەوە بەهۆی نادادگەری سەرچاوەکان دەمرن یان ئیفلیجی جەستەیی و ڕۆحی دەبن. وێنەیەک لە برا و خوشکێکی دووانە لە وڵاتی بەنگلادش ئاشکرای دەکات کە برایەکی قەڵەوی تەندروست لە پاڵ خوشکێکی لاواز و نەخۆشەدایە. "ئاماریتا سەن" ئابووریناسی هیندی لە زانکۆی هاروارد بە توێژینەوەی ڕێژەیی خۆی ئاشکرای کردوە ٨٠ تا ١٠٠ ملیۆن ژن لە سەرانسەری جیهانی ئەمڕۆدا بێسەروشوێنن. ناوبراو بە هەڵسەنگاندنی ڕێژەی ژنان و پیاوان لە شوێنە جیاجیاکانی جیهان پێیوایە لانیکەم ئەم ژمارەیە لە ژنان لە سەرانسەری جیهان و بەتایبەت لە ئاسیا لە ژیاندان. ئەمانە " بزربوان"ی بزوتنەوەی مافی ژنانن. کێ دەیەوێ حکوومەتەکان بە تاوانی کوشتنی ئەم سەد ملیۆن ژنە دادگایی بکات.

ئەمە مشتێکە لە خەروار بۆ پێشێلکردنی مافی

ئافرەتان کە دەکرێ لەبەر ڕۆشنایی پەیماننامەکانی تایبەت بە ئەشکەنجە و کۆیلایەتی و لایەنەکانیتری پێشێلکردنی مافی مرۆڤ شرۆڤە و تاوتوێ بکرێ. تایبەتمەندی هاوبەشی سەرجەمیان، جۆرەکانی ئەشکەنجەیەکە لەسەر ژنانی سەرانسەری جیهان. لە هەوڵدان بۆ وشیارکردنەوەی جیهان لە بارەی ئەم تاوانانەوە و لەئەنجامدا کۆتایی پێهێنانیان، هەوڵێک لە کۆنفرانسی جیهانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لە بارەی مافی مرۆڤ دەستیپێکرد. لەم کونفرانسە کە لە ساڵی ١٩٩٣ لە شاری ڤیەنا بەڕێوەچوو، شاندی ژنانی چاودێر داوای کرد لە دانیشتنی داهاتووی "ئەنجوومەنی پەیماننامەکان"ی ئەو ڕێکخراوەیە کە لە بارەی چاودێریکردن لەسەر جێبەجێکردن و پتەوکاری لە بنەماکانی ناو پەیماننامەکان دادەڕشێت، پرسی ڕەگەزناوەندی (باڵادەستی جنسی) بەوجۆرە باسی لێوەکرا، بچێتە ناو دانیشتنەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا نابێت ژنانی شۆرشگێڕ بۆ ژیانی باشتر لەڕێی بەرزکردنەوەی ئاستی ڕێزگرتن لە مافەکانیان دەستەوەستاو بمێننەوە و چاوەڕوانی مۆڵەتی بەرپرسانی باڵابن. کاتێک دایکان و دایەگەورەکانی ئەرژەنتینی لەبەرامبەر یەکێک لە زاڵمترین دیکتاتۆرەکان هاتنە ناو گۆرەپانی مایۆ (Plaza de Mayo) بۆ ناڕەزایەتی دەربڕین دژی ونبوونی منداڵەکانیان، هەرگیز لە جاڕنامەکانی مافی مرۆڤدا باسی بزرکردن و ونبوون نەهاتبوو. ئەو کاتە ئەو ژنانە لەو گۆرەپانەدا هاواریان دەکرد " ئاشکرایە لامان مافی ئەم ونبوانە پێشێلکراوە و دانانیشین تا چارەنوسیان بۆمان ئاشکرادەبێت" دەیانزانی نابێ چاوەڕوانی کۆمەڵگای پاراستنی مافی مرۆڤ بمێننەوە تا ونبوونی ڕۆڵەکانیان

بە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە قەڵەم بدەن. هەنووکەش لەسەر ئێمەیە لە دژی دەستدرێژی بۆ سەر ژنان کە لە مێژە بەشاراوەیی ماوەتەوە، هەستینەسەرپێ.

ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ چەمکەکانی ناو بزوتنەوەی مافی مرۆڤ و سەرلەنوێ ماناکردنەوەی لە ڕوانگەی فمینیستی شتێک نیە تەنیا لەناو سنووری واتاناسیدا بێت. لەمبارەیەوە پرسی ژمارەیەکی زۆر لە ژنان لە سەرانسەری جیهان، پرسی ڕۆژانەی مان و نەمانیانە. لە کونفرانسی جیهانی مافی مرۆڤ ژنان بە ڕاشکاوی باسی ئەم کێشانەیان کرد. لە حاڵێکدا کە کۆمەڵگای جیهانی پاراستنی مافی مرۆڤ، دەستدرێژی بۆ سەر ڕەگەزی مێ بە جۆرێکی شاراوە و گشتگیری پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە قەڵەم داوە، پێویستە لەسەرمان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەم کردەوانە ڕێوشوێنی دیار بگیرێتەبەر. یاساکانی مافی مرۆڤ و بەندەکانی ئەو جاڕنامەیە ڕێگەی لەبەردەم ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بەفیڕۆدانی گەڵاڵە بۆ دارێژرا و و بەردەوامی مافی ژنانی کردۆتەوە. ئیستا ئەکرێ حکوومەتەکان ناچاربکرێن تا پاپەندی بەرپرسایەتیان بن لەبارەی یاساکانی دژ بە جیاکاری جنسی و ئەو هەستیارییەی دەکەوێتە سەرشانی ڕێکخراوە ئیدارییەکانیان. تەنها لەڕێی ڕاگەیاندنی بەرپرسایەتی کۆمەڵگای جیهانی و ئەرکی حکومەتەکانە دەتوانین لەگەڵ پێشێلکردنی گەورەی مافی ژنان لە سەرانسەری جیهان لە هەموو شوێنێک و بەردەوام ڕووبەڕوو ببینەوە .

فایلی ژمارە


* مۆراڵ چییە؟ — هۆرست هایدبرینک — و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال
* سێ ئەرکی مرۆڤ — نیکۆس کازانتزاکیس — و. لە ئینگلیزییەوە: هادی محەمەدی
* سیاسەت و ئەخلاق — اکرم البنی — و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع
* قۆناغە سەرەتاییەکانی.. — ڕازێل ئایلسۆن — و. لە ئینگلیزییەوە: چنور فەتحی
* بە گوێی دڵ بیستن... — ئۆشۆ — و. لە فارسییەوە: جەواد حەیدەری
* تیۆریاکانی سروشتی ئەخلاق — جەیمس ڕەیچڵ و ستوارت ڕەیچڵ — و. لە ئینگلیزییەوە: کارزان عەزیز
* ئەخلاق لە سەردەمی نوێدا — موستەفا مەلەکیان — و. لە فارسییەوە: فاتیمە ئەدهەم
* ئەخلاقی فەردی و کۆمەڵایەتی — برتراند ڕەسڵ — و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی


# سیاسەت و ئەخلاق



# مۆراڵ چییە؟

نووسینی: هۆرست هایدبرینك
و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

پێشبینی بکەن کە بەڕێزتان سەرۆکی دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکان. لە دەوڵەتێکی عەرەبی تێرۆریستان ژمارەیەک هاوڵاتی ئەمەریکیان بە بارمتە گرتووە. تێرۆریستەکان یەکێک لە بارمتەکانیان کوشتووە، پێش ئەوەی بەهۆی ناوەندیاریی سەرۆکی دەوڵەتێکی عەرەبییەوە کۆڵ بدەن و بارمتەکانی دیکە ئازاد بکەن. بەدووی ئەمەدا تێرۆریستەکان لە لایەن دەزگاکانی ئەو ولاتە عەرەبییەوە بەدیل گیراون، بەڵام گەرەکە بە فڕۆکە ببرێنەوە بۆ وڵاتە عەرەبییەکەی خۆیان، لەوێش وەک چاوەڕوان دەکرێت نەک تەنیا سزا نادرێن، بەڵکو تەنانەت دەتوانن پێشبینی بکەن کە لە وڵاتەکەی خۆیان هاوسۆزی، هەروەها کەم یان زۆر ناساندن و سەرسامبوونی دەرنەبڕاویان پێدەبڕێت. هاوڵاتیانی ئەمەریکی زۆر تووڕەن سەبارەت بە ڕووداوەکان، تەنانەت کەسانی خاوەن کاریگەری

**توێژینەوەکان، وەك ئەوانە کە ئادلسن ئەنجامی داون، سەرنجمان ڕووەو پنتێکی زۆر گرنگتر ڕادەکێشن: ئاشکرایە کە ئاستی جیاوازی ڕاڤەکردن هەیە، بەمەش ئاستی جیاوازی تێگەیشتن لە هەڵوێست بەرانبەر حاڵەت و کێشە مۆراڵی و سۆسیال و سیاسییەکان هەیە**



هۆرست هایربرینک

دەنگ بەرزدەکەنەوە و ڕایدەگەیەنن کە دەبێت پابەند بەو کێشەیەوە شتێک ڕووبدات، پێویستە بەتوندی هەڵوێست وەربگیرێت. ئەوجا دەزگای هەواڵگری پلانێک دەخاتە بەردەم بەڕێزتان (وەک سەرۆک): فڕۆکەی جەنگیی ئەمەریکی کە لە دەریای سپی دامەزراون، گەرەکە لە ڕێ ئەو فڕۆکەیە بگرن کە وەک بڕیارە بارمتەگرەکان بباتەوە بۆ وڵاتەکەیان، ئەوجا ناچاری بکەن لە ئیتالیا بنیشێتەوە؛ بەم شێوەیە دەشێت بارمتەگەرەکان دەستگیربکرێن و گەر بشێت لە ئیتالیاوە بگوازرێنەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، تاکو لەوێ بیاندەن بە دادگا.

ئەمە تا ئێرە بریتی بوو لە چیرۆکەکەمان کە ویستومانە هاوشێوەیی لەتەک ڕوداوی ڕیالدا هەبێت.

ئایا چۆن ئێوە بڕیار دەدەن؟ گەرچی بەڕێزتان کاتی زۆرتان نییە، بەڵام پرسیار بە ڕاوێژکارانتان دەکەن، ئەوانیش، وەک چاوەڕوان دەکرێت، بۆچوونی جیاوازیان هەیە. هەندێکیان (ناویان دەنێین هەڵۆکان) لەتەک پلانەکەدان، ئەوانیدی (ناویان دەنێین کۆترەکان) تەواو دژی ئەو پلانەن:

یەکەم هەڵۆ: گەر پلانەکە چاک ئامادەکرابێت، واتا هیچ هەنگاوێکی شکست نەهێنێت، ئەوا گەرەکە بەگەڕی بخەین. با ئیتر بۆ دوا جار پیشانی تێرۆریستانی بدەین کە ئێمە دەتوانین لە هەموو جێیەکی جیهاندا لەدژیان بجەنگێین.

یەکەم کۆتر: لەم حاڵەتەدا ڕیسکێکی زۆر گەورە هەیە، با چاوەڕوانی هەلێکی باشتر بکەین.

دووەم هەڵۆ: هاوڵاتیانمان چاوەڕوانی ئەوە لە حکومەتەکەیان دەکەن کە هەموو کارێک ئەنجام بدات بۆ ئەوەی لە تێرۆریستان بییان پارێزێت.

دووەم کۆتر: حکومەتێک بۆی نییە بەم شێوەیە کردار بنوێنێت، ئاخر ئەوسا تانوتی ئەوەمان لێدەدرێت کە ئێمە هاوشێوەی تێرۆریستان هەڵوێست دەنوێنین.

سێیەم هەڵۆ: لێرەدا تاوانێکی گەورە ڕوویداوە، مرۆڤێک کوژراوە، ئەوە گاڵتەجاڕی دەبێت بە هەموو مافێک گەر ڕێبدرێت تاوانبارەکان بەبێ سزا دەرباز بن.

سێیەم کۆتر: بێگومان پێویستە تێرۆریستەکان سزا بدرێن، بەڵام یاسای نێودەوڵەتی کارێکی جەردەیی (پایراتیی) بەو چەشنە یاساغ دەکات. ئەرک و مافی دەوڵەت ئەوەیە کە خۆی لە تێرۆریستان بپارێزێت، ئەمەش بێگومان تەنیا لەنێو چێوەی ئەو سنوورەدا کە یاسا ڕێی پێداوە.

ئێستا بەڕێزتان وەک سەرۆک کۆمەڵێک ئەرگومێنتتان بیست، بەڵام ئێوە خۆتان سەرپشکی بڕیارن. ئایا سەرجەمی ئەمە چ پەیوەندییەکی بە مۆراڵەوە هەیە؟ مەسەلەکە ڕوودەکاتە قەرارێکی سیاسی، بەڵام ئاشکرایە ڕەهەندێکی مۆراڵیشی هەیە. کانت دەبێژێت: «سیاسەتی ڕاستەقینە ناتوانێت یەک هەنگاو بنێت پێش ئەوەی ڕەچاوی مۆراڵی نەکردبێت» . بەڵام پێدەچێت ئەم پرسە لە تێگەیشتنی ڕۆژانەی زۆر کەسدا بە جۆرێکی دیکە بێت — بە دیدی ئەوان مۆرکێکی بناغەیی سیاسەت ئەوەیە کە هیچ پەیوەندییەکی بە مۆراڵەوە نییە. بەڵام گەر وردتر لەم کێشەیە بڕوانین، دەبینین کە ئەم تێڕوانینە هێندە جیاواز نییە لە داواکارییەکەی کانت. ئاخر گەر کەسێک سکاڵا بکات کە گوایە لە سیاسەتدا مۆراڵ نییە، ئەوا ئەو کەسە لە سکاڵاکەیدا گریمانە دەکات، کە پێویستە مۆراڵ لە سیاسەتیشدا هەبێت، کەواتە ئەو کەسە لە مەغزای کانتدا سکاڵا دەکات سەبارەت بە نەبوونی سیاسەتی «ڕاستەقینە» .

لەو چیرۆکەی سەرەوەدا کە هێندە ئەندێشەیی نییە، ڕیزێک ئەرگومێنتی مۆراڵی هەیە کە چ لە لایەن «کۆترەکان» و چ لە لایەن «داڵەکان»ـەوە دەهێنرێنەوە، بەڵام پێدەچێت خوێنەر حەدەسیانە (ئینتوئیتیڤ) هەست بکات کە ئەو ئەرگومێنتانە «چۆنێتی» مۆراڵیانەی تەواو جیاوازیان هەیە (...).

ئاشکرایە کە سیاسەت پەیوەندییەکی بە مۆراڵەوە هەیە، بەڵام ئەم تێڕوانینە هێشتا هەر ڕوونی ناکاتەوە کە داخۆ مۆراڵ چی بێت. تێگەی مۆراڵ دەگەڕێتەوە بۆ «مـۆس» (مۆریس = moris)ی لاتینی و واتاکەی بریتییە لە: ئاکار، نەریت، خوو، کارەکتەر، ئەوجا ئەم تێگەیە لە سەدەی شازدەیەمەوە لە واتای بەگەڕخستنی نەریتیانەی سوودوەرگرتن لە شتێک یان لە واتای «نەریت»دا بەکاردەهێنرێت، جگە لەوە لە سەدەی حەڤدەیەمەوە وەک موراديف بۆ «فەلسەفەی ئاکار» (philosophia moralis) دادەنرێت.

هەروەها تێگەی مۆراڵ نزیکییەکی ئێتیمۆلۆژیانەی لە تێگەی «غیرەت» هەیە. ئەمڕۆ فەرهەنگی دودن پێنج بەکارهێنانی تێگەیی جیاوازی وشەی «مۆراڵ» جیادەکاتەوە:

١) سیستەمی بنەما و نۆرمە ئاکارییە پابەندەکان بە ترادیسیۆن و فۆرمی کۆمەڵایەتی و ئاینییەوە کە لە سەردەمێکی تایبەتیدا ڕەفتارە نێومرۆڤییەکان ڕێکدەخات. ٢) (بەبێ کۆ/پلوراڵ) میزاج، هۆشی خەباتگێڕی. ٣) ڕێبازی فەلسەفەی ئاکار. ٤) ڕەفتاری ئاکاریانەی تاکەکەسێک یان گرووپێک. ٥) (بەبێ کۆ) بەگەڕخستنی سوودمەندی شتێک بۆ لێفێربوون ( ... بۆ نموونە وەک دەگوترێت: مۆراڵی چیرۆکەکە بریتی بوو لە ...).

مـۆراڵ لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە بەتایبەتی لە مەغزای ڕەفتاری مۆراڵیدا بەواتایە. بەڵام لەبەر ئەوەی ڕەفتاری مۆراڵی سەربەخۆ نییە لە نۆرمە مۆراڵییەکانی کۆمەڵگەیەک، ئەوا ئەم نۆرمانەش لە دیدی سایکۆلۆژییەوە بەبایەخن. ئێمە لە حاڵەتی ڕەفتاری مۆراڵیدا خۆمان لە لایەنی تاکەکەسدا دەبینینەوە، سیستەمی مۆراڵیانەی نۆرمەکانیش تا

ڕادەیەک سەر بە شوێنەواری تاکەکەسە. بەڵام لێرەدا نامانەوێت هاوشێوەی پێناسەکەی دودن مۆراڵی تاکەکەس تەنیا پەیوەست بکەین بە ڕەفتارەوە، بە دیدی ئێمە مۆراڵی تاکەکەس هەروەها پرۆسە مۆراڵییەکانی هزرین یان ئاگایی لەخۆ دەگرێت، لەبەر ئەم هۆیە گەرەکە مۆراڵی گرووپێکیش وەک سەر بە مۆراڵی کۆمەڵایەتی دابنرێت، چونکە گرووپ (گەر لە دیدی تاکەکەسەوە بڕوانین) سەر بە کاریگەرییەکانی شوێنەوارە. کەواتە مۆراڵ لە مەغزای ئاگایی و ڕەفتاری مۆراڵیدا بریتییە لە بنیاتنانەوەی (رێکۆنستروکسیۆنی) تاکەکەسییانەی مۆراڵی کۆمەڵایەتی. لەم تێڕوانینەدا هاوکات ئەو گریمانەیەش هەیە کە ئاگایی مۆراڵی و کرداری مۆراڵی لە پرۆسەیەکی نێوچالاکیدا کە لەنێوان تاکەکەس و شوێنەواردا هەیە، دەگۆڕڕێن. ئەم پرۆسەیەی کاریگەرییەکی نێویەکی باشتر شیاوی ڕوونکردنەوە دەبێت گەر ئەو «لایەنانە» کە تێیدا بەشدارن، هەتا ڕادەی شیان بەڕوونی جیابکرێنەوە لە یەکتری. لەبەر ئەوەی تێگەی مۆراڵ چ بۆ مۆراڵی تاکەکەس و چ بۆ نۆرم و بەها مۆراڵییەکانی کۆمەڵگەیەک بەکاردەهێنرێت، ئەوا زۆر دەشێت پابەند بەم مەسەلەیەوە بەهەڵەتێگەیشتن سەرهەڵبدات.

ئێمە لە ژیانی ڕۆژانەدا فرە زۆرتر لەوەی لێی بەئاگاین بەرەنگاری کێشەی مۆراڵی دەبینەوە، هۆی ئەمە لەوەدایە کە ئێمە لە ڕەفتارماندا زۆر جار دەتوانین لەسەر ڕێساگەلی ئەوتۆ بڕۆین کە ئێمە وەک چواندوو بۆ خۆمان لێیان دەڕوانین. بەبێ هیچ گومانێک ناسراوترین ڕێساکانی ڕەفتار پەیوەند بە کێشەی مۆراڵییەوە بریتین لە دە ڕێساکەی بیبل. گرووپێک کە لە کیژانی دە ساڵان پێکهاتبوو، ئەم دە ڕێسایەی لە دانانی «ڕێسای یانە»کەیاندا فۆرمولەکردەوە:

١- هیچ درۆیەکی قوتارکەر مەکە - گەر پێویست نەبێت.
٢- لە هیچ کەس مەدە — لە ڕۆنی نەبێت.
٣- هیچ وشەیەکی جنێو بەکارمەهێنە کە بەدتر بێت لە جنێوی «دەستبڕ».
٤- ڕوخسارت بە یەکدا مەدە — بەرانبەر ڕۆنی نەبێت.
٥- ڕەفتار مەنوێنە وەک کەر یان بەراز.
٦- خیانەت لە کەس مەکە — لە ڕۆنی نەبێت.
٧- لە هیچ کەس دزی مەکە — لە ڕۆنی نەبێت.
٨- خشۆک مەبە.
٩- موڵکی هیچ کەس تێکمەشکێنە — موڵکی ڕۆنی نەبێت.
١٠- لەگەڵ هیچ کەس زبر مەبە — لەگەڵ ڕۆنی نەبێت.

ئەم ڕێسایانەی یانەکە پیشانی دەدەن کە «کەتەلۆگی (جیای) ڕەوشت» هەیە، بەڵام پێویستە لەم حاڵەتەدا ڕەچاوی تەمەنی ئەو کیژانە بکەین کە ڕێساکانیان داناوە، ئاخر دەشێت کەسانی کامڵ کە ئەو ڕێسایانەی یانەکە دەخوێننەوە، لە لایان بەزۆریی چاوپۆشییەکی خەنیو بێتە ئاراوە، جا گەرچی دەشێت کەسێک هەوڵ بدات بڕوا بە کچەکەی خۆی بهێنێت کە بەو شێوە تایبەتییە مامەڵە لەگەڵ ڕۆنیدا نەکات، ئەمەش ڕەنگە بە ئاماژەدان بۆ «ڕێسای زێڕین» کە دەڵێت: «ئەوە کە ناتەوێت لەگەڵت بکرێت، تۆش لەگەڵ هیچ کەسدا مەیکە».

با سەرەتا ئەوە بە کراوەیی بمێنێتەوە کە هەتا چەند بڕواپێهێنانێکی بەو چەشنە سەردەگرێت، بەڵام هەر چۆنێک بێت لێرەدا ڕووکراوەتە ئەو پرسیارە کە هەتا چەند «مۆراڵ» شیاوی فێربوون یان فێرکردنە. لە بنەڕەتدا هیچ کەس بەجدی گومان لەوە ناکات کە ئەو ڕێسا مۆراڵیانەی ئێمە لەسەریان دەڕۆین، لە ڕەوتی گۆڕانی خۆماندا گۆڕانیان بەسەردا دێت، بەڵام زۆرتر لەم تێڕوانینە پرسیارێکی دی جێی مشتومڕە: داخۆ بتوانین وایدابنێین لەم گۆڕانەدا پێشکەوتنێک

ببینین، ئەمەش نزیکەی لەو شێوەیەدا کە وەک دەگۆترێت گوایە مۆراڵی کەسی کامڵ «چاکتر»ە لە مۆراڵی منداڵ. ئایا کێ دەیەوێت بڕیار بدات کە چ مۆراڵێک «چاکتر»ە و چ مۆراڵێک «خراپتر»ە؟ ئاشکرایە بەدەگمەن کەسێک تا ڕادەیەکی ئەوتۆ دەڕوات کە وایدابنێت، هەموو ڕێسایەکی ڕەفتار هەروەها لە کایەی مۆراڵیشدا شیاوی قبووڵکردنە، سەرەڕای ئەمە زۆر کەس مەیلیان بۆ ئەوە هەیە کە پەیوەند بە بەها مۆراڵییەکانەوە هەڵوێستێکی ڕێژەگەرایی وەربگرن. لەم هەڵوێستە ڕێژەگەراییەدا وادادەنرێت کە نرخاندنە مۆراڵییەکانی تاکەکەسێک دەشێت هەوەسئاسا بن، بەڵا بە پێچەوانەوە ئەو نرخاندنانە کە لە لایەن گرووپێکەوە بە شێوەیەکی دیموکراتیانە بڕیاریان لەسەر دراوە، بە بنەمایی چواندنیان هەیە، چونکە بە کۆ بەرپرسیاری بۆ ئەو نرخاندنانە وەردەگیرێت.

ئەم هەڵوێستە کە ناودەنرێت ڕێژەیەتیی بەهاکان، لەو گریمانەیەوە دەردەچێت کە هیچ پرنسیپێکی گشتگیر (یونیڤێرسالی) و ناهەوەسئاسای مۆراڵ نییە. گەر تەنانەت وادابنرێت کە پەیوەندیگەلی جیاوازی کولتووری و کۆمەڵایەتی دەبن بەهۆی هاتنەئارای فۆرمی جیاوازی مۆراڵی، ئەوا هێشتا هەر ناشێت بڕیار بدرێت کە داخۆ چی لە کۆتاییدا «چاک»ـە یـان «خـراپ»ـە. ئـەم تێڕوانینە چەند لیبراڵ بنوێنێت، سەرەڕای ئەمە پێدەچێت خێرا بە سنووری خۆی بگات. بۆ نموونە پێدەچێت ڕێزگرتن لە نەریتی تایبەتیی خواردن کە مەرجی کولتووری یان ئایینیی هەیە (وەک یاساغکردنی گۆشتی بەراز)، کێشەی کەم بخاتەوە، هاوکات سزای تایبەتی هەیە کە لای ئێمە زۆرتر لە ڕەتکردنەوەی سانا دەهێنێتەگۆڕێ، وەک ئەو سزایانە کە لە شەریعەتی ئیسلامیدا باون، بەڵام لە لایەکی دیکەوە لای ئێمەش زۆر کەس لایەنگری ئەوەن کە مرۆ تەنانەت بۆ سەرپێچییەکی لاوەکی سزای توند بدرێت. بۆ نموونە ئادلسن (١٩٨٠) لە توێژینەوەی پێشبینییە سیاسییەکانی گەنجاندا بۆیدەرکەوت کە بەتایبەتی گەنجان (ی نێوان ١٧ بۆ ٢٠ ساڵان) دەشێت «تینووی خوێن» بن:

«سەبارەت بە یاسایەکی قەدەغەکردنی جگەرەکێشان پرسیار لە ژمارەیەک گەنج کرا کە بۆ توێژینەوەکە تەرخانکرابوون: ئایا چی بکرێت گەر مرۆ سەرپێچیی ئەو یاسایەی کرد؟ هەندێک لە گەنجەکان، لەپاڵ هەندێک مێتۆددا، پێشنیاری چەند مێتۆدێکیان کرد، وەک پەیداکردنی سیخوڕ، شاردنەوەی سیخوڕ لەنێو کەنتۆری ماڵی کەسەکاندا، تەنانەت دامەزراندنی تۆڕێکی وردی شاشەی تەلەڤیزیۆن لە شوێنە گشتی و تایبەتییەکاندا کە تەنیا بۆ ئەو مەبەستە تەرخانکرابێت. هەرزەکاران لە پێناوی بەدیهێنانی ڕێکخستنی گشتیدا مەیلیان بۆ ئەوە هەیە کە ئیجراکان سووک و ئاسان زیادبکرێن: پۆلیسی زۆرتر، سزای زۆرتری پارە، سزادانی درێژخایەنی زیندان، هەروەها گەر پێویست بێت لەناوبردنی سەرپێچیکەران. ئەوان بۆ کایەیەکی فراوان و هەمەلایەنیی پرسیار لەبارەی تـاوان و سـزا هەمیشە پێشنیاری چارەسەرێک دەکـەن: «سـزادان، گەر ئەمەش سـوودی نەبوو، سزای توندتر»‌.

ئادلسن تێبینیی کرد کە ئەم ڕەهەندە بۆ هەڵوێستی ئۆتۆریتێر لە لای هەموو ئەو هەرزەکارانە کە بۆ توێژینەوەکە تەرخانکرابوون، بەدیدەکرا: لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە بەریتانیای مەزن و کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵی. کەواتە پێدەچێت ئەم مەسەلەیە بە هیچ شێوەیەک دیاردەیەکی نەتەوەیی نەبێت:

«بێگومان جیاوازیی نەتەوەیی لە هزرینی سیاسیدا هەیە، بەڵام جیاوازیەکان هێندەی ئەو جیاوازیانە گەورە نین کە پێشمەرجی جیای تەمەنیان هەیە. پێشبینییە سیاسییەکانی گەنجێکی دوازدە ساڵانی

ئەڵمانی زۆرتر لە پێشبینییە سیاسییەکانی دوازدە ساڵانێکی ئەمەریکی دەچن وەک لە هینی برا پازدە ساڵانەکەی».

توێژینەوەکان، وەک ئەوانە کە ئادلسن ئەنجامی داون، سەرنجمان ڕووەو پنتێکی زۆر گرنگتر ڕادەکێشن: ئاشکرایە کە ئاستی جیاوازی ڕاڤەکردن هەیە، بەمەش ئاستی جیاوازی تێگەیشتن لە هەڵوێست بەرانبەر حاڵەت و کێشە مۆراڵی و سۆسیال و سیاسییەکان هەیە. گەر گەنجێک لەو بڕوایەدا بێت کە باشترین فۆرمی حوکمداری بریتییە لە دیکتاتۆرییەکی ئۆتۆکرات کە تێیدا یەک کەس هەموو شتێک دیاری دەکات و ئەوانیدی شوێن ڕێنوماکانی ئەو دەکەون، ئەوا دەشێت ئەم بڕوایە لە ڕووی ناوەرۆکەوە نزیکییەکی تایبەتیی لە جیهانبینیی نیۆفاشیستی هەبێت، بەڵام ڕەنگە باشتر بێت خۆمان لە ڕاڤەیەکی بەم چەشنەی ئەو بڕوایە بەدووربگرین. گەر دوو کەس بیر لە هەمان شت بکەنەوە، ئەوا ئەم بیرکردنەوەیە هێشتا هەر هەمان بیرکردنەوە نییە، ئەمەش بەتایبەتی کاتێک ئاوهایە، گەر تەمەنی یەکێکیان دوازدە و تەمەنی ئەویدیکەیان سیی ساڵان بێت. ئەم مەعریفەیە بە ڕواڵەت وەک هەرەمەکی دەردەکەوێت، بەڵام لە بنەڕەتدا وا نییە. دوازدە ساڵانێک کە نەریتێکی جەختی «Law and Order» (یاسا و ڕێکخستن)ی هەیە، هیچ مەرج نییە خۆی لە سەرەتای ڕێگەیەکی چەوتی سیاسیدا ببینێتەوە، جا گەرچی لەم تەمەنەی ئێستایدا مەیلی بۆ ئەوە هەبێت سەرجەم دەسەڵاتی سیاسی بدات بە ڕابەرێکی «بەتوانا». گەر ئەو کەسە پاش دە یان بیست ساڵ لەسەر هەمان تێڕوانین سووربێت، ئەوا ئێستا دەشێت وایدابنێین کە لەم حاڵەتەدا کەمایەتییەکی گەشەی کەسێتی هەیە، واتا ئەوە کە لە ئەدەبیاتدا بە شێوەیەکی ڕازێنراوە ناودەنرێت «هەڵوێستی سیاسی».

(...)

ئێمە دەزانین کە هەندێک کەس «مۆراڵیتر» لە کەسانی دی بیردەکەنەوە و کردار دەنوێنن، هەروەها ئەوەش دەزانین کە کەسان هەندێک جار مۆراڵیانە بیردەکەنەوە، بەڵام لە حاڵەتی ڕووداوی بەواتادا کەمتر مۆراڵیانە کردار دەنوێنن. ئێمە دەتوانین ئەم حاڵەتە بە شێوەیەکی ئەمپیری بسەلمێنین، بەڵام لە بنەڕەتدا گرنگتر لەم سەلماندنە ئەوەیە کە بزانین بۆچی ئەمە ئاوهایە، بۆ نموونە بمناتوانیایە ڕوونــی بکەینەوە کــە داخــۆ چــی لــە ناخی ئەو مرۆڤانەدا ڕوودەدات کە ڕێدەدەن بکرێن بە کۆیلەی ئەشکەنجەدانی دەوڵەتی و لێرەشدا هەست بە هیچ ئازارێکی وێژدان ناکەن، یان داخۆ چی کەسانی دی بزوێنێت کە ئامادەبن خودی خۆیان بکوژن وەک لەوەی چەکێک ئاڕاستەی کەسانی دی بکەن. گەر جیاوازی لە مۆراڵی مرۆڤاندا نەبووایە، پێویستمان بە دیاریکردنی مۆراڵ نەدەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی جیاوازی هەیە، ئەوا دیاریکردنی مۆراڵ بەتەنیا بەس نییە، بەڵکو گرنگتر لەو دیاریکردنە ئەوەیە کە ئێمە لە مۆراڵ تێبگەین و ڕوونیبکەینەوە.

بەتایبەتی لە پاشخانی پێشبینییەکی تیۆرییەوە سـەبـارەت بـەوە کە چـۆن مـۆراڵ وەک کایەیەک شیاوی دیاریکردنە، چۆن مۆراڵ لەلای تاکەکەس گـۆڕان دەبینێت، چۆن جیاوازییەکان لە مۆراڵی تاکەکەسیدا کاریگەری لەسەر کرداری تاکەکەس دەنوێنن، دەشێت دیاریکردنێکی ئەمپیریانەی مۆراڵ سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. لە لایەکی دیکەوە مرۆ ناتوانێت گۆڕان بە هیچ تیۆرییەکی مۆراڵ بدات گەر پێشبینییەکی سەبارەت بەوە نەبێت کە داخۆ مۆراڵ چی بێت. بەڵام ئێمە خۆشبەختانە پێشبینییەکمان سەبارەت بە مۆراڵ هەیە. تەنانەت گەر بۆ ئێمە گران بێت پێناسەیەکی بەگشتی چواندووی مۆراڵ بکەین، هێشتا هەر ڕاهێنانی کافیمان هەیە و بەرێیەوە

دەتوانین ڕوونیبکەینەوە چی ڕاستە و چی خراپە، ئەم ڕاهێنانەش پێکەوە لەتەک ئەو ئەزموونەدایە کە کەسانی دیکە لەتەک پێشبینییەکانماندا سەبارەت بە چاک و خراپ یەکدەگرینەوە.
بلازی ئاماژەی بۆ ئەوە دا کە سایکۆلۆژی پێویستە لە شرۆڤەی زانستیانەی مۆراڵدا ڕووبەڕووی مەترسییەک ببێتەوە کە ئەو ناوی نا «لەکەسخستن». گەر مرۆ لە گۆڕانی مۆراڵ بتوێژێتەوە، یان هەوڵ بدات لەلای فێرخوازان شکۆفەی پێبدات، ئەوا پێویستە بەئاگا بێت کە مەسەلەکە لێرەدا بریتی نییە لە مۆراڵی کەسانی دی، بەڵکو هەمیشە خـودی ئەو کەسە دەگرێتەوە. ڕووبـەڕووبـوونـەوە لەتەک تیۆرییەکی گۆڕانی مۆراڵیانەی بڕیاردا (حوکمدا) گەرەکە دەرفەت برەخسێنێت بۆ خەریکبوون بە ئاڕاستەوەرگرتنی مۆراڵیانەی خودی خۆوە. گەر ئەو تیۆرییە نەتوانێت ئەمە بەدیبهێنێت، ئەوا دەتوانین بەڕاستی گومان لە بایەخی پراکتیکیانەی بکەین. گەر ڕەچاوی حاڵەتی پۆزەتیڤ بکەین، ئەوا لێرەدا زۆر جێی داخ دەبێت گەر مرۆ هەوڵ بدات شرۆڤەی بابەتیانەی مۆراڵی «پراکتیکی»ی خۆ بەگەڕبخات بۆ ئەوەی بەرێیەوە شرۆڤەیەکی ئەبستراکتی مۆراڵی «تیۆریانە»ی کەسانی دی ئەنجام بدات.
کەواتە پرسیاری سایکۆلۆژیانە سەبارەت بەوە کە داخۆ مۆراڵ لە ڕاستیدا چی بێت، داخۆ چۆن هزرین و کرداری مۆراڵیانەی مرۆڤان بەڕاستی کارا دەبن، بـەزەرووری بەر ئەو پرسیارە دەکەوێت کە لە بنەڕەتدا پرسیارێکی فەلسەفەییە: چۆن گەرەکە (soll) مۆراڵ پێکهاتبێت. بەڵام پێویستە بەئاگابین کە ئەم دوو پرسیارە بە یەک تێکەڵ نەکەین، چونکە تێکەڵکردنی بوون (Sein) و گەرەک (Soll) دەشێت کێشەیەکی تیۆرییانەی جیدی بخاتەوە.


**سـەرچـاوە:**

Horst Heidbrink: Stufen der Moral. München 1991.


## فـەرهـەنـگـۆك

بوون (Sein) و گەرەک (Soll): لە فەلسەفەی مۆراڵدا جیاوازی دەکرێت لە نێوان ئەم دوو تێگەیەدا. بوون بەندە بەو پرسیارەوە کە داخۆ شتێک خۆی بەڕاستی چۆن بێت، بەڵام گەرەک ڕوو دەکاتە کرداری تاکەکەس بە ئامانجێکەوە، وەک دەگوترێت: تۆ گەرەکە ئاوها نەک بە جۆرێکی دی کردار بنوێنیت. لە فەلسەفەدا بە شێوەی جیا ئەو پرسیارە دەکرێت کە داخۆ مرۆ بتوانێت لە بوونەوە ڕووەو گەرەک دەرئەنجام بباتەوە.

نۆرم: پێوەر (معیار)

نیۆفاشیست: بیرکردنەوە و کرداری فاشیستی دوای دووەم جەنگی جیهانی بەتایبەتی لەو وڵاتانەدا کە فاشیزمیان تێدا بوو. ئەمڕۆ هەروەها بۆ بزووتنەوەی ڕاستی توندڕەو بەکاردەهێنرێت. لەم جیهانبینییەدا گەل بە شێوەیەکی ڕەگەزگەرایی پێناسە دەکرێت، هەروەها لەدژی دیموکراتی جەخت لە دەسەڵاتی تاکەکەسێک (ڕابەر) دەکرێت.

ئۆتۆکرات: دەسەڵاتدارێک کە بێسنوور و بەبێ جڵەوی یاسا حوکم دەکات.

ئۆتۆریتێر: کەسێک (دەسەڵاتدارێک، بەڕێوەبەرێک یان باوکێک) کە توانست و خواستی خۆسەپاندنی هەیە و ئەو کردارەی بەهۆی سومعەی و ترسەوە لێی وەردەگیرێت.

ئێتیمۆلۆژی: زانستی سەرچاوە و مێژووی وشە.

**وەرگـێڕ**

# سێ ئەرکی مرۆڤ

نووسینی: نیکوس کازانتزاکیس
و. لە ئینگلیزییەوە: هادی محەمەدی

**ئەرکی یەکەم**

١. ڕوون و ئارام لە دنیا دەڕوانم و دەڵێم: هەموو ئەو شتانە کە دەیبینم، دەیبیسم، دەیچێژم، هەستی دەکەم و بۆنی دەکەم، بەرهەمی زەینی منن،

٢. هەتاو لە کاسەسەرم دا هەڵدێ و ئاوا دەبێ، لە پەرسگەیەکم دا هەڵدێ و لەوی دی دا ئاوا دەبێ.

٣. ئەستێرەکان لەنێو مێشکم دا ئەدرەوشێنەوە: لە مێشکی ناسەقامگیری من دا، ئەندێشەکان، مرۆڤەکان، ئاژەڵان دەگەڕێن و دەلەوەڕێن؛ گۆرانی و گریان سەدەفی پێچاوپێچی گوێچکەم دەئاخنێ و بۆ ساتێک تۆفان بەرپا دەکات.

٤. هەر کە مێشکی من دەفەوتێ، هەموو زەمین و ئاسمانەکان دەفەوتێن.

٥. بیرم دەقیژێنێ: «تەنیا من هەم!»

٦. لە قووڵایی شانە نادیارەکانی من دا، هەر پێنج هەستەکەم خەریکی کارن، ئەوان تان و پۆی شوێن و زەمەن، خەم و شادی، مادە و ڕۆح لێک دەتەنن و پاشان هەڵیشان دەوەشێننەوە.

٧. لە دەور و بەرم دا هەموو شتێک وەکوو ڕووبارێک لە چەرخ و خول دایە؛ ڕوخسارەکان وەکوو ئاو دەخزێن و ئاشووبی ئەزەلی ئەنووزێنێ.

**به ئارامی تێدەكۆشم، لەنێوان ئەو دیاردانەی خۆم دروستم كردوون هەنگاو دەنێم، بۆوەی خۆم ئاسوودە بم سنووربەندییان دەكەم، بە چەمكی قانوون یەكیان دەخەم و لەگەڵ خواست و پێویستییەكانم گرێیان دەدەم.**



نیكۆس كازانتزاكیس

٨. بەڵام من، یانی زەین، هێمن و خۆڕاگر و بوێر و بە ئاگام لەم گێژیەدا، بۆوەی نەخلیسكێم و دانەكەوم، لەسەر كەوانەی بازنەیی زەینم چەند دروست دیاری دەكەم، لەسەر ئەم گێژییە پرد دەبەستم و ڕێگای خۆم دەكەمەوە.

٩. بە ئارامی تێدەكۆشم، لەنێوان ئەو دیاردانەی خۆم دروستم كردوون هەنگاو دەنێم، بۆوەی خۆم ئاسوودە بم سنووربەندییان دەكەم، بە چەمكی قانوون یەكیان دەخەم و لەگەڵ خواست و پێویستییەكانم گرێیان دەدەم.

١٠. ئەمە منم كە نەزم بەسەر ئاشووب دا دەسەپێنم و بەپێی ڕوخساری خۆم، فۆرمی ئاشووبی ئەزەلی دیاری دەكەم.

١١. من نازانم ئایا ڕاستیەكی شاراوەی بەرزتر لە من لەودیوی ڕواڵەتی دیاردەكان دا هەیە یان نا، ناشمەوێ بزانم، گرنگ نییە. من ئاپورەی دیاردەكان دەسازم و بە تێكەڵێكی تۆخ لە ڕەنگەكان، لەئاست ئەم زەندۆڵە نەخشی پەردەیەكی مەزن و پڕ زرق و برق دەكێشم. مەڵێ ئەم پەردە لادە، من دەمەوێ ئەو نیگارە ببینم، نیگار هەمان پەردەكەیە.

١٢. ئەم هەرێمە منالّی منە، كاتییە و بەرهەمی مرۆڤە. بەڵام شتێكی پەتی و پڕبایەخە، هیچ شتێك لە وێ پەتی تر نییە. هەر لەم دەڤەرەدایە كە من شاد و بەكەڵك و ئەكتیڤ دەمێنمەوە.

١٣. من تێكۆشەری زەندۆڵم. من چاودێری زەندۆڵم. هەم تیۆریم و هەم پراتیك. من یاسام، شتێكی بەرزتر لە من بوونی نییە.

١٤. یەكەم ئەركی مرۆڤ لێرەوە دەست پێدەكات: بە بێ سەرهەڵدانێكی بێهوودە سنوورەكانی زەینی خۆی ببینێ و قەبووڵی بكا و بە بێ گلەیی و گازندە لەم دەڤەرە دژوارەدا بێ وچان كار بكات.

١٥. لە سەرەوەی ئەم زەندۆڵە كاتییە، بوێرانە و خۆنەویستانە، دەڤەرێك بۆ زەین بسازێنە، تا بتوانی لەودا وەك زەمینداران خەرمانی هەستت بكوتی و شەنی بكەی.

١٦. وردبینانە و قارەمانانە ئەم ڕاستییە ئینسانیانە كە لە خوێنی ئێمە دان بناسە: ئەلف. زەینی مرۆڤ تەنیا ڕواڵەتی شتەكان دەناسێت، نەك گەوهەر و

ناوەرۆکیان؛ ب. ناتوانێ ڕواڵەتی هەموو شتەکانیش بناسێ، بەڵکوو تەنیا ڕواڵەتی مادە دەناسێ؛ پ. ڕواڵەتی پەتی مادەش ناناسێت، بەڵکوو پێوەندی نێوان ڕواڵەتەکان دەناسێت؛ ت. ئەم پێوەندییانەش شتێکی ڕاستیی نین و سەربەخۆ لە مرۆڤ نین، بەڵکوو دەسکردی مرۆڤن؛ ج. ئەمانەش هەموو ئەو پێوەندییانە نین کە زەینی مرۆڤ دەتوانێ دروستیان بکات، بەڵکوو تەنیا ئەو بەشەن کە بۆ کردار و تێگەیشتنی مرۆڤ پێویستن.

١٧. زەینی مرۆڤ خاوەن دەسەڵاتی ڕەوا و ڕەهایە بەسەر ئەم دەڤەرەدا، هیچ هێزێکی تر بەسەر ئەم دەڤەرەدا زاڵ نییە.

١٨. من بە ئەڤین و بە دڵخواز ئەم دەڤەرەم قەبووڵ کردووە و هێندە بەسەربەستی لەم ئاقارەدا تێدەکۆشم کە پێم وایە ئازادم.

١٩. من بەسەر مادەدا زاڵ دەبم و ناچاری دەکەم کە ببێت بە ماتریاڵێکی باش بۆ زەینم. من لەگەڵ گیا و ئاژەڵ و مرۆڤ و خودا شاد و شەیدا دەبم، دەڵێی هەموویان منالّی منن؛ وا هەست دەکەم کە هەموو گەردوون لە باوەشی مندایە و بەجۆرێک بەدوام دا دێت کە دەڵێی بەشێکە لە جەستەم.

٢٠. لە ساتێکی لەناکاو و سامناک دا، بیرێک بە مێشکم دا دێت: «هەموو ئەم شتانە یارییەکی دژوار و بێ هوودەیە؛ نە سەرەتای دیارە و نە کۆتایی، نە ماناشی هەیە.» بەڵام دیسان بەئارامی خۆم لەگەڵ چەرخی پێویستیدا گرێ دەدەم و دیسانەوە تێکڕای گەردوون بەدەوری من دا دەسووڕێتەوە.

٢١. نەزم و دیسیپلین بەرزترین شتە. تەنیا بەمجۆرە لەنێوان هاوسەنگی و ئارەزوودا جۆرێک باڵانس بەدیدێ و هەوڵی مرۆڤ بەرهەم دەدات.

٢٢. بەمجۆرە، بە ڕۆشنی و بە خۆنەویستی، تۆ دەتوانی بەر لەوەی کە ڕێگەی ڕزگاری بگریتەبەر، هێزی بەرینی زەین لەنێوان دیاردەکان دا و، لاوازی وی لە سەرەوەی دیاردەکان بناسیت. بۆ ڕزگاری هیچ ڕێگایەکی ترت نییە.

### ئەرکی دووهەم

١. من هیچ سنوورێک قەبووڵ ناکەم: دیاردەکان ناتوانن گەمارۆم بەن؛ ئەگینا خەفە دەبم! خوێنی جگەر خواردن و بە دڵ و گیان ژییان، ئەمەیە دووهەمین ئەرک.

٢. زەین خۆڕاگرە و خۆی ڕێک دەخات، حەزی لە یارییە، بەڵام دڵ وەحشی دەبێت و مل بە یاری نادات، دڵ وا هەست دەکات خەریکە دەخنکێ و هێرش دەبات تا تۆڕەکانی جەبر و پێویستی بدڕێ.

٣. چ سودێکی هەیە کە بەسەر خاک و ئاو و هەوادا زاڵ بیت، بەسەر کات و شوێن دا زاڵ بیت، یان بزانی چ یاسایەک بەسەر ئەو سەرابانەدا زاڵە کە لە هاڵاوی سووتێنەری بیابانی زەین دا دەردەکەون.

٤. تەنیا یەک ئارەزووم هەیە: ئەوە کە بزانم چی لەودیو دیاردەکان دایە، لەو نهێنیە تێبگەم کە منی بەدیهێناوە و دوای دەمکوژێت، ئەوە کە بزانم ئایا لە سەرووی ئەم دنیایە کە دیارە و بەردەوام دەگۆڕێت، شتێک، گەوهەرێکی نادیار و نەگۆڕ هەیە، یان نا؟

٥. ئەگەر زەین بێ هێزە، ئەگەر زەین بۆ ئەوە دروست نەبووە کە لێبڕاوانە و قارەمانانە هەموو دەڤەرەکان بپشکنێ، ئەی بریا کە دڵ بیتوانیایە!

٦. واوەتر، واوەتر، واوەتر، من واوەتر لە مرۆڤ بۆ تاژانگێ دەگەڕێم کە جەستەی مرۆڤ دەکوتێ و بەرەو هەوڵ و تێکۆشان دەیبزوێنێ. من کەمین دەکەم تا بزانم کام ڕوخساری ئەزەلی واوەتر لە ئاژەڵان تێدەکۆشێ تا بە بەدیهێنان و تێکدان و دیسان ئافراندنەوەی ئەم ڕوخسارە بێ ئەژمارانە، نەخشی خۆی لەسەر ئەم جەستە ڕوولەفەوتانە بکوتێ، من تێدەکۆشم تا واوەتر

لە بژوێن و گیا، لەنێوان قوڕ و گڵا، شوێن پێی یەکەم هەنگاوی لەرزۆکی ئەو [هێزە] نادیارە بدۆزمەوە.

٧. فەرمانێک لە ناخم دا دەنگ هەڵدێنێ: «هەڵکەنە! چی دەبینی؟» «مرۆڤەکان و باڵندەکان، ئاو و گاشەبەردان.»

«قووڵتر هەڵیکەنە! چی دەبینی؟»

«بیر و ڕا و خەون و خولیا، فانتازیا و بروسکەی سەرسوڕهێنەر!؟

«قووڵتر هەڵیکەنە! چی دەبینی»؟

«هیچ نابینم! جگە لە شەوێکی لاڵ و خامۆش، شەوێک لە شێوەی مەرگ، یان خودی مەرگ.»

«قووڵتر هەڵیکەنە!»

«ئاخ! ئیتر ناتوانم ئەم دەڤەرە تاریکە هەڵکەنم! دەنگی بانگ و شیوەن دەبیسم. لەوبەری بەستێنەوە دەنگی شەقەی باڵ دێت.»

«مەگری، شیوەن مەگێڕە! بەستێنی تر لەئارادا نییە. ئەو دەنگی بانگ و شیوەن و شەقژن و باڵ لێکدانە، دەنگی دڵی خۆتە.»

٨. واوەتر لە زەین، لەسەر لێواری هەڵدێری پیرۆزی دڵ، بە لەرزە لەرز دەڕۆمە پێش، قاچێکم قورس و قایم خاک دەگرێت، ئەویدی بە کوێرە کوێر بەرەو هەڵدێری تاریکی زەندۆڵ دەچێت.

٩. لەودیو هەموو دیاردەکان، من هەست بە تێکۆشانی گەوهەرێک دەکەم کە دەمەوێ لەگەڵ وی یەک بگرم.

١٠. من هەست دەکەم کە لەودیوی دیاردەکان، ئەو گەوهەرەی کە لە تێکۆشان دایە، هەوڵ دەدات لەگەڵ دڵی من یەک بگرێت. بەڵام جەستە دەبێتە پەرژین و ئێمە لێک دادەبڕێ، زەین دەبێتە پەرژین و ئێمە لێک دادەبڕێ.

١١. ئەرکی من چییە؟ ئەوەیە کە جەستە تێکبشکێنم و بەرەو ئەو هێزە نادیارە بفڕم، زەین خامۆش بکەم تا دەنگی ئەو هێزە نادیارە ببیستم.

١٢. من بەسەر لێواری زەندۆڵ دا دەڕۆم و دەلەرزێم، دوو دەنگ لە ناخم دا لەشەڕ دان.

١٣. زەین دەڵێ: «بۆچی کاتی خۆمان بەفیڕۆ بدەین و بەشوێن مەحاڵ دا بڕۆین؟ دەبێ لە حەساری پیرۆزی پێنج هەستەکەدا بوەستین و تێبگەین کە توانای مرۆڤ هەر ئەوەندەیە.»

١٤. بەڵام دەنگێکی تر لەناخم دا هەستی شەشم، دەنگی دڵ دژایەتی و هاوار دەکا: «نا! نا! هەرگیز مەڵێ توانای مرۆڤ هەر ئەوەندەیە و تەسلیم مەبە، هەموو سنوورەکان تێکبشکێنە، چی دەبینی حاشای لێ بکە، هەموو ساتێک بمرە، بەڵام بڵێ: مردن قەت لەئارادا نییە.»

١٥. زەین دەڵێ: «چاوی من واوەتر لە وەهم و ئومێد دەبینێ، من هەموو شتێ بە ڕووناکی دەبینم. ژیان جۆرێک یارییە و هەر پێنج هەستی من ئەکتەری ئەم یارییەن.

١٦. من بە حەزەوە، بەوپەڕی شەوقەوە، لە دیمەنی ئەم شانۆیە دەڕوانم، بەڵام وەک کەسێکی گوندی نیم کە چی ببینم بڕوا بکەم و بە هەوڵ و تێکۆشان خۆم لەم دۆخە دەرباز بکەم و خۆم بخەمە ناو ئەم کۆمێدییە خوێنینەوە.

١٧. من ئەو سۆفییە سەیرەم کە بێ بزاڤ لە چوارڕێیانی هەستەکان دا دادەنیشم و سەیری دنیا دەکەم کە بەدیدێ و دەفەوتێ؛ سەیری ئاپورەی خەڵک دەکەم کە شەپۆل دەدەن و دەڕۆنە پێش بە ڕێگای ڕەنگاوڕەنگی پووچی دا دەقیرێنن.

١٨. ئەی دڵ، ئەی دڵی ساویلکە، بێ دەنگ بە، تەسلیم بە.

١٩. بەڵام دڵ هەڵدەفڕێ و دەچریکێنێ: «من هەر ئەو گوندییەم کە باز دەداتە نێو گۆڕەپان و لە شانۆی دنیادا بەشدار دەبێ.»

٢٠. من بێ ئوقرەم، ئارام ناگرم، من نامەوێ [لەگەڵ

دۆخـی دنیا] خـۆم ڕێـک بخەم. من بـەدوای ترپە قووڵەکانی دڵم دا دەڕۆم.

٢١. من دەپرسم و دەپرسم و دەرگای دۆزەخ دەکوتم: «کێ ئێمەی لەم خاکەدا چاند بێ ئەوەی پرسمان پێ بکات؟ کێ لە ڕیشەوە هەڵماندەکێشێ بێ ئەوەی پرسمان پێ بکات؟؟»

٢٢. من بوونەوەرێکی کاتی و لاوازم، لە گڵ و خەون چێکراوم، بەڵام وا هەست ئەکەم کە هەموو هێزەکانی گەردوون لە ناخی من دا دەسوڕێنەوە.

٢٣. بەر لەوەی پێشێلم بکەن، من دەمەوێ بۆ ساتێک چاوەکانم بکەمەوە و بیانبینم. بێجگە لە مە، هیچی ترم ناوێ.

٢٤. دەمەوێ بیانوویەک بدۆزمەوە بۆ ئەوەی بژییم بۆ دیتنی دیمەنی پڕژانی نەخۆشی، درزێوی، بێ دادی و مەرگ.

٢٥. ڕۆژێک لە شوێنێکی تاریک هاتمە دەرێ: زێ، ئێستاش بەرەو شوێنێکی تاریکی تر دەچم: گۆڕ. هێزێک منی لە زەندۆڵێکی تاریک فڕێ داوەتە دەرەوە و هێزێکی تر بەرەو زەندۆڵێکی تاریک و بێ گەڕانەوەم دەبات.

٢٦. من وەک مرۆڤێکی مەست نیم کە مەی هۆشی لێ ستاندووە، من ئێجگار وریا و وشیارم، بیر و بەرچاوم ڕوونە و بە هەنگاوی دڵنیایی بە لێواری دوو هەڵدێردا ڕادەبوورم.

٢٧. هەروەها تێدەکۆشم بەر لەوەی بمرم ڕێگەیەک بدۆزمەوە کە هاوڕێیانم وشیار بکەمەوە، یارمەتییان بدەم، بە وردی وشەیەکیان بۆ ببێژمەوە، هەروەها پێیان بێژم ئەم ڕەوتە چۆن دەبینم کە ئاوا بەخێرایی دەڕوات، ئەی ئێمە بۆ کوێ دەڕۆین، چەندیش گرنگە لەم ڕێگەیەدا دڵ و هەنگاومان یەک بگرن.

٢٨. دەمەوێ لەم دەرفەتەدا وشەیەک بە هاوڕێیانم بڵێم، ناوێکی نهێنی، شتێک وەک ڕەمزی گوزەر.

٢٩. ئەرێ، ئەرێ، ئامانجی زەوی، ژیان نییە، مرۆڤ نییە. زەوی بە بێ ئەوانیش هەبووە، لەدواییشدا بە بێ ئەوان دەبێت، مرۆڤ و ژیان دوو برووسکەن کە بەهۆی سووڕانەوەی خێرای زەوی توور دراون.

٣٠. وەرن با یەک بگرین، وەرن با سفت و سۆڵ دەستی یەکتر بگرین، وەرن با یەک دڵ بین، وەرن با بخولقێنین- تا کاتێ کە هێشتا زەوی گەرمە، تا کاتێ کە هێشتا بوومەلەرزە، کارەسات، سەهۆڵبەندانی سامناک، یان ئەستێرەیەکی کلکدار وێرانی نەکردووین- -وەرن با دڵ و مێشکێ بۆ زەمین بەدیبێنین، وەرن با مانایەکی مرۆڤی بەم تێکۆشانە بان مرۆڤییە ببەخشین.

٣١. ئەم دڵەڕاوکەیە دووهەمین ئەرکی ئێمەیە.

## ئەرکـی سـێهـەم

١. مێشک خـۆی ڕێـک دەخـات. مێشک دەیـەوێ سیاچاڵەکانی کاسەسەر بە کاری مەزن پڕ بکاتەوە، لەسەر دیوارەکانی دروشمی قارەمانی هەڵکۆڵێ و لەسەر کۆت و زنجیرەکانی نەخشی باڵ و پەڕی ئازادی بکێشێ.

٢. دڵ ناتوانێ خۆی ڕێک بخات. بە دەستانی ماندوو دیوارەکانی سیاچاڵ دەکوتێ و گوێ لە دەنگی عیشق و شەهوەت دەگرێ کە هەوایان پڕ کردووە. ئەوجار دڵ، تەژی لە ئۆمێد، دەنگی زڕەی زەنگی زنجیرەکانی هەڵدەستێنێ و وەڵامی ئەو دەنگانە دەداتـەوە؛ بۆ ساتێک دڵ وا هەست دەکات کە زنجیرەکانی بوون بە باڵ و پەڕ.

٣. بەڵام دڵی بریندار دیسان دەکەوێتە سەر خاک، هەموو هیواکانی ئەدۆڕێنێ و دیسان لە چنگی ترس و سام دا یەخسیر دەبێ.

٤. کاتی هاتووە: دڵ و مێشک بەجێ بێڵە، بچۆ پێشێ، هەنگاوی سێهەم هەڵگرە.

٥. خۆت لە خۆشی ساکاری مێشک ڕزگار کە، ئەو

دەیەوێ هەموو شتێک بە یاسا بەڕێوە ببا و بەسەر دیاردەکان دا زاڵ بێت. خۆت لە ترسی دڵ ڕزگار کە، ئەو دەیەوێ و هیوای وایە کە ڕۆژێک گەوهەری شتەکان بناسێ.

٦. بەسەر مەزنترین و دواین کەڵکەڵەدا زاڵ بە: ئۆمێد. ئەمە ئەرکی سێهەمە.

٧. ئێمە جەنگدەکەین چونکە جەنگمان خۆش دەوێ، ئێمە گۆرانی دەچڕین، تەنانەت ئەگەر کەسێ نەبێ کە گوێمان لێ بگرێ، ئێمە کار دەکەین تەنانەت ئەگەر ئاغایەک نەبێ لە ئێوارەدا پارەمان بداتێ، ئێمە بۆ خەڵکی تر کار ناکەین، ئێمە ئاغای خۆمانین. باخەرەزی زەمین هی ئێمەیە، گۆشت و خوێنی ئێمەیە.

٨. ئێمە نەمامی ڕەز دەچێنین، پەل و پۆی زیادی دەبڕین، هێشووەکانی ترێ دەچنین، دەیفلیقێنین، دەیکەین بە شەراب و دەینۆشین، گۆرانی دەچڕین و دەگرین، بیر و خەیاڵ لە سەرمان دا باڵ دەگرن و هەڵدەفڕن.

٩. لە کام وەرزی ئەم ڕەزستانەدا نۆرەی کارکردنت گەیشتووە؟ وەرزی چاندن؟ وەرزی چنین؟ یان وەرزی شادی و نۆشین؟ هەموویان یەکێکن.

١٠. من زەمین دەچێنم و لە چەرخ و خولی چارەنووسی هەنگور شاد دەبم. من گۆرانی دەچڕم، تینوو دەبم، کار دەکەم و ئارەقە دەڕێژم و لە شەوقی بادەیەک کە ساز دەبێ، سەرخۆش دەبم.

١١. من ئەم پەرداخە پڕە لەئاست ڕوخسارم ڕادەگرم و لە مێشکم دا هەموو ڕەنج و کوێرەوەری باوباپیرانم بەبیردا دێت. ئارەقی تەوێڵم، وەک ئاوی کانی، لە تەوێڵی بەرز و مەستم دادەچۆڕێ.

١٢. من کیسەیەکم پڕ لە گۆشت و ئێسقان، خوێن و ئارەق، ئەسرین و ئارەزوو، دەرک و تێگەیشتن.

١٣. بۆ ساتێک لە هـەوادا دەخولێمەوە، هەناسە دەدەم، دڵم ترپەی دێت، مێشکم تیشک دەهاوێ، لەناکاو زەوی درز دەبات و من نامێنم.

١٤. لە بڕبڕەی پشتم دا، دوو ڕووبـار ڕێدەکەون و دەوەستن، لە ئەندامەکانی ژیانیی من دا ژن و پیاوێک یەکتر لە باوەش دەگرن. ئەوان یەکتریان خۆش دەوێ و لە یەکتر بێزارن، پێکەوە شەڕ دەکەن.

١٥. پیاو تووشی خەفەقان بووە و دەقیرێنێ: «من ماسورەم دەمەوێ تان و پۆکان لەبەر یەک هەڵوەشێنم و خۆم لە دەزگای چنینی جەبر و پێویستی ڕزگار کەم.

١٦. «لە یاسا واوەتر بڕۆم و جەستەکان تێکبشکێنم و بەسەر مەرگ دا زاڵ ببم، من تۆوم!»

١٧. بەڵام دەنگی دیکە، کە دەنگێکی ئەفسوونگەر و ژنانەیە، بە ئارامی و دڵنیایی وەڵام دەداتەوە: «من لەسەر خاک چوارمشقی دادەنیشم و ڕیشەکانم بەرەو ناخی زەمین، بەرەو گۆڕەکان دەنێرم، بێ هیچ بزاڤێک تۆو هەست پێ دەکەم و خۆراکی پێ دەدەم، من شیر و پێویستیم.

١٨. من پێم خۆشە بگەڕێمەوە، ببمەوە بە ئاژەڵ، تەنانەت لەمەش خوارتر بڕۆم، ببم بە درەخت، لەناخی خاک و ڕیشەدا جێ بگرم و قەت نەبزووم.

١٩. من پێش بە ڕۆحم دەگرم و دەیکەم بە کۆیلە، نایەڵم لە چنگم دەرباز بێت، ئاخر من لەو بروسکەیە بێزارم کە بەرەو سەرەوە دەچێ. ئەمن زێم!»

٢٠. بەڵام من گوێ لەم دوو دەنگە دەگرم؛ ئەمانە هەر دوویان دەنگی منن، من بە بیستنی هەر دوویان شاد دەبم و حاشا لە هیچ کامیان ناکەم. دڵی من ڕەقس و سەمای هەر پێنج هەستە؛ دڵی من ڕەقسی دوولایەنەیە تا حاشا لە هەر پێنج هەست بکات.

٢١. چەندین هێزی بێ ئەژماری دیار و نادیار، لە خەباتی من لە دژی ئەم ڕەوتە زاڵە و، لە هەڵکشانی پڕژانم، شاد دەبن و بەدوام دا دێن.

٢٢. چەندین هێزی بێ ئەژماری دیار و نادیار، ئاسوودە

دەبن و دوبارە ئارام دەگرن کاتێ کە من دادەکشێم و دەگەڕێمەوە ناو خاک.

٢٣. دڵی من بەڕێوەیە. من بەدوای سەرەتا و کۆتایی جیهان دا ناگەڕێم. من بە دوای ڕیتمی سامناکی دڵم دا دەڕۆم و بەهەنگاوی قورس دەڕۆمە پێش.

٢٤. هەموو ساتێک ماڵاوایی لە هەموو شتەکان بکە، ئارام و پڕشەوق چاو لە هەموو شتێک، لە هەست و نیست ببڕە و بڵێ: «ئیدی هەرگیز!»

٢٥. سەیرێکی دەوروبەرت بکە: هەموو ئەم جەستانە کە دەیبینی ڕۆژێک دەڕزێن و دەفەوتێن، ڕزگاری لەئارادا نییە.

٢٦. ورد بیانبینە: ئـەوان دەژیـن، کار دەکـەن، ئەڤیندار دەبن، هیوادارن: دیسان بڕوانە: هیچ شتێک بوونی نییە!

٢٧. پشتاوپشت مرۆڤ لە خاک سەرهەڵدێنن و دیسان دەبنەوە خاک.

٢٨. هەوڵ و کۆشش و خەسڵەتی بـەرزی مرۆڤ سەرڕێژ دەبێ و سەر لە ئاسمان دەسوێ.

٢٩. ئێمە بەرەو کوێ دەڕۆین؟ مەپرسە! هەڵکشێ، داکشێ، نە سەرەتاییەک هەیە و نە کۆتایی، تەنیا ئەم ساتە لەئارا دایە، پڕاوپڕ لە تاڵی، پڕاوپڕ لە شیرینی، بەڵام من لە هەردوویان چێژ وەردەگرم.

٣٠. ژیان خۆشە، مەرگیش خۆشە؛ زەوی لەنێو دەستی پڕ ئەزموونی من دا، وەک مەمکی ژنان، خڕ و سفتە.

٣١. من لە هەموو شتێک ڕازیـم، ئەڤیندار دەبم، ئازار دەچێژم، تێدەکۆشم. لەبەر چاوی من دا دنیا لە زەین مەزنترە، دڵی من ڕازێکی مەزن و ئاڵۆزە.

٣٢. گەر تۆ بتەوێ، ڕۆح بەرزدەبێتەوە بەسەر شەپۆلانی خرۆشان و بە نیگای گشتگیری خۆی هەموو دەریـا هەڵدەلووشێ. سفت زەینت بگرە، مەهێڵە بلەرزێ. ئەوکات جارێکی دی، بە بازێکی لەناکاو، خۆت لە گێژەنی شەپۆلان بدە و تێکۆشان دەست پێ بکەوە.

٣٣. جەستەی ئێمە کەشتییەکە کە بەسەر ئاوی شین و قووڵ دا سەوڵ دەکوتێ، ئامانجی ئێمە چییە؟ ئەوەیە کە سەرئەنجام ئەم کەشتییە تێکبشکێ.

٣٤. بـڕوەی کە ئۆقیانووسی ئاتلانتیک تەنیا سێڵاوێکە و هیچی دی، کەوابوو دنیای نوێ تەنیا لە دڵی مرۆڤ دایە. ڕۆژێک، لەناکاو، تۆ و کەشتی بایەوانی هەموو دنیا بە گێژەنێکی کپ و مەنددا ڕۆدەچن و سێڵاوی مەرگ دەتانباتەوە.

٣٥. دەس لە ئومێد هەڵگرە و بوێرانە سینگی کەشتییەکەت بەرەو زەندۆڵی تاریک بسووڕێنە و بڵێ: «هیچ شتێک بوونی نییە!«

٣٦. هیچ شتێک بوونی نییە! نە ژیان، نە مەرگ. من دەبینم کە مێشک و مادە وەکوو دوو شتی ئەڤینداری وەهمی بەدوای یەک دا دەڕۆن، دەبن بە یەک، جیا دەبنەوە و مەحو دەبن، ئەوجار من دبێژم: «ئەمە هەر ئەو شتەیە کە من دەمەوێ!»

٣٧. ئێستا ئیتر دەزانم کە: هیچ ئارەزوویەکم نییە. لە هیچ شتێ ناترسێم. خۆم لە دەست هەر دوویان، مێشک و دڵ، ڕزگار کردووە. ئێستە بە لووتکەی بڵند گەیشتووم و ئازاد بووم. ئەمە هەر ئەو شتەیە کە بەردەوام هەڵوەدای بووم، ئیدی هیچی ترم ناوێ. من بەردەوام عەوداڵی ئازادی بووم.

**سـەرچاوە:**

THE SAVIOURS OF GOD، Spiritual Exercises، by Nikos Kazantzakis، Translated by Kimon Friar، Greetings for Pandelis Prevelakis from the author in Greek and the translator in English

# سیاسەت و ئەخلاق

نووسینی: اکرم البنی
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

لەمڕۆدا و لەو کەشوهەوایەی سیخناخە بە وێنەی توندوتیژیی و کوشتن و گەشەکردنی زمانی هەڕەشە و گوڕەشە و لۆژیکی هێز و تێکشکاندن کە ڕێڕەوی ژیانمان دیاردەکات، هاوکات لەگەڵ ئەوەدا گەشەکردنی نەمانی دیسپلین و نەمانی بەها ئەخلاقییەکان و ڕێگەدان بە بەکارهێنانی هەموو شێواز و ئامرازێک بۆ بەدیهێنانی مەرام و ئامانجە سیاسییەکان، پەیوەندی نێوان سیاسەت و ئەخلاق جارێکیتر دێتەوە بەرباس و دەوروژێنرێت و قسەی لەسەر دەکرێت.

ئەگەر سیاسەت لە سادەترین پێناسەیدا بریتیبێت لە شێوازەکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵێک خەڵک و جێبەجێکردن و ڕایکردنی کاروبارەکان کە چاکە و سودی ئەو کۆمەڵە خەڵکەی تێدابێت، ئەوا ئەخلاق بریتییە لەو کۆمەڵە بەها و ئایدیایانەی کە ئاراستەی هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەکرێت، بە


اکرم البنی

**ستمگەری تەواوی نمونە باشەکان و تەواوی بەها مرۆڤانەییەکان هەڵدەگێڕێتەوە و ئاوەژویان دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەیە ئیمتیازات و بەرژەوەندییەکانی خۆی بەردەوامبێت و دەستکەوتەکانی بپارێزێت و ئەخلاقی ملکەچی و گوێڕایەڵی و فڕوفێڵ و دووزمانی گشتگیر بکرێت و بڵاوببێتەوە. لەم پێناوەشدا هەموو ئەو شتانە دێنێتە ئاراوە کە پارێزگاری لە دەسەڵاتەکەی دەکەن و بەرپەچی ئەو هەڕەشانە دەداتەوە کە گوایە ڕوبەڕوی دەبێتەوە**

جۆرێک کە ئەو هەڵسوکەوتانە هەڵسوکەوتێکی باش بێت و دووربێت لە خراپەکارییەوە. لێرەوە هەردوکیان، سیاسەت و ئەخلاق، ئامانجیان ئەوەیە خەڵکی تێڕوانینێکی پێشوەختیان هەبێت، ئەم تێڕوانینە پێشوەختە وادەکات ژیانیان ئامانج و مانایەکی هەبێت. کەواتە ئەم دوانە لەو بانگەشەیەدا پێکدەگەن کە داوای بونیادنانی جۆرێکی تایبەت لە پرنسیپ و پەیوەندی مرۆڤانە دەکات و بەرگریش لەو پرنسیپ و پەیوەندییە مرۆڤانەیە بکات. بەڵام سیاسەت و ئەخلاق لەوێدا لێکجیادەبنەوە کە ئەو پرنسیپ و پەیوەندییە مرۆڤانەیەی سیاسەت چارەسەری دەکات، لە ڕووی جۆرایەتییەوە لەو پرنسیپ و پەیوەندییە مرۆڤانەییە جیاوازە کە ئەخلاق پێیەوە سەرقاڵە. لە ڕۆشنبیری سیاسی ئێمەدا پەیوەندی نێوان سیاسەت و ئەخلاق گەشتوەتە ئاستی دژایەتی و بەریەککەوتن، مەسەلەکە گەشتوەتە ئاستێک هەر تێکۆشەرێکی سیاسی دەتوانێ بە بیانوی ڕەوایەتی و پیرۆزی ئەو ئامانجەی بۆی تێدەکۆشێ، پێ بەسەر هەموو بەها ئەخلاقییەکاندا بنێت و ڕەتیانبکاتەوە.

بێگومان ئەخلاق لە کایەی سیاسیدا، تەنها بریتی نییە لە کۆمەڵێک بەهای بەربڵا و دەربارەی ڕاستگۆیی و وەفادرای و جوامێری، گەرچی ئەو بەهایانە لەکاری سیاسی خاوێندا، زۆر گرنگ و پێویستن، بەڵکو بریتییە لە ڕاستی و دروستی نێوان گوفتار و کردارەکان، بریتییە لەو پەیوەندییە ئاڵۆزەی نێوان ئامانجی سیاسی و ئامرازەکانی بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە سیاسییە. بە مانایەکیتر بریتییە لەو تەحەدیی و پێوەرە ئەخلاقیانەی لەبەردەم سیاسییەکاندا دادەنرێن، تاکو ئەو کەلێنە پڕکاتەوە کە لەکاری سیاسییەکاندا دروستدەبێت، کەلێنی ئەوەی دەیڵێن و ڕایدەگەیەنن لەگەڵ ئەوەی پێیهەڵدەسن و جێبەجێی دەکەن و بە چاو دەبینرێت. هەروەها کەلێنی ئەوەی شێوازێکی خەبات و تێکۆشان هەڵدەبژێرن و دەستبەرداری شێوازێکی دیکەی خەبات و تێکۆشان دەبن. ئایا ئەو پێوەرە ئەخلاقیانەی سیاسییەکان هەڵیدەبژێرن، لەسەر بنەمای ویست و حەز و مەبەستی سیاسییەکانە، یان لەسەر بنەمای


کەواکبی

بەها مرۆڤانەییە گشتییەکانە؟ ئایا لای سیاسییەکان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان، تا چ ئاستێک ڕەوایەتی یان عەدالەتی ئامانجە سیاسییەکەی، ڕێگایان پێدەدا بە ئارەزوی خۆیان و چۆنیان بوێت و چۆنیان پێخۆشبێت ئامرازی نا ئەخلاقی و نا شەریف بەکاربهێنن؟ یان ئامانجە سیاسییەکانیان تا چ ڕادەیەک هانیانددەدا پێ بەسەر هەموو ئەو بەها و ئایدیا ئەخلاقی و مرۆیانەدا بنێن کە مرۆڤایەتی بە درێژایی تەمەنی هێناویەتییە ئارا و بەسەریەکدا کەڵەکەی کردوون؟! کاتێ جیاکاری لە نێوان بونیادی ئەخلاقی تاکێک کە هەڵپەی بەدیهێنانی پێداویستییەکانی و حەز و ئارەزوەکانیەتی لەگەڵ تاکێکی دیکە کە هەوڵی بەدیهێنانی بەهاکانی چاکەکاری و دادپـەروەری و یەکسانخوازی دەدات، دەکەین. دەتوانین لە سەختی و قورسی جەنگی سەرخستنی ئەخلاق لای تێکۆشەر یان لای ئەوانەی لە بواری کاروباری گشتیدا کاردەکەن تێبگەین. هەروەها لە سەختی گۆڕینی ئەو بەها نێگەتیڤ و خراپانە تێدەگەین کە ڕۆشنبیری باو و بڵاویکردۆتەوە، بەهایەک پێیوایە دووڕویی و دووزمانی و ترسنۆکی و غەدرکردن، شێوازی سەرکەوتون و ڕوویەکە لە ڕووکاری لێزانی و شارەزایی سیاسییەکان.

هەرچەندە سیاسەت و ئەخلاق دوو ماهیەتی جیاوازن و زەحمەتە یەکێکیان دەست بەسەری ئەوی دیکەیاندا بگرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار زەحمەت نییە یەکتر تـەواو بکەن و لە کەشوهەوایەکی ئـازاد و هاوسەنگدا لەگەڵ یەک کارلێکبکەن. لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە فەزیلەت لە سیاسەتدا یان ئەخلاق لە سیاسەتدا، ناکرێ و ناشێ لە کەشوهەوایەکی سیخناخ بە چەوساندنەوە و توندوتیژی یان لە کەشوهەوایەکی لێوان لێو لە ئامادەنەبونی مافی هاوڵاتیبوون و دادپەروەری و یەکسانی و بەشداریکردن، گەشەبکات. لێرەوە ئەوەیە وا دەکات دیموکراسی تەنها ئەگەرێک بێت لەبەردەستدا، بۆ جێگیرکردنی بنەماکانی ڕەفتاری سیاسی لەسەر بنەمای بەها ئەخلاقییەکان دژ بە ئەخلاقی توندوتیژی و دژ بە بڵاوبونەوەی شێوازەکانی سوکایەتیپێکردن و کوشتن، بۆ یەکلاییکردنەوەی ململانێی بەرژەوەندییە سیاسییەکان.

ئەوەی وادەکات زیاتر بەدەم ئەم مەسەلەیەوە بڕۆین، ئەوەیە شۆڕشی بـواری پەیوەندیکردن و خێرایی گۆڕینەوەی زیانیارییەکان، بەشێوەیەکی گشتی خەڵکی هاندا لەگەڵ ڕوداوە هەنوکەییەکاندا کارلێکبکەن و ئاگاداری ڕوداوەکان بن و هەستی هاریکاری هاوبەش دەربارەی بەها مرۆڤایەتییەکان، بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەبکات. ئەمەش ئەو متمانەیەی بوژاندەوە کە دەکـرێ ڕۆڵێکی گشتی بێتەئاراوە و سنورێک بۆ شێوازە نا ئەخلاقییەکان و دەستبردن بۆ توندوتیژی

و جەنگ دابنێت. لەوانەیە ئەو رۆڵە گشتییە یاسایەکی دادپەروەرانەی جیهانی لێ بکەوێتەوە کە دەزگاکان و میکانیزمە گونجاوەکان، کۆمەک و پشتگیری بکەن، ئەمەش بۆ سەرخستنی مافەکانی مرۆڤ و بۆ چاودێریکردنی پەیوەندییەکانی نێوان کۆمەڵانی خەڵک لەسەر بنەمای ململانێی ئاشتیخوازانە و ڕێزگرتنی دوولایەنە و جڵەوکردنی توندوتیژی و کوشتن.
زەوتکردنی ئازادییەکانی مرۆڤ و پێشێلکردنی مافەکانی، سەرەتایەکی پێویستە بۆ کوشتن و سڕینەوەی بونیادە ئەخلاقییە مرۆییەکان. لە بەرامبەردا دامەزراندنی پەیمانێکی کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای دیموکراسی و سەروەری یاسا و ڕێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ، ئەو کەشوهەوا نمونەیەیە بۆ بنیادنانی پەیوەندییەکی ڕاست و تەندروست لەنێوان سیاسەت و ئەخلاقدا، کە تێیدا هەردووکیان، سیاسەت و ئەخلاق، پەنا بۆ سیستمێکی هاوبەش دەبەن کە هەردوکیان لەخۆبگرێت، لەوانەشە هەردووکیان تێپەڕێنێت. دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات و قۆرخکردنی و بەکارهێنانی لەپێناو بەرژەوەندی توێژێک یان گروپێکی سیاسی دیاریکراو لەسەر حسابی کۆمەڵانی خەڵک، پێویستی بە بەکارهێنانی چەوساندنەوە و ستمگەری و توندوتیژی هەیە، ئەمەش بۆ سەپاندنی ئیرادەیەکی سیاسییە لەسەرەوە بۆ خوارەوە، گوایە ئەو ئیرادە سیاسییە خێر و چاکەی گشتی تێدایە. لە کەشوهەوایەکی لەم شێوەیەدا، هەمو بەها ئەخلاقییەکان و سەرجەم ناولێنانەکان و وەسفکردنەکان، بە جۆرێک دادەڕێژرێن کە هەر بەرهەڵستکارێکی ئەم سیستمە یان ئەو سیستمەی دیکە، یان هەر دژایەتییەکی بەرژەوەندییەکانی ئەم ڕژێمە یان ئەوی دیکەیان، وەک شەڕێکی ڕەها وێنادەکرێت و شایەنی ئەوە نییە بە زیندویی لە ژیاندا بمێنێتەوە.
بە مانایەکیتر ستمگەری تەواوی نمونە باشەکان و تەواوی بەها مرۆڤانەییەکان هەڵدەگێڕێتەوە و ئاوەژویان دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەیە ئیمتیازات و بەرژەوەندییەکانی خۆی بەردەوامبێت و دەستکەوتەکانی بپارێزێت و ئەخلاقی ملکەچی و گوێڕایەڵی و فرۆفێڵ و دووزمانی گشتگیر بکرێت و بڵاوببێتەوە. لەم پێناوەشدا هەموو ئەو شتانە دێنێتە ئاراوە کە پارێزگاری لە دەسەڵاتەکەی دەکەن و بەرپەچی ئەو هەڕەشانە دەداتەوە کە گوایە ڕوبەڕوی دەبێتەوە. ئەمە وادەکات جڵەوی حوکمڕانی بێ ترس و سڵکردنەوە لە هەر سزا و لێپرسینەوەیەک بگرێتەدەست، ئیدی ژیان و کەرامەتی مرۆڤەکان، دەبنە شتێکی هەرزان و بە ئاسانی پێشێلدەکرێن.
کەواکبی پێش زیاد لە سەد ساڵ لەمەوبەر لە تێکستێکدا ئاماژەی بەو حاڵەتەداوە، ئەو تێکستەی کەواکبی تا ئەم چرکەساتەی ئێستاش زیندویەتی و گەرموگوڕی خۆی پاراستووە و دەڵێ: (ستمگەری کار لەسەر شتە خۆڕسک و سروشتی و ئەخلاقە باشەکان دەکات، ئیدی یان نایانهێڵێت یاخود خراپیان دەکات.. ستمگەری بەها ئەخلاقییەکان بەجۆرێک سەرەوژێر دەکات، ئەوەی داوای حەقی خۆی بکات بەد ئەخلاقە، ئەوەشی داوای نەکات گوێڕایەڵە. ئەوەی ناڕازییە و گلەیی دەکات گەندەڵە، ئەوەی هوشیار و زرنگە کافرە، ئەوەی گێل و دەبەنگ و نەفامە ساڵحێکی ڕاستگۆیە. ئامۆژگاری دەبێتە خۆتێهەڵقورتاندن، غیرە دەبێتە دوژمنایەتی، شەهامەت دەبێتە لەخۆباییبوون. هەروەها نیفاق دەبێتە سیاسەت، فرۆفێڵ و درۆکردن دەبێتە لێزانی، نەفسنزمی دەبێتە چاکەکاری، ڕیسوایی دەبێتە ڕوخۆشی. ئیدی ستمگەرەکان خۆیان فریودەدەن گوایە لە هەمو شتێک دڵنیان و چیتر هیچ ناڕەزایەتییەک و هیچ ڕەخنەیەک و هیچ ئابرۆچونێک لە ئارادا نییە).
ڕەنگە ئەو وشانەی سەرەوە، لێکدانەوەیەکی فراوانی ئەو قسانە بێت کە ئەرستۆ لە کتێبەکەیدا (سیاسەت) باسیلێوەدەکات. ئەرستۆ لەو کتێبەیدا باس لەو ستمگەرانە دەکات کە بەپێی حەز و ویست و ئەنگێزەکانی خۆی، دوور لە یاسا و بنەماکان حوکمدەکات. حوکمی

کەمینەیەک و حوکمی چەواشەکاری و بەرژەوەندی تایبەتی کە دوور و نزیک هیچ پەیوەندییەکی بە بەرژەوەندییەک لە بەرژەوەندییە گشتییەکانەوە نییە.
بە تەریبی لەگەڵ ئەوەی سەرەوەدا، خراپ نییە باس لە موفارەقەیەکی گەورە بکەین لەنێوان ئەوەی لەسەر هێتلەر دەگێڕدرێتەوە لەگەڵ وتەزا بەناوبانگەکەی تۆڵستۆیدا، دەگوترێ هێتلەر لەژێر سەریناکەیدا کتێبی (میر)ی مایکافیلی شاردوەتەوە، وەک ئەوەی بەو پەڕی دڵنایی و خۆشحاڵییەوە لەسەر وەسیەتە بەناوبانگەکەی مایکافیلی بنوێ: (الغایه تبرر الوسیله)و ڕێگا بەخۆی دەدات هەموو جۆرە ئامرازێکی ناشرین و قێزەون بۆ سوکایەتیکردن بە مرۆڤەکان و ترساندنیان بەکاربهێنێ. ئەمە هەمان چیرۆکی دیکتاتۆرەکانی دیکەیە لە نمونەی ستالین و مۆسۆلۆنی و فرانکۆ و ئەوانی تر. کەچی تۆڵستۆی لە وتە بەناوبانگەکەیدا دەڵێ: (خراپەکاری خراپەکاری ناکوژێت، وەک چۆن ئاگر بە ئاگر ناکوژێتەوە).
ڕەفتار و هەڵسوکەوتی هەندێ لە ڕابەرانی خەباتی ئاشتیخوازانەی مرۆڤدۆستانە، لە نمونەی غاندی و مارتن لۆسەر کینگ، لەوەدا سەرکەوتوبوون کە بە دەوڵەمەندی بەها ئەخلاقییەکانیان، ویژدانی خەڵکیان بەئاگاهێنایەوە و وایانلێکردن هیمەت و تواناکانیان بۆ بەرەنگاری زوڵم و چەوساندنەوە و ستمکاری بخەنەگەڕ. هەر ئەمەشە وای لە زۆر کەس کردووە بڵێ ئەگەر شێوازی ئاشتیخوازانەی گاندی نەبوایە کە لە پێناو ڕزگاری نیشتیمانی گرتیەبەر، ئەوا میللەتی هیند نەدەبووە خاوەنی وڵاتێکی دیموکراسی ڕزگارکراو.
لە ڕابردوییەکی نزیکدا هەرەسهێنانی نمونەی یەکێتی سۆڤیەت و بەرتەسکبونەوەی ڕۆڵی پاشکۆیەتی ئایدۆلۆژی و بڵاوبونەوەی فیکری دیموکراسی و بەهاکانی ئازادی و مافەکانی مرۆڤ، بوونە هۆی گەشەکردنی هەستێکی مرۆڤانەی گشتی، هەستێک حەز دەکات دادگایی شێوازەکانی ململانێی سیاسی و پێودانگە ئەخلاقییەکانی بکات. چیتر لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجێک یان لە پێناو بەدەستهێنانی مەبەست و مەرامێکی سیاسی، پەنابردن بۆ ئامرازگەلێک کە مرۆڤانە نییە یان نا دیموکراسییە، قبوڵ ناکرێت. ئەم مەسەلەیە یارمەتی دروستکردن یان پێکهێنانی هەڵوێستێکی جیهانی کاریگەری دا، هەڵوێستێک توندوتیژی ڕەتدەکاتەوە و ژیانی مرۆڤ و ئازادییەکانی لە چەقی هەموو بایەخدانەکاندا دادەنێت.
بەڵام ئەم هۆشیارییە شارستانییە، پێش ئەوەی بە تەواوی پێبگات و جێگیرببێت، زەبرێکی کوشندەی بەرکەوت، عەقڵیەتی توندوتیژی و هێز لەوەدا سەرکەوتوبوو کە توانی جارێکی دیکە مرۆڤایەتی پەلکێشی ڕابردووە پڕ ئازارەکەی بکاتەوە، پەلکێشی بکاتەوە بۆ ئەخلاقی پڕ جەنگ و کوشتن، بیباتەوە بۆ ئەو کەشوهەوایەی ڕێگە بە سەرجەم لایەنەکان دەکات هەموو شێوازەکانی تاوانکاری لە دژی یەکتر بەکاربهێنن. سەرلەنوێ ئەو لۆژیکە باڵادەستکرا کە دەڵێ لەناوبردنی خراپەکاری (الشر)-هەر لایەنێک ئەوی دیکە بە خراپەکار ناودەبات- نایەتەدی تەنها لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێز و توندوتیژی و بە هەمان شێوازەکانی خودی خراپەکاری نەبێت. هەر پراکتیککردنێک چەند نا ئەخلاقی و قێزەون و نەگریس بێت، ڕێگا پێدراوە، مادام سەرکەوتن بەدیدێنێت. ئەوەی جیهان دەریخست، وەک ئەوە وایە جیهان گەڕابێتەوە بۆ خاڵی سفر و بۆ یاساکانی جەنگەڵ، مەسەلەکە وا دەردەکەوێت وەک ئەوەی ڕزگاربوون لەو نەفرەتە ئەبەدییە مەحاڵ بێت کە ئەخلاق لە سیاسەت جیادەکاتەوە و ڕێگە بەمەی دواییانە دەدات پابەندی هیچ ئەخلاقێک و ویژدانێک نەبێت.
ڕەنگە گروپێک لە گروپەکان، باوەڕی بەوەبێت ئەو ئامرازانەی خەبات و تێکۆشان کە دژ بە دوژمنەکەی بەکاریاندەهێنێت، دوژمنێک پێیوایە خوێڕێژ و زاڵم و ستمگەرە، مافێکی ڕەوای خۆیەتی. بەڵام لەمڕۆدا



تۆڵستۆی



ئەرستۆ

مەسەلەکە گەرچی ئامانجی نەهێشتنی زوڵـم و چەوسانەوە و زامنکردنی مافەکان بێت، نابێت ببێ بە مەسەلەی تۆڵەکردنەوە یان پەرچەکردار یان ببێت بە مەسەلەیەکی تایبەت بە گروپێک یان ئاینێک، بەڵکو دەبێت مەسەلەکە پشت بە بنەما ئەخلاقییە مرۆڤانەییە گشتییەکان ببەستێت کە پابەندبوون پێیانەوە، لە بەرژەوەندی ئەوانەیە زوڵمیان لێکراوە و چەوسێنراونەتەوە، لە بەرژەوەندی هەموو مرۆڤایەتیە بۆ بەدیهێنانی مافەکانیان. لەوانەیە ئەوە قەدەری میللەتانی لاواز و دواکەوتوبێت کە پابەندی ئەو بنەما ئەخلاقییانەبن و لە پێناو ڕزگاری و ئازادیدا پەنا بۆ شێوازە ڕاست و دروستەکان ببەن کە لەگەڵ ئامانجەکانیاندا یەکدەگرێتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەیە یەکەمجار ئینسانیبوونی خۆی بباتەوە و بەشێوەیەکی باش ماڵەکەی توندوتۆڵ بکات، تا دواتـر جەنگە سیاسییەکەی بباتەوە، جەنگێک لە دژی دوژمنێک کە زۆرجار بە باشترین جۆرەکانی چەک خۆی پڕچەک کـردووە. کەواتە هیچ ئامانجێک چەند بەرز و بڵند و پیرۆزبێت، ناچێتە سەرەوەی مافەکانی مرۆڤ لە یەکسانی لە ژیانداو لە ئازادی و لە کەرامەتدا.

لێرەوە هەڵەیە ئامرازەکانی خەبات و تێکۆشان لە بەها ئەخلاقییەکانی خاڵیبکەینەوە و تەنها بە پێوانەی بەرژەوەندییە نیشتیمانیەکان یان چینایەتیەکان یاخود خێڵەکییە تەسکەکان بیپێوین، ئەگەرچی ئەو بەرژەوەندیانە بەرژەوەندی زۆر ڕەوا و دادپەروەرانەش بێت. ئامرازەکان و ئامانجەکان دوو ئەڵقەی پێکەوە بەستراون و هەر یەکێکیان مەرجی ئەوی دیکەیانە. بەدیهێنانی ئامانجێکی دادپـەروەرانـە، پێویستی بە هەڵبژاردنی ئامرازێکی ڕاست و دروستە کە خزمەت بە ئامانجەکە دەکـات و لەگەڵیدا گونجاوە. بەدەر لەوە، ئەوا مەسەلەکان بەشێوەیەک دەکەونەوە کە ئامانجەکە دەشێوێنرێت و دواجار بە شکستی خاوەن ئامانجەکان کۆتایی پێدێت. بەڵگەش بۆ ئەوە ئەو هەرسهێنان و شکستە مەترسیدارانەیە کە لە زیاد لە وڵاتێکدا دەبینرێت، ئەو وڵاتانە دەیانەوێ لە ڕێگەی پشتبەستن بە سەرکوتکردن و تیرۆرەوە، بگەن بە ئازادی و پرۆسەی بونیاتنانەوە.

بە مانایەکیتر ئامرازەکانی خەبات و تێکۆشان، خۆی لە خۆیدا بەهایەکی ئەخلاقییە، لە جیهانی ئەمرۆدا، جیهانی گوندە بچوکەکە، هەڵگرانی بەها

مرۆڤایەتیەکان، دەرفەتێکی زۆری سەرکەوتنیان لەبەردەستدایە، تا دوژمـن ناچار بکەن ملکەچی بنەماکانی ئەخلاق و یاساکان ببێت و وایلێبکەن پەنا نەباتە بەر بەکارهێنانی ئامرازەکانی کوشتن و شێوازەکانی توندوتیژی و وێرانکردن بخاتەلاوە. ئەوەی لەسەر ئازادیخوازان پێویستە بیکەن، ئەوەیە سەبر و بەرخودانیان زیاتربێت، تاکو جەنگەکە لە مەیدانی ئەخلاقیدا ببنەوە. ئەو سەبر و بەرخودانەیان ببەستنەوە بە هەموو شێواز و شێوەکانی ئامرازە دیموکراسییەکانی خەبات و تێکۆشان، وەک ڕێگایەکی سەرەکی بۆ دەرخستنی ئیرادەی گەل و پێداگیرییان لەسەر بەرەنگاربونەوەی زوڵـم و چەوساندنەوە و ستەمگەری.

لێرەدا ئەو دەستکەوتە ئەخلاقی و هیومانیستی و پاشان سیاسیانەمان بیردێتەوە کە ڕاپەڕینی بەرد بە سەبر و بە بەرخودانیان هێنایانەدی. ئەمەش بۆ ئەوەی وەڵامی هەموو ئەوانە بداتەوە کە پێیانوایە ئەم شێوازە لە خەبات و تێکۆشان، بەفیرۆدانی کات و قوربانییەکانە یان بانگەشەیەکە بۆ ملکەچکردن و تەسلیمبوون. کۆمەڵگاکانمان لە ململانێی سیاسیدا گیرۆدەی لۆژیکێکی تایبەت بوون کە لۆژیکی ئەو کەسانەیە خۆیان بە وەصی بەسەر خەڵک و نیشتیماندا دادەنـێـن. جەوهەری لۆژیکەکەشیان کێبڕکێیەکی تەندروست نییە بۆ هەڵبژاردنی باشترین کەسەکان لەپێناو بەڕێوەبردنی کۆمەڵگادا، هەروەها بۆ ئەوە نییە گوزارشتێکی تەواوەتی لە بەرژەوەندی هەموو چین و توێژ و پێکهاتە جیاواز جیاوازەکانی کۆمەڵگا بکات، بەڵکو لۆژیکەکەیان بۆ سەپاندنی پرنسیپی هێز و کەڵەگایی و ئامرازەکانی سەرکوتکردن و تیرۆرە. تا وایلێهاتووە هاوکێشەی باو لە پیادەکردنی سیاسەتدا، بریتییە لە پەنابردن بۆ چارەسەری ئەمنی و پێکدادان لەکاتی بوونی هەر حاڵەتێکی جیاوازی و ناکۆکی لەگەڵ کەسێک یان گروپێک لە گروپەکاندا و نە هێشتی ڕۆڵی ئەو کەسە لە ڕێگەی درۆودەلەسە و سوکایەتیپێکردن یاخود لە ڕێگەی سەرکوتکردن و زیندانیکردنەوە، تەنانەت لە ڕێگەی دەرکردن و سڕینەوەی و هەندێجار کوشتنی.

هەرچەند هەندێ مژدە هەیە ئاماژە بە گەشەکردنی ڕۆحێکی دەستەجەمی دەکـات دژ بە لۆژیکی باو، هەروەها ئاماژە بە دەرکەوتنی هەندێ پێودانگی تازە دەکات کە نەمانی ئەخلاق لە سیاسەت و شێوازەکانی سەرکوتکردن و سڕینەوە ڕیسوادەکات. لە بەڕێوەبردنی ناکۆکی و جیاوازییەکاندا، هانی پابەندبوون بە بەها مرۆییەکان و ڕێزگرتنی ئـەوی دی و بەکارهێنانی ئامرازەکانی گوزارشتکردنی ئاشتیخوازانە و مەدەنیانە دەدا. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هێشتا پێویستمان بە پرۆسەیەکی سیاسیو ڕۆشنبیری گـەورە هەیە، پرۆسەیەک ئاسۆی تـازە بۆ بـەرژەوەنـدی ژیـان و مافەکانی مرۆڤ، لەبەرامبەر لوتبەرزی بەرژەوەندییە تەسکەکان و حەماقەتی هێزدا بکاتەوە. پرۆسەیەک کار بۆ کردنەوەی پرۆژەیەکی ڕێنیسانسی تازە بکات تێیدا جێگای جیاکردنەوەی سیاسەت لە ئەخلاق نەبێتەوە. بێ ئەو پرۆسەیە زەحمەتە کۆمەڵگا عەرەبییەکانمان لەو حاڵەتە خراپە دەربێنین کە پێیگەیشتوون.

سەرچاوە: الاوان، ٢٣ تەموز، ٢٠١١



# قۆناغە سەرەتاییەکانی
# ئەخلاقی سەردەمی نوێ

# قۆناغە سەرەتاییەکانی ئەخلاقی سەردەمی نوێ

نووسینی: ڕازێل ئابیلسۆن
و. لە ئینگلیزییە چنوور فەتحی

پێدەچێت باشترین سەردەمانی دەرکەوتن و گەشەی فەلسەفە، ئەو سەردەمانە بووبێت گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان تێیدا بەخێرایی دەهاتنە ڕوودان، بینای فیکریی کولتوور دادەڕوخێ و پێویستیی پێداچوونەوە بە چەمک و پرەنسیپە بنەڕەتییەکان و پێوەری بەهاکان هەستی پێدەکرێ. سەدەی شازدە و حەڤدە کە سەردەمی هەرەسهێنانی فیۆدالیزمی سەدە ناوەڕاستییەکانە و بە ئازادیی پیشەسازیی سەردەمی نوێ گەشتە کۆتایی، چەشنی سەدەی چوار و پێنجی پێش زایین، خولی هەڵچوونی فەلسەفی بوو، لە هەردوویاندا سەدەی پێشوو بینەری نەمانی بیر و باوەڕی سوننەتییە و سەدەی دوایی، کات و ساتی بونیاندنانەوە و نۆژەنکردنەوەی ڕێک و بە دەستوورە. گەشەی بازرگانی و پیشەسازی، بینینەوەی ناوچە و شوێنی تازە، چاکسازیی کۆمەڵایەتی (ڕیفۆرماسیۆن)، شۆڕشی کۆپرنیکی و گالیلەیی لە بواری زانست و سەرهەڵدانی دەسەڵاتی بەهێزی دنیایی، خوازیاری کۆمەڵێک پرەنسیپی نوێن بۆ

**ڕای هۆبز سەبارەت بە مەیل و ئیرادە ڕێگەیەکە بۆ ڕەخساندنی پەیوەندی نێوان ڕێنوێنییە عەقڵییەکان و یاسا سروشتییەکان. ئەو خێر وەکوو (شتی دڵخواز) پێناسە دەکات و خواست یان مەیل وەکوو جووڵان بەرەو ئەو شتەی دەرەنجامی ڕەوتی ئاناتۆمیکاڵ یان هەوڵ و کارەکانی جەستەیە پێناسە دەکات**

ئاکاری تاکەکەسی و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی. سەدەی شازدەهەم (فرانسیس بەیکن) لۆژیک و مێتۆدولۆژیای ئێسکۆلاستیکی سەدە ناوەڕاستییەکانی تێکشکاند. (ئیراسمووس)، (لۆتەر) و (کالڤین) هاوکات کە هەوڵیان دەدا پەیوەندیی نێوان ئایین و ئەخلاق قایمتر بکەن، بونیادی ماسوولکەی یاسا شەرعییەکانی وەستاو لەسەر شەرعییەتی ئەخلاقیی کڵێسەی سەدە ناوەڕاستییەکانیان بەرەو نەمان دەبرد. (ماکیاڤیلی) پردی نێوان ئەخلاقی ئایینی و زانستی سیاسەتی دارمان. سەدەی حەڤدەهەم ئەرکی بونیادنانەوەی فەلسەفە کەوتە سەرشانی دیکارت، هۆبز، لایبنیتز، سپینۆزا و لۆک.

**هۆبز**

تیۆریی ئەخلاقیی نوێ بە هۆبزەوە دەستپێدەکات. سروشتناسیی گالیلۆیی، کەوتبووە ململانێی چەمکە سوننەتییەکانی ئاکام و گەڵاڵە و بەهای جیهانی بەرهەست کە لەلایەن دەسەڵاتی کڵێسەوە پشتیوانی دەکرا. ئەم زانستە تازەیە دوودڵیی خۆی بەرامبەر بە یاسای سروشت دەردەبڕی و گریمانە مرۆڤ تەوەرەکانی (ئەنترۆپۆمۆرفیک) لاهووتی بە پووچ و بێبایەخ وەردەگرت. پێوەری نوێی فرمانە ئەخلاقییەکان، لەباتی ئەوەی بە پێی گەڵاڵەی جیهانی سروشتی و یان ناوەڕۆکی کتێبی پیرۆز کە دەربڕی ئیرادەی خواوەندە، بە پشتبەستن بە مرۆڤ خۆیەوە ڕۆنرا، کە بنەڕەتەکەی یان لە بونیادی سروشتیی ئەودایە و یاخود لە ڕێککەوتن لەگەڵ هاوڕەگەزەکان و یانیش لەو دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییانەی خۆی بەدیهێناون. بەم چەشنە فەلسەفەی ئەخلاقیی سروشتگەرایی ڕێژەگەرایی کولتووری و زینەگەرایی هاوکات و لەیەک پشت لەدایک بوون.

هۆبز کە سەروبەندی جەنگی نیشتیمانی و نێونەتەوەیی لەدایک ببوو، پاراستنی ژیان بە ئامانجێکی بەرز و باڵا و دوامەبەستی کردە مرۆییەکان دادەنێ و بەرگری لە خود دەکاتە بەردی بناغەی سیستمی ئەخلاقی و سیاسیی بەرهەمی گەورەی خۆی واتە لۆیاتان. هۆگریی ئەو بۆ فیزیکی گالیلۆ و بڕوای بەوەی کە



هۆبز



ماکیاڤیلی

سەرجەم بوارەکانی مەعریفە دەتوانن بەپێی ئەم زانستە گشتییە دابرێژن (بە پەیرەویکردنی میتۆدی هەندەسەی ئۆقلیدۆسی) ڕەنگە گەیاندبێتیە ئەو قەناعەتەی کە دەستراگەیشتن بە یاسای بەرگری لە خود لە بایۆلۆژیا لە یاسای ئینرسی دەکات لە فیزیکی گالیلۆدا. هۆبز مرۆڤی وەکوو ئامێرێکی پێکهاتوو لە بەش و پاژی زۆر و لە حاڵی جووڵەدا وێنا دەکرد و هەوڵیدەدا یاسا ئەخلاقییەکان لە یاسای بەرگری لە خود هەڵێنجێنێ. بەهەرحاڵ هۆبز ئەم یاسای بە دوو شێوە داڕشتووە، کە یەکەمیان بریتییە لە بنچینەی زانستی ئەخلاق و دووهەمیان لە ڕاستیدا ڕەتکردنەوەی زانستی ئەخلاقە.

بە بڕوای هۆبز یاسای بەرگری لە زات، خۆی لە خەبتین بۆ دەستووری کۆمەڵایەتی لە ڕیگەی دامـەزراوە و چالۆکیە ئاشتی خوازانەکان و یان بەرامبەر بەم ڕەوشتەش لە دۆخی گرژی و لاقەبەرانەدا کە دەبێتە سەپاندنی هێزی تاک بەسەر هاوڕەگەزەکانیدا، نیشان دەدات. کەوابوو ئەو پرەنسیپی یەکەم و بنەڕەتیی خۆی لە دوو بەشدا ئاراستە کرد: یەکەم یاسای سروشت بەم ناوەرۆکەوە کە (دەبێ هەر کەس تا ئەو ئاستەی هیوا بۆ ئاشتی لە ئارادایە، هەوڵی بۆ بدات و تێبکۆشێ). دووهەم: ڕاستیی سروشت یان (مافی سروشتی) واتە (ئەگەر کەسێک نەیتوانی ئاشتی دەسـت بخات دەبـێ تێکڕای کـەرەسـە و پێداویستییەکانی جەنگ بەکار بهێنێ). بەڵام ئەوەی کە دەبێ کام یەک لەم دوو شێوازە لە بەرگری لە زات کەڵکیان لێوەرگیرێت بە بڕوای هۆبز دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ لە کۆمەڵگایەکی باش -دامەزراودا بژی یان لە دۆخی سروشتیدا. کە لە حاڵەتی دووهەمدا بۆی نیە چاوەڕوانیی هاوکاریی هاوڕەگەزەکانی بکات. کەواتە چەمکی یاسای ئەخلاقی لە ڕێککەوتن و بەڵێن و بەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتییەکاندا دێتە بەرکار. لە دۆخی سروشتیدا مرۆڤ مافی خۆیەتی هێزی بەسەر چ کارێکدا دەشکێتەوە ئەوە بکات.

هۆبز لە یاسای سروشتیی خۆی وەکوو یاسایەکی بنەڕەتی، چەن ڕێسای لاوەکیی دیکە دەردەهاوێژێ کە کەرەسەکانی پێکهاتن و بەردەوامیی کۆمەڵگایەکی ئاشتیخواز دەستەبەر دەکەن. یەکەم کەرەسە بریتییە لە ڕێککەوتن و ڕازیبوونی تاکەکان بە پاراستنی گرێبەست (پەیمان)ی کۆمەڵایەتی کە تێیدا ماف و

دەسەڵاتی تاکەکان بە هێزێکی باڵاتر دەسپێردرێت و ئەم سپاردنە ئەنجام ئاسایش و هێمنی تاکەکان گەرەنتی دەکات. کەواتە دەوڵەت بریتییە لەوەی کە ئەندامانی کۆمەڵگا خۆیان بە دەستی خۆیان لۆیاتانێکی دەستکرد ساز بکەن تاکوو ئاشتی و هێمنی بەهۆی ئەو دەسەڵاتەی هاوڵاتیان پێیان داوە، دابین بکات. کە یەکجار ئاشتی و ئۆقرەییەکی گشتیی وەها لە ڕێگەی گرێبەست یان زاڵێتییەوە باڵی بەسەر وڵاتەکەدا کێشا، ڕێسا ئەخلاقییەکانی دی، بەپێی تیۆریی هۆبز لە دەروونناسیدا، دێنە بەرکار. هۆبز بۆ ئەوەی کۆمەڵێک چاکەی وەک سازگاری و ڕێککەوتن، سوپاس و پێزانین، میانڕەوی، بەخشندەیی، گوێڕایەڵی و ڕێزگرتن لە مافی یەکسان بۆ هەمووان جێگەی خراپەکارییەکانی وەک ئیرەیی بردن، بەدگومانی، فیز و لووتبەرزی و دەستدرێژی بگرنەوە، یاسا سروشتییەکان وەکوو گەرەنتیکەری دەستووری کۆمەڵایەتی دەستنیشان دەکات.

عەقڵ و یاسا ئەخلاقیەکان: زاراوەی (یاساکانی سروشت)ی سەردەمی هۆبز دەبێ لە چەمکی سەدە ناوەڕاستیی (یاسای سروشتی) کە هۆبز بەرپەرچی دەدایەوە، بە توندی جیا بکرێتەوە. بە ڕای هۆبز چ سیستمێکی ئەخلاقی لە جیهاندا بوونی نیە و وەکیتر مرۆڤ خاوەنی چ هاندەرێکی سروشتیی دادوەری و بە پەرۆشی دیترانەوە بوونی نیە و مرۆڤ چەشنی دیکەی بوونەوەران ئامێرێکە پێکهاتوو لە چەندین بەش و پاژ کە بەپێی یاسای فیزیکیی کەرەسەکان بەردەوام لە جووڵە و بەریەککەوتندان و ڕووگە و خێرایی ئەم جووڵانەش تەنیا بە لەپێش بوونی هێزەکان دیاری دەکرێ. کەواتە عەقڵ لە مرۆڤدا ئەرکێکی پێسپێردراوە. یاسا ئەخلاقییەکان بەرهەمی عەقڵن و مرۆڤ بەهۆیانەوە لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی زەرەر و زیانی بۆ ژیانی خۆی هەیە و یان هەڕەشەی لەناوچوون لە کەرەسەکانی پاراستنی ژیانی دەکات، دوور دەخرێنەوە. هۆبز لە زیندەوەرناسیی ماشێنیی خۆیدا، عەقڵ وەکوو ڕەوتی میکانیکیی مێشک پێناسە دەکات کە بریتییە لە پچڕان و پەیوەست بوون یان گرێدان و دابڕانی ئەو بەشانەی نوێنەری شتەکان و چۆنێتییەکانن. بەم شیوە، پرۆسێسەکانی مەعریفە جۆرێکی تایبەتن لە پرۆسێسە فیزیکییەکان و لە ژێر کاریگەریی هەمان ئەو یاسایانەشدان. بەڵام لەم ڕوانینە میکانیکییەدا بۆ مرۆڤ هۆبز ناتوانێ (یان گران بتوانێ) تێبینی بۆ ئەو تایبەتمەندییە دەستوورییانە بێنێتەوە کە یاسا ئەخلاقییەکان لە یاسا سروشتییەکان جیا دەکاتەوە. ئەو لە سەرتاسەری باسەکەیدا، لە نێوان چەمکی ئەخلاق وەکوو لقێکی زانستی سروشتی کە ئاکاری میکانیکیی مرۆڤ وەسف دەکات و چەمکی پڕاوپڕ جیاوازی ئەخلاق وەکوو ڕای عەقڵانی لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ چۆناوچۆن لەگەڵ دیتران هەڵس و کەوت بکات کە وشیارانە بەر بە هاندەری دڕندەیی و لاقە بردنەکان بگرێت، دوودڵ و بە گومانە. هەردوو ڕەهەندی ململانێی نێوان عەقڵ و سروشت لەنێوان ئەفلاتوون و سوفستەکان، لە ئەندێشەکانی هۆبزدا بەدیدەکرێ و ئەویش شەرعییەتی کۆمەڵایەتی و هەم عەقڵی ژیر و دووربین وەکوو سەرچاوەی پێویستییە ئەخلاقییەکان ناو دەبات. چاکەی ئەخلاقی بریتییە لە پێڕەوی کردن لە عورف و یاسا، بەرامبەر بە لاقەبردنە سروشتییەکان کە مرۆڤ بۆ مانەوە لە دۆخی سروشتی بۆ دامەزراندن و بەدیهێنانی عورف و یاساکان بە دەستەوە دەدەن.

مەیل و ئیرادە: ڕای هۆبز سەبارەت بە مەیل و ئیرادە ڕێگەیەکە بۆ ڕەخساندنی پەیوەندی نێوان ڕێنوێنییە عەقڵییەکان و یاسا سروشتییەکان. ئەو خێر وەکوو (شتی دڵخواز) پێناسە دەکات و خواست یان مەیل وەکوو جووڵان بەرەو ئەو شتەی دەرەنجامی ڕەوتی ئاناتۆمیکاڵ یان هەوڵ و کارەکانی جەستەیە پێناسە دەکات. کاری عەقڵانی پێویستی بە ئیختیار

یان ئازادیی بۆ ئەنجامدانی کارەکان دژ بە خواستە جەستەییەکان نیە، چونکوو عەقڵانێتی یان ڕامان هەڵسانگاندن تاقە پرۆسێسی ناوینی سیستەمی دەماریی سەرەکین. ئیرادە هێزێکی بان سروشتی بۆ جڵەوکردنی خواست و مەیلەکان نییە بەڵکوو تەنیا دوا قۆناغی هەڵسەنگاندنە کە دەبێتە هۆی ڕوودانی کارە ئاشکرا و لە ڕووەکان و کەوابوو ڕەوتێکی دەمارییە کە لەژێر ڕکێفی یاسا سروشتییەکاندایە. لای هۆبز ئازادیی ئیرادە لە کاریگەریی هۆکار و هۆکردەیی، تێکەڵێکی بێمانایە لە چەمکەکان. ئازادیی بریتییە لە نەبوونی بەربەستی دەرەکی لە بەردەم ئیرادەدا. ئەوە تاک خۆیەتی کە ئازاد یان نائازادە نەک ئیرادەکەی. چونکە ئازادیی کەسەکان بریتیە لە دیاریکردنی کارە ئاشکرا و لە ڕووەکانی لەلایەن ئیرادەوە نەک (لەلایەن) هۆکاری دەرەکییەوە. هەر بۆیە، ئەم شرۆڤە میکانیکییە لە ئیرادە، لەگەڵ ئەو شرۆڤە زەینگەرایانەی ئەودا (هۆبز) لەمەڕ یاسای مەدەنی، کە هێزی ناچارکەری خۆی بەهۆی ئیرادەی سەپێنراوی هێزی باڵاتر (حاکم) وەردەگرێ. دژوار دەکەوێتەوە، شرۆڤەیەک کە گرژ لە چەمکە ئەرستۆیی و ئاوگۆستینیەکان سەبارەت بە ئیرادە وەکوو (هۆی یەکەم) نزیکی دەکاتەوە.

سروشتگەرایی و ناسروشتگەرایی: ڕامانی هۆبز لە تیۆریی ئەخلاقی نوێدا ئێجگار گرنگە. هۆبز بۆ ڕزگارکردنی زانستی ئەخلاق لە ئاستەنگییەکانی لاهووتی و ڕوانگەی مرۆڤخوازانەی لەمەڕ سروشت، بووە هۆی ئەوەی فەلسەفە ئاوڕ لەو بابەتانە بداتەوە کە لە سەردەمی سوکرات و سووفستەکاندا لە ململانیدا بوو لەگەڵیاندا و هەزار ساڵێک دەبوو ئەو برەو و ڕواڵەتەی پێشووی نەمابوو. ئەو هاوکات ئاستی دەرکیی پرسە ئەخلاقییەکانی گەیاندە بەرزترین پلە چونکە هەم سوودی لەو باوەڕەی مەسیحییەت دەبینی کە پرەنسیپە ئەخلاقییەکان هێزێکی ناچارکەریان هەیە و هەم چاکسازیی مێتۆد مەندی زانستیی بەیکین و گالیلۆ و دیکارت.

ئەگەر دەبوو زانستی ئەخلاق بکریتە پەیکەرێک لە مەعریفەی دڵنیا، پێویست بوو پشت بە یاسا عەینییە دەروونناسینەکان و بایۆلۆژیا ببەستێت نەک بە نەریت و هەست و شەرعییەتی ئایینی (کڵێسە). لەلایەکی دیکەشەوە، ئەگەر سروشت و وەسفی زانستیی سروشت لە ڕووی ئەخلاقییەوە بێلایەن بێت، دەبێ ئەخلاق بەرامبەر بە زانست و دوور لە هاوئاسۆیەتی لەگەڵ سروشت دابنرێت. ڕێک بە شێوەی زانستی سروشتی کە دەبێ دوور لە هاوئاسۆیەتی لەگەڵ بەها ئەخلاقییەکان بێت. لەم ڕووەوە پێویستە پرەنسیپە ئەخلاقییەکان وەکوو شرۆڤەی زەینی و مەیل (سۆزداری و خواستەکان) وەربگیرێت نەک وەکوو یاسای توێژینەوەی عەینی. ئەم بەراوردکارییە دوولایەنە تاکوو هەنووکە تەنگی بە فەلسەفە هەڵچنیوە. ئەگەر هۆبز نەیتوانی چارەسەری بکات و لەنێوی ببات لانیکەم وانەبوو کە بەردەوام بکەوێتە تەڵەی یەکێکیانەوە بەلکوو کەمێک کاریگەریی هەردوولای لەسەر بوو.

## شهوودگەرایانی سەرەتایی

ئەو کاردانەوەی دژ بە گەڕانەوەی هۆبز بۆ عەینییەتی بڕیار و حوکمە ئەخلاقییەکان هاتە ئارا کاردانەوەیەکی بێناوکۆ و کتوپڕ بوو. تیۆریی یاسای ئەخلاقی و تێگەیشتنی بۆ سروشت وەکوو سیستەمێکی ئەخلاقی لە فۆڕمێکی تازەدا، لەلایەن کۆمەڵێک توێژەری کامبریجیەوە پشتیوانی لێکرا. ئەم کۆمەڵە بەنێوی ئەفلاتوونیانی کامبریجەوە نێویان دەرکردبوو کە گرنگترینیان ڕاڵف کۆدوێرس و هێنری مۆر بوون. ئەمان لایان وابوو پرەنسیپی ئەخلاقیی کۆمەڵێک حەقیقەتی ڕوون و ڕاشکاوە و هێندەی یاساکانی بیرکاری دڵنیا و جێمتمانەن. ڕیچارد کامبیرلاند هەوڵیدا هەموو پرەنسیپە ئەخلاقییەکان پێکرا لە یاسایەکی سادەی

سروشتییەوە، کە دواتر بوو بە بناغەی ئەخلاقی سوودگەرایی، هەڵێنجێنێ، ئەو یاسایە دەڵێ: هەر کردەوەیەک دەبێ خێر و چاکەی گشتی بپارێزێ. نیکۆلا مالبرانش ئەخلاقی دیکارتی وەکوو سیستەمی هەڵینجان پەرەپێدا بەڵام تام و چێژی ئاوگوستینی پێبەخشی و خودای بە خاوەنی دەسەڵاتی گۆڕانی مەعریفەی حەقیقەتە ئەخلاقییەکان بۆ کردەوە دەزانێ. مالبرانش تێگەیشت کە شوبهاندنی ئەخلاق بە بیرکاری ناتوانێ پێوەندی نێوان ئەخلاق و کردەوەکان شرۆڤە بکات کەوابوو ئەم بۆشاییەی بە بڕوا بە (ڕەسەنێتیی پێگە) و دەستێوەردانی خودا پڕ کردەوە. ساموئێل کلارک تیۆرییەکی شهوودگەرایانەی لەسەر (ئایینی سروشتی) و (گونجان) تایبەتمەندییەکی زات کار و کردەوەکانە کە زەین دەتوانێ وەک پەیوەندییە هەندەسیەکان ڕاستەوخۆ بێناوکۆ دەرکی بکات.

## سپینۆزا

بەنەدیکت سپینۆزا ئەندامی بنەماڵەیەک لە پەنابەرە جوولەکەکان بوو کە بەهۆی جەور و ستەمی پشکنینی بیروڕاکانی کڵێسەوە روویـان کردبووە ئیسپانیا، لە هۆڵەندا لـەدایـک بـووبـوو و تـوانـای عەقڵ بۆ دەسەڵاتداریی کردەوەکان کە باوەڕی دیکارت بوو، لەگەڵ تیۆریی میکانیکیی هۆبز لەمەڕ دەروونناسی ئاوێتەی یەکدی کرد و ڕوانگەیەکی کردەوەیی بە نێوی (سیستەمی یەکگرتووی یاساکان لەمەڕ سروشت)ی گەڵاڵە کرد، ئەو لە کتێبەکەیدا بە نێوی ئەخلاقی ڕوون لەسەر میتۆدی هەندەسەیی، وەک هۆبز بەڵام بە وردبینی و ڕاشکاوییەکی زیـاتـرەوە پرەنسیپە فیزیکی، دەروونناسی و ئەخلاقییەکان لە پرەنسیپە چەسپاوەکانی مێتافیزیک وەرگرتوون. یەکەم تەوەری دەروونناسی لای سپینۆزا چەشنی هۆبز، وەک تەوەری فیزیکیی بریتییە لە بەرگری لە خود یان بەرگری لە زات و فیز و لووتبەرزی. بەڵام دەسکەوتی ناوازەی سپینۆزا ئەوە بوو کە شێوازێکی ژیانی عەقڵانی و مرۆیی و بێگەرد وەکـوو دەرەنجامی لۆژیکیی ئەم دەروونناسیە گەڵاڵە بکات. لەو ڕووەوە کە سپینۆزا لە مێتافیزیکدا پێڕەوی بێ ئەملا و ئەولای پێویستی زانستی یان تەوەری بنەڕەتی و لە ئەخلاقدا پێڕەوی سروشتگەرایی بوو، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەکرێ هەر ڕووداوێـک لە ڕووی هۆکارە پێشووییەکانیەوە هەڵهێنجرێ و ئەنجام دەیگوت ڕاستیی ئەخلاقی و پێویستیی هۆیەکەی یەکێکن. بەم چەشنە ڕێساکانی ئاکار هەمان یاساکانی سروشتی مرۆڤە کە هەمووان گوێڕایەڵین. بەڵام مرۆڤی خۆخواز کە کۆیلەی بێ کردەییەکانی خۆیەتی کوێرانە گوێڕایەڵیانە، لە حاڵێکدا مرۆڤی ئـازاد یاساکان دەرک دەکـات و پەسەندی دەکات. مرۆڤی ئازاد ئەو کەسەیە کە عەشقی عەقڵانی بۆ خواوەند کە پارێزەری بەختەوەری و چاکەیە، لە پێگەی بەدەستهێنانی بینایی بۆ دەستووری پێویستی هەموو شتەکان، ئەزموون دەکات.

لە حاڵێکدا کە سپینۆزا زۆر زیاتر و ڕێک و پێکتر لە هۆبز هەوڵیدا ئەخلاق بگەڕێنێتەوە بۆ دەروونناسی و ئەنجام بیگۆڕی بۆ لقێک لە زانستی سرووشتی، بیروڕای دیکە دژ بە باوەڕەکەی ئەو گەڵاڵە کرا و سیستەمەکەی شکستی هێنا. زۆربەی کات گوتراوە کە باوەڕەکەی ئەو خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە. چونکە ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ بەپێی خواست و ویستەکانی خۆی کردە بنوێنێ و ئەگەر چ شتێک بە شێوەی بەرهەست نە باشە و نە خراپ بەڵکوو تەنیا لە پێش چاوی ئەو کەسانەی پێویستیی ڕووداوەکـان دەرک ناکەن و لە ڕواڵەتدا وا خۆیان نیشان دەدەن لەم حاڵەتەدا پارێز و ڕێسا ئەخلاقیەکان چ مانایەکیان دەبێت؟ ئەگەر سپینۆزا وەک هۆبز بەها ئەخلاقییەکان لە سروشت جیا بکاتەوە، دەبێ دووبارە بیگەڕێنیتەوە بۆ ئاوەز و فامی مرۆیی. بەڵام فام و خۆوشیاریی مرۆڤ لەم حاڵەتەدا یان دەبێ هێزێکی بان سروشتی



جۆن لۆک

بێت و هەر وەک دیکارت ڕای لەسەر بوو دەستوور و ڕێکیی هۆکار و هۆکرد بشێوێنێت و یان بەشێک لە سروشت و لە ڕووی ئەخلاقییەوە بێ لایەن بێت کەوا بێت زانستی ئەخلاق بێمانا دەکەوێتەوە. یاخود ئەنجام ئاوەزی مرۆیی ڕەنگدانەوە و زایەڵەیەکی وەهماوی و ناواقیعییە. سپینۆزا و هۆبز هەردووکیان لە نێوان ئەو بەرامبەرکێییەی ئاماژەی پێدرا، ڕاڕایی و دوودڵ بوون، هەرچەن باوەڕی هۆبز بە مافی ئەخلاقیی ئیرادەیەکی باڵا و سەرچاوە، لەوانەیە ئەم وەهمە هەڵە دروست بکات کە ئەو بۆ هۆکارێکی بان سروشتی دەگەڕێتەوە.

هۆبز و سپینۆزا، لە بیروڕا کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیاندا، زیاتر بۆ جێبەجێ بوونی پێداویستیەکانی مرۆڤ و کەمتر لە ڕێبازی هاوئاسۆبوون لەگەڵ نەریتە ئایینیەکاندا، دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیان هەڵدەسەنگاند. بەڵام چەمکی دەسەڵات لای هۆبز وەکوو بنەڕەتی یاسا، بەرەو پشتیوانی و لایەنگری کردن لە زاڵێتی و دەسەڵاتداریی ڕەها پاڵی دەنا، کەچی ڕای سپینۆزا سەبارەت بە یەکگرتوویەتی و یەکبوونی بەها و ماف و خۆخوازیی عەقڵانی ناچاری کرد چەشنی جۆن لۆک پشتیوانی لە حکوومەتی وەستاو لەسەر نوێنەرایەتی و زۆرینەی ئازادیی تاکەکەسی بکات.

## جۆن لۆک

جۆن لۆک بەزۆری بە دامەزرێنەری فەلسەفەی سوودگەرایی دێتەناسین. چونکە بەکارهێنانی ئەخلاقی سوودگەرایانە لە بیروڕا کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیدا بە بڕشتتر و کاریگەرتر لە شیکارییەکانی بوو لەسەر پێوەری ئاکاری تاکەکەسی. ئەو مۆدێلی بیرکارییەی ئەخلاق کە لە لایەن دیکارتەوە پێشنیار درا و بیر و باوەڕی ئەفلاتوونیانی کەمبریج لە لایەن جۆن لۆکەوە تێکەڵ بە تیۆریی چێژگەرایی لە دەروونناسی کرا کە بەپێی ئەو چێژوەرگرتن ئامانجی سەرەکیی سەرجەم کار و کردە مرۆییەکان و ئەنجام پێوەری سەرەکیی بەهادانانەدانە. ئەو لە کتێبی توێژینەوە فامی مرۆڤدا تەوەری چەمکی خوو و خدەیی دیکارت و لایب نیتز دەخاتە بەر ڕەخنە و دەڵێ سەرپاکی مەعریفە مرۆییەکان لەسەر ئەزموون دامەزراوە. پاشان بە شێوەیەکی شپرز و دژوار ڕونکردنەوەیەک لەمەڕ زانستی ئەخلاق وەکوو زانستێکی بەراوردکارانە کە بەپێی ئەو ڕێسا پاڵەکییەکانی ئاکار لە (ڕستە ڕوونەکان، لە ڕێگەی دەرەنجامی پێویست وەک بنەبڕێتی دەرەنجامەکانی بیرکاری) وەردەگرێ، بە دەستەوە دەدرێ. ئەو هەوڵیداوە پارادۆکسی بیر و باوەڕەکانی بەم شێوەیە چارەسەر بکات کە هەڵبەت چارەسەریش نەکراوە. بەدیهاتنی چەمکی خێر و دادوەری بەهۆی هەستی چێژ و ناخۆشییەوە دەردەکەوێ و کەوابوو چەمکە ئەخلاقییەکان ئاکامی

ئەزموونن بەڵام پەیوەندیی لۆژیکیی نێوان ئەم چەمکانە دەکرێ بە شیکاریی تیۆریک بخرێتەڕوو.

لۆک وەک هۆبز خێر وەکوو شتێکی تایبەت بە مەیل پێناسە دەکات بەڵام دوایی بە گریمانی ئەوەی کە تەنیا تایبەتمەندیی ئەو شتانەی مەیل و خواستەکان دەورووژێنن بریتییە لە ڕاکێشەربوونیان بۆ بەرهەمهێنانی چێژ یان کەم کردنەوەی تاڵی و ناخۆشییەکان، خێر وەکوو (ئەو شتەی دەتوانێ چێژمان تێدا دروست بکات) پێناسە دەکات. ئەو دووبارە چەشنی هۆبز چاکەی ئەخلاقی وەکوو دەقاودەق بوون لەگەڵ نەریت و یاسا دەناسێنێ. بەڵام لە بڕوای بەوەی کە بەهای نەریت و یاساکان خۆیان بە ناوکۆی دوو هۆکاری بنەڕەتیتری ئەخلاق واتە سوودگەرایی و مافی سروشتی دیاری دەکرێن دژ بە هۆبز دەوەستێ. لۆک بەهۆی ئەم پێوەرە بنچینەییانەوە، حکوومەتی نوێنەرایەتی و ئازادیی تاکەکەسی ڕوون دەکاتەوە.

کاری سەرەکیی لۆک لێکدانەوە و شرۆڤەی مانای پرەنسیپە ئەخلاقییەکانە، لەو جیاکارییەی لەنێوان پرەنسیپی (کردەوەیی) و (تیۆریک)دا دایدەنێ. مەعریفەی تیۆریک سەربەخۆیە لە کردەوە، لە حاڵێکدا پرەنسیپە کردەوەییەکان (بۆ نموونە لەوانە، پرەنسیپی ئەخلاقی) تەنیا ئەو کاتەی مرۆڤ بەپێی ئەوان کردە دەنوێنێ، بۆیان هەیە وەکوو پرەنسیپی ڕاستەقینە بڕوایان پێ بکرێت و بناسرێن. ئەم جیاکارییە، هێزی بێ ئەملا و ئەولا و ناچارکەری پرەنسیپە ئەخلاقییەکان ڕوون دەکاتەوە و پێویستی هۆکارێکی بان سروشتی بە نێوی (ئیرادەی ئازاد) کە بتوانێ باوەڕ بگۆڕێ بۆ کردەوە، دەسرێتەوە. هەرچەن ئەم کێشەی لەگەڵدایە کە ئەگەر پرەنسیپە کردەوەییەکان، ڕستەی ڕوون و ئاشکران، چۆنە کە ڕەفتار و ئاکاری هەموو کەس بێ گیروگرفت بێ هەڵە نیە. لۆک وەک هۆبز گاڵتەجاڕانە چەمکی (ئیرادەی ئازاد) وەکوو چەمکێکی تەمومژاوی

کە خاوەنی مانایەکی دیار و ڕوون نیە، باس دەکات و بەم پرسیارە دەیشوبهێنێ کە : (ئاخۆ خەون خێرایە یان چاکە چوارگۆشە؟) بە بڕوای ئەو ئیرادە بریتییە لە هێزی بڕیاردانی زەین بۆ ئەنجامدانی کاروبارەکان و ئیختیار بریتییە لە کەڵک وەرگرتن لە بڕیارەکان و بەکارهێنانیان بە مەبەستی دەستڕاگەیشتن بە خواستەکان.

### تیۆری ویژدان (هەستی ئەخلاقی)

فەیلەسووفانی سەدەی حەڤدەهەم پەیوەندی نێوان خۆخوازی و ئەخلاقی بوون (بەپێی ئەخلاق کردەنواندن) لە ترس لە سزادان (لە جیهانی دیکە یان سروشتیی یان یاسایی)دا دەبینن کە دەبێتە هاندەری تاکەکان بۆ پاراستنی خود و لەبەر تەوەری خۆخوازی، بەپێی ئەخلاق ژیان بەسەربەرن. بەڵام لە ماوەیەکی کەمتردا دەرکەوت کە ئەم پەیوەندییە، ئەو کاتەی سوود و بایەخی چاوەڕوانکراوی کەسێک کە دژ بە (پرەنسیپە) ئەخلاقییەکان کردە دەنوێنێ، لە سزادانی شیمانەکراوی زیاتر بێت، تێکدەشکێت و، ئەگەر ئەخلاق بەپێی دەروونناسی بێت لەم حاڵەتەدا سروشتی مرۆڤ ناتوانێ ئەوەندەی لایەنگرانی تەوەری بەرگری لە خود دەڵێن، لاقەدەر و خۆتەوەر و خوازیاری چێژ بێت.

ئێرلی سێهەمی شافتزبێری و فرانسیز هەچسن لایان وابوو کە بەرپرسیارێتی و ئەرکی ئەخلاقی ڕەگی لە حاڵەتی خێرخوازانەی وەک عەشق و مێهرەبانیدا هەیە کە هێندەی لاقەبەرترین خواست یان ویستەکانی خۆخوازیی وەک ئیرەیی بردن و چاوچنۆکی و هانەی بەرگری لە خود، سروشتی و گشتین. وەکیتر (هەستێکی ئەخلاقی) لە مرۆڤدا بوونی هەیە کە تەنیا دەکرێ بەپێی ئەو کار و بارانەی پەیوەستن بە بەرژەوەندی و چاکەی گشتییەوە تێبینی بکرێن. ئەم هەستە ئەخلاقییە وامان لێدەکات چیدی دوای

چێژەکان نەکەوین و بەرەو بەجێهێنانی ئەرکەکانمان بۆ دیتران پەلکێشمان دەکات و ئەو ساتانەی فیداکاریی دوور لە خەڵات و پێزانینی ڕواڵەتیانە بەرز دەنرخێنن، ئەم بەرز نرخاندنە شرۆڤە و ڕاڤە دەکات. بێرنارد ماندوێل لە کتێبی چیرۆکی زەردەواڵەدا بەرامبەر بە ڕوانگەی ئەخلاق، لە دەروونناسیی سەقامگرتوو بوو لەسەر خۆخوازی و خۆتەوەرەیی بەرگری دەکات و چەمکی ئاوەزی ئەخلاقی وەکوو شێوەیەکی ڕیاکارانە بۆ پاراستنی جیاوەکە کۆمەڵایەتییەکان دەداتە بەر تانە و گاڵتەپێکردن.

ئـەم تیۆرییە کە دواتـر زایـەڵـەی لای (هۆڵباخ)، (مارکس) و (نیچە) بەدیدەکرێ. ئۆسقف جۆزەف باتلەر کە بانگەواز و وتەکانی سەبارەت بە بەرگری کـردن لە ئەخلاقی مەسیحی بەرامبەر فەلسەفەی کلیبی هۆبز و ماندویل، هێزی شیکاریی سەیری ئەو دەنوێنێ، بەڵگەی دەهێناوە کە خێرخوازی و ئاوەزی ئەخلاقی بە قەد خۆخوازی لە سروشتی مرۆڤدا ڕەگیان داکوتاوە. باتلەر وەکوو سەرچاوەیەکی ئەفسانەیی بەرپرسیارێتی ئەخلاقی، هەستی ئەرکی خستە سەر تەوەری خێرخوازی و بەم چەشنە ئەو بارستاییەی زانایانی سەرەتایی هەستی ئەخلاقی خستبوویانە سەر گرنگیی سۆزداری لەسەر دەستی ئەو کەم کرایەوە و قورساییەکی زیاتر کەوتە سەر گرنگیی حوکم و بڕیاری ئەخلاقی. تیۆریی هەستی ئەخلاقی ئەوساتەوەختەی بەهۆی دەیڤید هارتلی و ئادەم سمیتەوە ئەخلاقی سوودگەرایانە لە ئابووریدا هاتە بەرکار و دیسانەوە گەڵاڵە کرایەوە، لە نووسینەکانی (دەیڤید هیووم) لە تەواوترین شێوازی خۆیدا ئاڕاستە کرا.

## هیووم

دەیڤید هیووم چەشنی دەیڤید هارتلی و ئادام سمیت ئەخلاقی سۆزدارانەی ئاوێتەی تیۆریی سوودگەرایی سەبارەت بە خێر، کرد. باسی ئەخلاقیی هیووم لە بەشی سێهەمی نامیلکەی سروشتی مرۆڤ و کامڵتر لەویش لە توێژینەوە لەمەڕ پرەنسیپی ئەخلاقیدا هەوڵێکە بۆ دۆزینەوەی پرسیارە بان ئەخلاقییەکان، سەبارەت بە مانای خێر، ماف، دادوەری و چاکە. ئەم چەمکانە چۆناوچۆن و بە چ پێوەرێکەوە بە کەسەکان و کردەوەیان دەبەسترێنەوە؟ لە ڕووی نەفسییەوە مرۆڤ چۆن دەتوانێ ئەخلاق سەرەڕای خۆخوازی و بە بەرپەرچدانەوە و نەهێشتنی پەسەن و پەروەردە بکات؟ و بە چ جۆرە ڕێسایەکەوە ململانێ ئەخلاقییەکان پێچەوانەی حوکمێک و دژ بە حوکمێکی دی چـارەسـەر دەکـرێ؟ سـەرەڕای ئـەو ڕاشکاوی و وردبینییەی لە لێکدانەوەکەی هیوومدا بەرچاو دەکەوێت، لێکدانەوەی ئەو بەشێوەی ناخۆشیار و نائەنقەست لە پرسیارێکەوە گۆڕاوە بۆ پرسیارێکی دی، واتە لە پرسیار سەبارەت بە مانای چەمکەکانەوە بووە بە پرسیار لە هانە و هاندەرانی ئەم چەمکانە، گۆڕان و گواستنەوە یەک لە تایبەتمەندییەکانی تیۆریی هەستی ئەخلاقییە.

هیووم لێکۆڵینەوەی خۆی لەمەڕ بڕیار و حوکمە ئەخلاقییەکان بـە تـوێـژیـنـەوەی واتـای زاراوە ئەخلاقییەکانەوە دەستپێکرد. کە چ واقیعێکی بینراو یان پێوەندی لۆژیکی بۆ وەڵامی چەمکەکانی خێر و دادوەری و چاکەی ئەخلاقی نەدۆزییەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە ئاکام و دەستکەوتی زاراوە ئەخلاقییەکان دەلالەتی چۆنێتی یان پێوەندییەکان نیە بەڵکوو تیشک دەخاتە سەر ئەو هەستانەی بە بەرزنرخاندن و جەخت لێکردنەوە سەرهەڵدەدەن. بەشێوەیەک کە دەبێ لە هەستەکاندا بۆ واتای ئەم زاراوانە بگەڕێین نەک لە شت و کەرەسە دەرەکییەکاندا. ئێمە هەر بەو هۆوە کە شتێک بە (جوان) دەزانین هەرواش بە (باش) دایدەنێین و هۆی جوانی و باشیی شتەکان ئەوەیە کە هەموومان لەسەری کۆکین و پێی قایلین. ئەگەر بە شێوەی ڕاستەوخۆ شتێک پەسەند بکەین و یان ئەگەر

کەرەسەیەکی کارا بێت بۆ بەدەستهێنانی شتێکی پەسەندکراو بە شتێکی باش لە قەڵەم دەدرێت. چاکە ئەخلاقییەکان، ئەو چۆنێتییانەن کە مرۆڤ بۆ خۆی یاخود بۆ دیتران بە بایەخ و کارا دەکەن، چ چاکەی سروشتی بن وەک خێرخوازی و زەوق و بەهرە و وریایی و هزر و چ چاکەی دەستکردی وەک ڕاستیی و ڕاستگۆیی و دادپەروەری. لە حاڵێکدا دەرکردنی بڕیار سەبارەت بە ئەو بابەتانەی لە بەدیهاتنی چێژدا بەکەڵکن، چونکە بە پێی ناسینی واقیعە هۆیەکییەکانە، لەسەر دەستی عەقڵ دێتە ئەنجام. بەم حاڵەوەش، دەرکردنی ئەم حوکمانە بەهۆی ناوەرۆکی ئەخلاقییانەوە، لەسەر هەست و زەوق وەستاوە، چونکە ناسین و مەعریفەی عەقڵی بە تەنیا بۆ بەرزنرخاندن و سەرکۆنەکردنی ئەخلاقی، تەواو نیە. (سوودمەندی خۆی بە تەنیا بریتییە لە هۆگری بە ئاکامێکی تایبەت و ئەگەر ئاکام و دوادەرەنجام بە گشتی بۆ ئێمە بێلایەن و کەم تەرخەم بێت، ئێمە هەمان بێلایەنبوون و خەمساردیی بۆ کەرەسەکانیش هەست پێدەکەین. لێرەدا کۆمەڵێک هەستی دیاریکراو و تایبەت پێویستە بۆ ئەوەی خۆ دەربخەن).

کەوابوو بە ڕای هیووم دوو بوار یان دوو پێوەری بەهادانان بوونیان هەیە: سوود و هەست کە یەکێکیان بەرهەست و دەرەکییە و دەکەوێتە بەر هەڵسەنگاندن و جەخت کردنەوەی عەقڵانی و ئەویدی زەینی و تاکەکەسین. پێوەری دەرەکی و بەرهەست، مەخابن تەنیا بە نیسبەت بەها ناوکۆیی و کەرەسییەکانەوە دێنە بەرکار نەک پەیوەست بە ئاکام و دەرەنجامەکان. بە هەر چەشنە زەینی بوونی هەستەکان نابێتە هۆی ئەوەی لە دەستڕاگەیشتن بە بڕیارە ئەخلاقییەکان بێهیوا بین چونکە ئەو بێکردەیی و سۆزانەی ئەم هەستانە دەوروژێـنـن و چێژە ناکاوەکیەکان و جەختکردنەوەمان لە کردە زەینییەکان و ئەو بیرانەی لەلایەن دیترانەوە پەسەند دەکرێ، لای هیووم وەک باتلەریش ڕای لەسەر بوو، خواستێکی گشتییە لە سروشتی مرۆییدا.

## بەڵگەی ئەخلاقی و هاندەرە نەفسانییەکان

هیووم هاودەنگ لەگەڵ هۆبز و لۆک، کە بۆ ئاکاری ئەخلاقی بە ترس لە سـزادان تێبینییان ئاراستە دەکرد و تیۆرڤانانی سەرەتایی هەستی ئەخلاقی، کە بەرپرسیارێتیی ئەخلاقییان بە مەیل و ویستی خێرخوازانە شرۆڤە دەکرد، هاندەری دەروونناسانە، کە کاریگەریی لەسەر حوکمە ئەخلاقییەکان دادەنێت و زۆربەی کات بە دەمارگرژییەوە دیارییان دەکات و لەگەڵ بنەمای لۆژیکی یان بەڵگەی حوکمە ئەخلاقییەکان بە یەک دەگرت. هیووم لەم پێشەکییەوە کە: ئەگەر بەهۆی خێرخوازیی سروشتییەوە نەبایە ئێمە هێند بە پەرۆشی بابەتە ئەخلاقییەکانەوە نەدەبووین بۆ ئەوەی بڕیار و حوکمی ئەخلاقی دەربکەین، گەشتە ئەم ئەنجامە هەڵەی کە تاقە شتێک ئەم حوکمانە دەپارێزی لە هەستی پەسەند کردن یان پەسەند نەکردنی ئەم حوکمانەدایە. هیووم دەیهەوێ چاکەی ئەخلاقی یەکسان و هاوکێشی چۆنێتیی دەستکردی دادپەروەری بزانێت. دەستکرد لەبەر ئـەوەی کە دادپــەروەری تەنیا بۆ پاراستنی مافی خاوەندارێتیی تایبەت لە کۆمەڵگایەکدا کەڵکی لێ وەردەگیرێ کە خێرەکان نە کەمن و نە بە تەواویش زۆرن. گرنگیی پێڕەوکردنی تێر و تەسەلی یاساکان بۆ یەکڕیزیی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی ئـەوەی هەر چەشنە ڕیزپەڕدانێک بە نێوی داواکارییەوە، مەترسیدار و نابەجێ بکەوێتەوە. ئەنجام سـوودی دادوەریـی تـەواو و چڕ لە سوودی ڕیزپەڕەکان زیاترە. بەڵام هیووم تێگەیشت کە ئەم تێبینییە سوودگەرایانە کەم تا زۆر دەرهەستە گران بتوانێ هەستی بەرپرسیارێتیی ئەخلاقی لێکبداتەوە و بەرزنرخاندنمان بۆ ئەو کەسانەی خاوەنی کەسایەتیی ئەخلاقی هەرەباشن ڕوون بکاتەوە. کەوابوو ئەو ئەم

گەڵاڵەی بە یارمەتیی چەمکی (هۆگریی بێلایەن) کە هاوشێوەی (هەستی ئەخلاقیی عەقڵانی)ی باتلەر، پرایس و ڕید، تەواو کرد.
بە هەر چەشنە هیووم بـاوەڕی بە بوونی وزە یان بەهرەیەکی شاراوە نیە، چون بەرزنرخاندنی ئەخلاقی بێلایەن لای ئەو وەکوو ئاوێتەیەکە لە چۆنێتی سروشتیی هاوخەمی کردن لەگەڵ دیتران (هەست بە ڕەنجان کاتی بینینی ڕەنجی دیتران) و خووگرتن بە قایلبوون بە یاساکان لەبەر ئەوەی تەنیا هاودەردی کردنی ڕووت لەگەڵ دیتران لەوانەیە بەرەو نادادوەریمان ببات و بینین و خوێندنەوەی تایبەت بە سوودگەرایی ڕووت ڕەنگە تێکشکانی ڕێسا گشتییەکانی بەدواوە بێت. ئێمە لەسەر پرەنسیپی گشتیی ئاکار کۆکین و ئەو هەستی داکۆکی کردنە لە سەرەتاوە بۆ ڕزگاربوون لە ڕەنج یان دەستکەوتنی بەختەوەری و کامەرانیی ئەنجامی پێڕەوکردنی ئەم پرەنسیپانە هەمانە، دەیگوێزنەوە بۆ ئەم پرەنسیپانە. بەم چەشنە مانای بەرپرسیارێتی و ئەرکی ئەخلاقی و وزە یان بەهرەی جەختکردن و پشتڕاست کردنەوەی بێلایەن سەرهەڵدەدەن. لێرەدا هیووم دیسان لەو ڕەوتە هاندەرەی دەبنە هۆی ئەوەی چاکەی ئەخلاقی وەکوو وەڵامی پرسیار سەبارەت بە پێوەری پەسەند بکەین، وەسفێکی نەفسانی بەدەستەوە دەدات و ئەو پرسیارە ئەوەیە کە بەپێی چ پێوەرێک دەڵێین تاکەکان و کردەوەکان بەهای جەخت کردنەوەی ئەخلاقییان هەیە؟ ئەگەر یەکگرتوویی هاندەری نەفسانی و بواری لۆژیکی بە حەتمی گریمان بکەین ئەستەمە بتوانین لە نێوان حوکمی ئەخلاقیی ورد و ڕێک و پێک لەگەڵ (حوکمی ئەخلاقی) شپرز و شێواو جیاواز بکەین. هەنووکە چیدی ئەو پرسیارەی کە ئاخۆ ئەو کردەوەی لە لایەن ڕای گشتییەوە پەسەند کراوە، بە ڕاستی شیاوی ئەم پەسەند کردنەیە یان نا، تەنانەت گەڵاڵەش ناکرێ چونکە شیاوبوون پێشوەخت بە هەمان کردەوەی جەخت کردن دانراوە.

ئێختیار: هیووم لەمەڕ ئێختیار و بەرپرسیارێتیی ئەخلاقی بە شێوەیەکی قەناعەتهێنەر بەڵگاندن دەکـات کە بەرپرسیارێتیی ئەخلاقی پێویستی بە کاریگەرێتیی و هۆیەکیی هەڕەشەی سزادانە. هەروەها بەڵگاندنەکانی هۆبز و لۆکی پتەو کـردەوە بریتی لەوەی کە ئێختیار چۆنێتییەکی تایبەت بە ئیرادە نیە، بەڵکوو پەیوەندییەکە لە نێوان خواست، کردەوە و ئاقار مرۆڤ ئـازادە ئەو کاتەی کار و کردەکانی هۆکردی ویست و خواستەکانی خۆی بن و ڕووبەڕووی بەربەستی دەرەکی نەبنەوە، ئەمە تیۆرییەکە کە دواتر لە لایەن ویلیام جیمزەوە بە نێوی (جەبرگەرایی نەرم و کاڵ)ەوە ئاراستە کرا.

## شـهـوودگـەرایـی ئاوەزی گـشـتـی

شرۆڤەی زەینیی هیووم لە حوکمە ئەخلاقییەکان، کە لەگەڵ شهوودگەرایی ئاوەزی گشتیی تۆماس ڕید و ڕیچارد پرایس ڕووبەڕوو بۆوە و کەوتنە دژایەتی کردنی کە گوایە هەستی ئەخلاقی یان ئاوەز، کە ڕێگە بە مرۆڤ دەدا لە نێوان ڕاستی و ناڕاستیدا جیاکاری بکات، وەکوو تێکەڵێک لە سۆزداریی خێرخوازانە و شهوودی عەقڵانی لێکداوەتەوە. ئەم دووانە چەشنی باتلەر بەڵگاندنیان دەکرد کە پرەنسیپی ئەخلاقی پێویستی بە تێبینی سوودگەرایانە نیە، بەڵکوو وەها لە مرۆڤدا و بەناوەندن کە هێندەی خۆخوازی و چێژگەرایی سروشتن. تۆماس ڕید بەڵگەی دەهێنایەوە کە چۆنێتییە ئەخلاقییەکان وەک تایبەتمەندییە سروشتی (فیزیکی)یەکان ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە دەرک دەکرێن و کەوابوو لە کەرەسەی دەرەکیدا هاتوونەتە دی نەک لە هەستەکانی ئەو زەینەی حوکمەکان دەردەکـات. ئەخلاقیش چەشنی زانست خاوەنی بابەتێکی بەرهەست و دەرەکییە، بە چاوداخستن لەوەی کە پرەنسیپەکانی فەلسەفەی ئەخلاق ڕوون و دیارن و دەکرێ بە ناوکۆی (ئـاوەزی گشتی) بە

تەنیایی، بەو مەرجەی بەهۆی فەلسەفەی خراپەوە گەندەڵ نەبووبێتن، کەشف بکرێن. ڕید وەکیتر لە بەرگری کردن لە ئازادیی ئیرادە وەکوو بنەڕەتی بەرپرسیارێتیی ئەخلاقی، بەڵگاندنی کردووە کە ئێمە بە شێوەی دەروونی ئاگامان لە توانای خۆمان هەیە بۆ هەڵبژاردن لە نێوان باش و خراپە و هەڵبەت سەربەخۆ لە مەیل و خواستەکانمان.

## ڕۆشنگەری فەرەنسی

لە فەرەنسای سەدەی هەژدەهەم ڕامانی ئەخلاقی هاوتەریبی زانست ئەخلاق لە بەریتانیای مەزن پەرەی دەسەند، هەرچەندە فەیلەسووفانی فەرەنسیی ئەم خولە نەیانتوانی نەریتی بە سەقام و بمێنی وەک نەریتەکانی هاوچەرخە ئینگلیزەکانیان بێننە ئارا. هزر



ڕۆسۆ

و ڕامانی فەرەنسیی پاش سەدەی هەژدەهەم بەراورد بە ڕامانی ئەڵمانی و ئینگلیزی، نەختێ لە فەلسەفەی ئەخلاقدا دەوڵەمەند بوو. نووسەرانی فەرەنسی بەهۆی تێکەڵبوونیان بە پرسە سیاسییەکان، کاریگەریی وتەبێژی و بانگەوازیان وەکوو پێوەری بەهای فەلسەفی لە ئاستی باڵای ڕاشکاوی و بە بنەما دادەنا.

ڤۆڵتەر و ڕۆسۆ ڕێبەرایەتی ئەو شۆڕشەیان دەکرد کە دژ بە عەقڵگەرایی دیکارتی و هەربەو گرژییەش دژ بە خورافە سیاسی و ئاینییەکان هەڵدەگیرسان و فەلسەفەیان گۆڕی بۆ بیر و باوەڕ (ئایدیۆلۆژیا) بە شێوەیەک کە لە زمانی فەرەنسیدا ئایدیالۆگ بە هاوواتای فەیلەسووف لە قەڵەم دەدرێ. ڤۆڵتەر لە خەبات دژی ئایینگەرایی و کۆنەپەرستیدا لە نووسینەکانیدا کەڵکی لە چەکی گاڵتە و قەشمەری وەردەگــرت. لـەو نووسین و بەرهەمانە دەتوانین نێوی کاندید، زادیگ و کولتووری فەلسەفی بێنین. لە حاڵێکدا ڕۆسۆ بۆ هاندان و ورووژاندن و خەست کردنەوەی سۆزدارییە نەفسانییەکان لەبات بەڵگاندنی بنەبڕ و شیکاریی بێدەستوور لەسەر میتۆدی ڕۆمانێک بەرهەمەکانی دەنووسیەوە، دیدرۆ ئاستی ئەدەبیی نووسینە فەلسەفییەکانی گەیاندە باڵاترین و نەرمترین ئاست لە سەردەمی ئەفلاتوون بەولاوە و لە ڕۆمانەکانی خۆیدا ڕەخنەی لە بیر و باوەڕی ئایینی و ئەخلاقی گرێبەستی دەگرت. بەم حاڵەوەش سەرەڕای چۆنێتیی عەقڵانیی هەرە بەرز و باڵای پێگەی نووسینەکانی لە کولتووری ڕۆژئاواییدا، پێویستە بگوترێ کە ئەو بەرهەمانە چەمک و پرەنسیپی تازە و لەبەرچاویان تێدا نەبوو کە فەیلەسووفانی دوایی ئەخلاق بتوانن بیروڕاکانی خۆیانی لەسەر دامەزرێنن.

## ڕۆسۆ

بەرزنرخاندنی ڕۆسۆ بۆ خوو و خدەی سادە و سەرەتایی مرۆیی لە دوو توێی دوو وتاریدا کە (تێیاندا)، هۆگریی

دۆستانە و ڕۆحی هاوکاری و پەیوەندی دەگەڕاندەوە بۆ سروشتی خوو و خدەیی مرۆڤ و خواستە زیاڕۆییە تاکەکەسییەکانی بە کاریگەریی پڕ مەترسیی ژیارەوە گرێدەدا، ئەم تێبینیانە دەقاودەقی هێرشی لایەنگرانی بەریتانی (هەستی ئەخلاقی) هۆبز بوون. ڕۆسۆ پێچەوانەی هیووم (کە هاوڕێی بوو و لەویش زیاتر و گرژتر دژ بە بیروڕای گشتی دەوەستاوە) یاسا و نەریت بە لەمپەڕی قورسی بەردەم هاندەرە سروشتییەک دەزانێت و نەک میتۆدی عەقڵانیی ڕێنوێنی کردنی هەستی خۆخوازی بەرەو چاکەی گشتی. بەڕای ڕۆسۆ هەر تێبینیەک بۆ کۆنترۆڵی تاکەکان لەسەر دەستی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان هەبێت، ئەم ڕوونکردنەوە و تێبینییە هەمان بانگەشەی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانە کا ئامانجیان بەجێهێنان و دەستەبەرکردنی چاکە یان خواستی گشتییە واتە مەیل و خواستی زۆرینە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئاخۆ ئەم خواستانە خێرن یان نا. لە حاڵێکدا ڕۆسۆ لە (پەیمانی کۆمەڵایەتی) دا بە سوودی دەسەڵاتی هەمەکی و ڕاستێتیی شۆڕش بە هێز و بڕشتەوە بەڵگەی دەهێناوە، ڕێگەی بە بەکارهێنانی ئاکاری سەرکوتکەرانەی وەک سزای مەرگ بۆ بێباوەڕان داوە کە دەوڵەت دەبێ جێبەجێی بکات. چەمکی کەم تا زۆر سۆفیانەی (عیرفانی) سەبارەت بە دەوڵەت لای ڕۆسۆ، وەکوو سەرچاوەی ئرادەی گشتی، لە لایەکەوە ئیلهامی هەوڵ و خەبتینێکی زۆر بوو بۆ ڕووخاندنی سەڵتەنەتی ڕەها لە فەڕەنسا و هاتنە ئارای حکوومەتی نوێنەرایەتی، و لە لایەکی دیکەشەوە نیو سەدە دواتر لەسەر دەستی فیختە و سەدەیەک دوایی لەسەر دەستی لێنین بۆ پاساو دانەوەی حکوومەتی ڕەها و دیکتاتۆری گەڵاڵە کرایەوە.

هەرچەن عیرفانی ئایینی و ئایینی عیرفانی ڕۆسۆ و لە پێش بوونی هەستەکانی لە دوورئەندێشیی عەقڵانی لە ڕامانی ئەودا پێچەوانەی جەووی ڕۆشنبیریی گشتیی بوو، بەشی ڕۆسۆ لە فەلسەفەی ئەخلاقدا بریتییە لە پێداگرتنی لەسەر ئەوەی کە خواست و مەیلی خێر و شەڕ هۆکردی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانن. ئەو لەم تەوەرەدا هاوڕای مۆنتسکیو، ڤۆڵتەر و نووسەرانی ئینسایکلۆپیدیا کەوتبوو. ڕاست و درووست بوونی ئەم تەوەرە خۆی جێگای پرسیارە بەڵام بێگومان لە چاکسازیی دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکاندا کاریگەر بووە.

## مۆنتسکیوو

مۆنتسکیوو لە کتێبی ڕۆحی یاساکاندا چەمکی ڕێژەیی ئەخلاق و کۆمەڵێک پرەنسیپی سیاسی وەکوو چەمک و پرەنسیپی دامەزراوە لەسەر سوننەت و نەریتە گشتییەکانی کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان پێناسە دەکات. ڕۆحی یاساکان کۆمەڵێکە لە چالۆکی و کردەوە کۆمەڵایەتییەکان کە دەبێ یاسای نوێ بە پێی ئەم چالۆکییانە هەڵبسەنگێندرێن. دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا پویستە کاروبار و پێوەندی و دانووستاندنەکانیان دابەش بکەن بۆ ئەوەی بتوانن لە هەندێ ڕووەوە بەهاکانی سەڵتەنەت و لە هەندێ ڕووگەی دیکەوە بەهاکانی کۆماری لە کۆمەڵگای ئەورووپیدا تەواو بکەن. مۆنتسکیوو بە ڕەچاوکردنی بەهاکان وەکوو بەهای مێژوویی و واقیعی کۆمەڵایەتی لە باتی پرەنسیپی لاهووتی یان یاسای سروشتی، بە زانستی دانانی فەلسەفەی ئەخلاق و سیاسەت کە لەگەڵ ماکیاڤیلی و هۆبز دەستی پێکردبوو، پتەوتر کرد.

نووسەرانی ئینسایکلۆپیدیا: دیدرۆ و کلوود هلووسیووس و هۆلباخ تیۆرییەکانی ئەخلاقییان لە بینینی ماددەگەرایی سروشت هەڵێنجان کە لەسەر بەدواداچوونی خۆدتەوەرانەی چێژ وەکوو تەنیا هاندەری عەقڵیی کار و کردەکان وەستا بوو. بە بڕوای ئەوان کۆمەڵگایەکی یەکڕیز و ڕێک و پێک یان بە دەستوور کۆمەڵگایەکە دابین کردنی خۆشیی تاکەکەسی لە لایەن کۆمەڵگاوە ڕێگە پێدراو بێت. کە ئەخلاق بەرەوڕووی خۆخوازی دەبێت کێشەکە بۆ خەسارەکانی دامەزراو و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان و گەندەڵیی پەروەردە دەگەڕێتەوە نەک بۆ کەم

کوڕیی ئەخلاقیی کەسەکان. (واتە کۆمەڵگا دەبێ بە شێوەیەک نەخشەی بەها ئەخلاقییەکان بکێشێتەوە کە پێچەوانەی تەوەری خۆخوازی نەبێت) نووسەرانی ئینسایکلۆپیدیا و هاوکارانان لە وڵاتانی دیکە، لەوانە، بێکاریای فەیلەسووفی ئیتالیایی، تیۆریی ئەخلاقی سوودگەرایانەیان لە شەڕ و ململانێی سیاسیدا بۆ (دەستەبەرکردنی) حکوومەتی نوێنەرایەتی و یاسا و سزادانەکان گەڵاڵە دەکرد.

## کانت و ڕۆشنگەریی ئەڵمانی

هێرشی ڕۆشنبیری بۆ نەریت و شەرعییەت لەبەر بەرژەوەندیی عەقڵی تاکەکەسی لە فەلسەفەی کانتدا شێوە و شێوازێکی دژە سوودگەرایانەی لە خۆ گرت. سوودگەراکان عەقڵ و وریایی کردەوەییان کە بەدوای بەدەستهێنانی بەختەوەرییەوە بوو، بە یەک دەزانی. کانت بە هەر چەشنە مانای دیکارتی و لایب نیتسبی عەقڵی وەکوو مەعریفەی عەقڵانیی ڕاستییە رووتەکان بە میرات بۆ مایەوە. کانت لە داڕشتنی تیۆرییەکی ئەخلاقیدا کە بتوانێ ڕکابەری سەرەکی و ڕاستەقینەی سوودگەرایی بێت، داکۆکیی ئاوگۆستین لەسەر واتای ناڤۆکیی بەرپرسیارێتیی ئەخلاقیی، کە لەسەر دەستی باتلەر و پرایس و ڕید زیندوو کرابۆوە، تێکەڵ بە چەمکی عەقڵگەرایی مەعریفە کرد وەکوو دەزگا و سیستەمێکی هەڵێنجان و ئەنجامگیری. ئەو لە کتێبی ڕەخنەی عەقڵی پەتیدا هەوڵیداوە دەستنیشانی بکات کە زەین یاساکانی زانست هاوتەریبی کەرەسەکانی پەیوەست بە ئیدراک دەکات و بەم شێوە ئەم یاسا باسکراوانە بەهۆی قووڵبوونەوە و ڕامان لە بونیادی پێشووی مەعریفە، بە دڵنیاییەوە دێنە ناسین. لە ڕەخنەی عەقڵی کردەوەییدا هەمان شیکردنەوەی بۆ فەلسەفەی ئەخلاق بەکارهێناوە واتە ئەخلاقی لەسەر ئەو یاسا پێشووییانە دامەزرابدوە کە عەقڵی کردەوەیی بە هۆیانەوە، کار و کردەوەکان ڕێک و پێک دەکات. کانت لە حاڵێکدا کە بەرامبەر بە بیریارانی ئازادئەندێشی سوودگەرا، بەرگری لە ئیمانی ئایینی دەکرد، لەگەڵیان هاوباوەڕ بوو کە



کانت

ئەخلاق سەربەخۆ لە تیۆلۆژیایە و پێڕەوی ئەو نەریتە خوداباوەڕە بوو کە خودای وەکوو ئارمانج یان تەواوێتیی دڵخوازی زانست و ئەخلاق شرۆڤە دەکرد و نەک وەکوو سەرچاوەیەکی بان سروشتیی سروش و شەرعییەتی ئایینی. کانت لە گرنگترین بەرهەمی ئەخلاقی خۆی واتە کتێبی (بنەما میتافیزیکییەکانی ئەخلاق)دا وەکوو فەیلەسووفێک ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بۆ نواندنەوەی جیاوازیی نێوان پرەنسیپە

ئەخلاقییەکان و یاسا سروشتیەکان، خستۆتە گەڕ.
ئەم جیاوازییە دوو حاڵەتە: هەم لە مانای زەینیی ناچاریی پێمل بوون بە یاسا ئەخلاقییەکان، وەکوو کۆمەڵێک یاسای دژ بە یاسا سروشتییەکان کە هەرگیز لە بەرامبەریاندا هەست بە بەرپرسیارێتی ناکەین، و هەم لە مانای کردەوەییدا — واتە مانای ڕاسپاردن — یاسا ئەخلاقییەکان بەراورد بە مانای تیۆرک — واتە وەسفیی — یاسای سروشتین. هەر بۆیە ڕێسای ئەخلاقی بە شێوەی فرمان و یاسای سروشتی بە شێوەی (اخباری) بەیان دەکرێن.
کانت بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم جیاوازییە دوو ئاقاری مەعریفەیی دیاری دەکات کە لەگەڵ دوو بابەتی لە ڕووی میتافیزیکییەوە جیاواز، سەروکاریان هەیە. زانستی سروشتی بۆ نموونە دەروونناسی زانستی، ئەو بەشە لە یاساکانی سروشت دادەڕێژێتەوە کە زەین بە پێی تەوەری بنەبڕێتی هۆیەکی بەسەر ئیدراکدا دەیسەپێنێ. زانستی ئەخلاق (یاساکانی ئێختیار) کە بوونەوەرێکی عاقڵ کار و کردەوەکانی دەخاتە چوارچێوەیەکەوە و دەخوازێ بوونەوەرانی عاقڵی دیکەش بیناسن و گوێڕایەڵی بن، دیاری دەکات.
تێبینی هێنانەوە و ڕوونکردنەوەی ئەم ڕێساگەلە لەو ڕاستییە لۆژیکییەدا شاراوەیە کە عاقڵ بوون بریتییە لە کردەنواندن بە پێی ڕێسا گشتییەکان و ئەوەی کە ڕێسای ئەخلاقی ئەوەیە کە دەکرێ سەرجەم بوونەوەرانی عاقڵ بە شێوەی یەکگرتوو و ڕێک و پێک لەگەڵی کۆک بن. کەوابوو مرۆڤ مادام کە بوونەوەرێکی ئەخلاقییە بوونەوەرێکی عاقڵە و لەم مانادا ئازاد و خاوەن ئێختیارە و کە نائەخلاقی بێت دەبێت کۆیلەی مەیل و خواستە سروشتییەکانی. پاداشتی چاکە، بەختەوەری نا بەڵکوو شکۆ و ئێختیارە.
چاکەی ئەخلاقی: خێری باڵا: سیستەمی ئەخلاقیی کانت لەسەر سێ کۆڵەکە دانـراوە: تاقیکرنەوەی واقیعەکانی ئەزموونی ئەخلاقی، شیکردنەوەی لۆژیکی حوکمی ئەخلاقی و داڕشتنی پرەنسیپی میتافیزیکی کە پێش گریمانی حوکمە ئەخلاقییەکانن، وەکوو کۆمەڵێک پرەنسیپی جیاواز لە گشتاندنی زانستی.
کانت وەک ڕید لە بەشی یەکەمی کتێبی کۆڵەکەکاندا بەڵگاندن دەکات کە هزر و ڕامانەکانی فامی گشتی، ئەگەر بەهۆی مشت و مڕی فەیلەسووفانەوە گەندەڵ نەبووبێت بە دڵنیاییەکی تەواوەوە پێمان دەڵێ ئەرک و بەرپرسیارێتی شتێکە جگە لە چێژ و سوود، و چاکەی ئەخلاقی یان (ئیرادەی خێر) خێرێکی باڵایە سەرپاکی بەهاکانی دی ملکەچی ئـەون و بەهای ئەخلاقی بە ئەنجامی کار و کردەی تاکەکەسی یان بە خێرخوازیی سروشتی هەڵناسەنگێندرێ بەڵکوو پێوەری ئەو هەڵسەنگاندنە نیاز و نییەتی بکەرە لە پێمل بوونی بە یاسا ئەخلاقییەکان.
حوکم یان فرمانە ڕەهاکان: کانت لە بەشی دووی کتێبی کۆڵەکەکانی میتافیزیکدا هەوڵدەدا وێڕای لێکدانەوە و جیاکردنەوەی جیاوازیی لۆژیکیی نێوان سێ جۆر ڕێسا یان فرمان، تایبەتمەندیی فرمانگەرای یاسا ئەخلاقییەکان دەستنیشان بکات. (ئەم سێ جۆر فەرمانە بریتین لە:) ڕێسای تەکنیکیی پسپۆڕی، پەند و ئامۆژگاریی تایبەت بە دوور ئەندێشی بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری و ئەرکی ئەخلاقی. کانت بەڵگە دێنێتەوە کە تایبەت بە دوو جۆری یەکەم حوکمی مەرجداران کە ڕێنوێنی و ڕاسپاردەکانیان گرێدراوی خواست و ئارەزووەکانی بکەرە. ئەخلاقی سروشتگەرایانە، پەند و ڕاسپاردەکانی پەیوەست بە هۆشداری و دوورئەندێشی بە هەڵە لە باتی یاسای ئەخلاقی دەگرێت، چونکە ئـارەزووی بەختەوەری هێند گشتییە کە ئەو فرمان و بڕگانەی تایبەتن بە دەستڕاگەیشتن بە بەختەوەری بە ڕواڵـەت لە کۆمەڵێک یاسای ڕەها دەچن. بەڵام ئەم ڕێسا گشتییە کە (هەرکەس خوازیاری بەختەوەرییە) یاسایەکی

سروشتییە و نەک ڕێسایەکی سەپێنراو بەسەر کاروکردەوەکاندا و ئەگەری کۆمەڵێک یاسای ئەخلاقی پێویستی بەوە هەیە کە ئەم گشتاندنە دەروونناسانە هەڵگری ڕیزپەڕ بێت. لەبەر ئەوەی بەرپرسیارێتی ئەخلاقی داوا دەکات مرۆڤ بەختەوەریی تایبەتی خۆی و تەنانەت دڵخوازی کۆمەڵگاکەی خۆی بەخت بکات چ جای ئەوەی (بابەتی ڕەها) ڕەچاو نەکات.

بابەتێکی ئەخلاقی یاخود بابەتێکی ڕەها ڕێسایەکە بێ لەبەرچاوگرتنی چ دوادەرەنجامێکی دڵخواز، بۆ نموونە بەختەوەری، فرمانی ئەنجامدانی کارێک دەردەکات. کانت قایلە بەوەی کە بابەتی مەرجدار گرێدراوی سوودگەراییە بەڵام بەڵگاندن دەکات کە پێویستییە تایبەتیەکانی پرەنسیپگەلی ئەخلاقی تەنیا بە گشتێتیی پڕاوپڕ و بێسنووریانەوە و کەوابوو بە سەربەخۆییان لەهەر واقیعێکی پەیوەست بە سروشتی مرۆڤ، لێکدەدرێنەوە. دەبێ کارەکانمان بەهۆی خواستی عەقڵ و نەک بەهۆی ئەوەی پێداویستییەکانی مرۆڤ جێبەجێ دەکات، بەپێی یاسای گشتی بێت و خۆمان بەرامبەر بە گوێڕایەڵیی لە پرەنسیپگەلی ئەخلاقی بەرپرس دابنێین.

پێوەرە ئەخلاقییەکان تا چەند گشتی دەبن: وەڵامی کانت بۆ ئەم پرسیارە کە ئاخۆ دەکرێ ڕێسا ئاکارییەکان وەکوو پرەنسیپی ئەخلاقی ڕەچاو بکرێن؟ (نا)یە. ئەو لای وابوو کە بابەتێکی ڕەهای گشتی یان بنەڕەتی بوونی هەیە دەکرێ هەموو بەرپرسیارێتیی و ئەرکە ئەخلاقییەکانی لێ هەڵهێنجرێ. (تەنیا و تەنیا بەپێی ئەو تەوەرە کردە بنوێنە کە دەتوانی بیخەیتە چوارچێوەی یاسایەکی گشتییەوە). سەرپاکی فرمان یان ڕێسا تایبەتە ئاکارییەکان بۆیان هەیە بەپێی ئەم پێوەرە گشتییە بە ڕاست یان ناڕاست بژمێردرێن. ئەگەر گوێڕایەڵیی چڕ و پڕ لە ڕێسایەکی دیاریکراو یان مەبەستی سەرەکیی لە گەڵاڵەکردنی ئەو ڕێسا دژوار بن، وەک چۆن هەندێ جار لەمەڕ ئەو ڕێسا تایبەتیانەی لە هەندێ هەل و مەرجدا، ڕێگە بە دزی و درۆ و کوشتن دەدەن، (کانت تاڕادەیەک بە شێوەی بێدەستوور لەسێدارەدانی بەرز نرخاندوە) لەم حاڵەتەدا، ئەو ڕێسا باسکراوە ناتوانێ بەشێک لە کۆمەڵەی ڕێسا ئەخلاقییە ڕاستەقینەکان بێت. بەرامبەر بەمەش، ڕێسایەکی وەک (لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەت بمێنە) بۆی هەیە لە بنەڕەتدا و بێگومان پێڕەو بکرێت و کەواتە وەکوو ڕێسایەکی ئەخلاقی وەردەگیرێت. ئەم گشتێتی یان بەربڵاوییەی پێوەری ئەخلاقی کە بریتییە لە ئەگەری دەروونی یان لۆژیکیی پێویستیی پێڕەوکردنی ڕێسایەک بە کردەوە، (لۆژیکی بۆ ئەرکە بنەبڕەکان و دەروونی لەمەڕ ئەرکی گونجاو و شیاوی ڕێز) بێگومان گرنگترین و سەرەکیترینی ئەوەیە کانت پێشکەش بە تیۆریی ئەخلاقی کردووە. ئەم پێوەرە، (ڕێسای زێڕین) کە لە ئایینە مەزنەکاندا هاتووە، وردتر و ڕاشکاوانەتر خستۆتە بەرباس و لە سیستەمە تازەکانی تیۆریی ئەخلاقیدا بە شێوەی جۆراوجۆر کەوتۆتە ڕوو. لە سەردەمی کانت بەملاوە گەلێک نووسەر هەوڵیان داوە پێوەری گشتێتی یان گشتاندن هەڵگربوون بە شێوەیەک سەر لەنوێ دابڕێژرێنەوە کە بە تەواوی گونجاو و دوور لە ناڕەزایەتیی لۆژیکیی بێت بەڵام زۆر سەرکەوتوو نەبوون.

ڕەخنەیەکی زەقی دیکە کە بەرامبەر بەم ڕیسای کانت هاتووەتە ئارا بریتییە لەوەی کە هیچ کەس نایهەوێ هەموو ڕیساکانی تایبەتی کارێکی دیاریکراو بێ بوونی چ ڕیزپەڕیک بێتە جێبەجێ کردن. کەس نایهەوێ حەقیقەت بە تەواوی باس بکرێت تەنانەت لەو کاتانەشدا کە زیانێکی قورس لە حاڵی ڕووداندایە. بۆ نموونە ئەو ساتەوەختەی بکوژێک لە شوێنی قوربانی دەپرسێ بۆ ئەوەی بیکوژێت (چۆن ڕاستییەکەی پێ بڵێین؟) وەڵامی کانت خۆی بۆ ئەم ڕەخنەیە ئەوەیە کە لە حاڵێکدا کە ڕەنگە مرۆڤ لە ڕووی دەروونیەوە حەز ناکات لەم کاتانەدا ڕاستییەکان بدرکێنێ بەڵام بۆ

ئەوەی ئیرادە بکات واتە بخوازێ ڕاستیی شتەکە باس بکات و با ئەنجام چی دەبێ ببێ، چ پارادۆکسێکی لۆژیکی بوونی نیە.

ڕەخنەیەکی دیکە کە لە کانت دەگیرێ ئەوەیە کە کانت گریمان دەکات هەر ڕێسایەکی ئاکاری یان ڕێسا پێچەوانەکەی دەبێ یاسایەکی ئەخلاقی بێت و بەم حاڵەوەش ژمارەیەکی کەم لە ڕێساکان، ئەگەر هەر لە بنەڕەتەوە ڕێسایەک بوونی ببێت، هەن کە ئەوە دێنن بە گشتی لە شێوازی نەرێنی یان ئەرێنی پێڕەو بکرێن. کانت بەڵگاندن دەکات کە وەک چۆن ئەو کەسەی بەدوای ئامانجی خۆیەوەیە ئەگەر داوای لێ بکەین پەیمان بشکێنێ یان درۆ بکات ئەمە دەبێتە کارێکی پێچەوانەی مەبەستی خۆمان کەوابوو دەبێ داوای لێبکەین پەیمان نەشکێنێ واتە دەبێ بخوازین قەت پێچەوانەی مەبەستکردە نەنوێنێ. بەڵام هەر لەبەر ئەوەی مرۆڤ دەتوانێ یاسا و تێبینی بۆ هەموو یاسا پووچ و بێبەهاکان بێنێتەوە یاسای وەک ئەوەی کە هەرکەس بۆی دەکرێ جل و بەرگی گران لەبەر بکات، چونکە ئێمە ناتوانین و نابێ بە گشتی لەبەرکردنی پۆشاکی گران یاساخ بکەین. ڕەخنە و خەساری سێهەمی تیۆریی کانت ئەوەیە کە لەو حاڵەتەدا کە ئەرکە ئەخلاقییەکان بە ئاشکرا تووشی کێشە و خەسار دەبن و مرۆڤ دەبێ لەبەر قازانجی دیتران فیدا بێت، بۆ ئەوەی کە دەرکەوێ حەق و حەقیقەت چیە، چ بوارێک نارەخسێنێ. لەم ڕووەوە ئەخلاقی سوودگەرایی بە ئاشکرا لە پێش ئەخلاقی کانتەوەیە.

سەربەخۆیی ئیرادە: سێهەم بەشی تیۆریی ئەخلاقیی کانت بریتییە لە گوزارشتی میتافیزیکی پێوەندیدار لەگەڵ ئیرادەی عەقڵانی وەکوو سەرچاوەی کارێکی بەدەر لە هەرێمی پێویستیی هۆیەکی و لێرەشەوە چۆڵ بوونی لە توێژینەوەی زانستی. کانت دەڵێ سەربەخۆیی ئیرادە – واتە بەهرەی پێمل بوون بۆ ئەو یاسایانەی بەهۆی مانای خۆیەوە بەدیهاتوون، بەرامبەر بە یاساکانی سروشت – پێویستییەکی زەرووره بۆ هەرچەشنە سیستەمێکی ئەخلاقی. چونکە ئەگەر کار و کردەی ئێمە ئەنجامی پێویستی هۆکارە سروشتییەکان بایە، بەهادانانی ئەخلاقی بێسوود دەبوو. (دەبێ) دەلالەت دەکاتە سەر (توانین)، واتە ناچاربوون بۆ ئەنجامدانی ئەوەی حەق و ڕاستە، کە دەلالەت دەکاتە سەر توانایی ئەنجامدان و ئەنجام نەدانی. لەبەر ئەوەی زانست لەسەر تەوەری ڕێکخەری بنەبڕێتی گشتی وەستاوە، چ هۆیەکی زانستی ناتوانێ بانگەشەی ئازادیی ئیرادە بکات. بەڵام ئەمە تەنیا جیاوازیی بنچینەیی ئێوان زانست و ئەخلاق و بێسوودبوونی هەوڵدان بۆ هەڵێنجانی ئەخلاق لە دەروونناسی دیاری دەکات. مرۆڤ وەکوو بابەتێک لە توێژینەوەی زانستی دیاردەیەکی ئۆرگانێکە کە لە یاساکانی زیندەوەرزانی و دەروونناسی پێڕەوی دەکات. بەڵام مرۆڤ وەکوو بابەتی بەهادانانی ئەخلاقی بوونەوەرێکی زاتییە کە دەتوانێ بە ئێختیار، گوێڕایەڵی حوکمەکانی عەقڵی کردەوەیی بێت یان گوێڕایەڵیان نەبێت. کانت لەم واتا دوو لایەنەی مرۆڤەوە، وەکوو دوو لایەنی ناوەکی و دەرەکیی سروشتی ئەو، ڕێبازی دڵخوازی ژیانی مرۆڤ، کە پاکی و ئیمانی بۆ (گەیشتن) بە تەواوێتی دەورووژێنێ، دیاری دەکات. مرۆڤ وەکوو بوونەوەرێکی بکەری عاقڵ ئەندامێکە لە (هەرێمی دەرەنجامەکان) کە لەم هەرێمەدا هەم حاکمە و هەم حکوومەتی بەسەردا دەکرێت و بۆ خۆی و دیتران یاسا دادەنێ. باڵاترین ئامانجی ژیانی مرۆڤ ئەوەیە ئەم (هەرێمە) دڵخوازە لە کار و کردە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکانیدا بێنێتە بوون.

سەرچاوە: مێژووی فەلسەفەی ئەخلاق، کۆمەڵێک نووسەر، وەرگێڕانی چنوور فەتحی، دەزگای توێژینەوەی موکریانی - ٢٠١٠

# به گوێی دڵ ببیستن،
# بەچاوی دڵ ببینن

نووسینی: ئۆشۆ

و. لە فارسییەوە/ جەواد حەیدەری

مرۆڤی ئەم سەردەمە لە تاریکێکی ڕەهادا نوقم بووە، وەک ئەو ماڵەی لێهاتووە لە شەوێکی تاریک دا چراکەیان کوژاندبێتەوە و تاریکی باڵی بەسەردا کێشابێت، هەڵبەت دەکرێت جارێکی تر چراکە داگیرسێندرێتەوە. مرۆڤی ئەم سەردەمە وەک کەشتییەکی لێهاتووە کە لە ناو دەریایەکی پان و بەرین و بەربڵاودا سەری لێشێوابێت و ڕێگای لێ ون بووبێت، مرۆڤی ئەم سەردەمە هەموو ڕێگاکانی خۆشبەختی و ڕزگاربوونی لێ بزر بووە و نازانێت چی دەوێت و بەرەو کوێ هەنگاو دەنێت، بەڵام دەتوانێت ئەوەی ونی کردووە دووبارە بیدۆزیتەوە و لە خەو هەستێت و ئەوەی فەرامۆشی کردووە و لە بیریچۆتەوە دووبارە لە مێشک و زەینی خۆیدا بێداری کاتەوە و بەدەستی بهێنێتەوە.

من بۆیە بانگی ئێوە دەکەم بۆ ئەوەی ئێوە لەو خەوە هەستێنم، ئێوە نابینن و نازانن کە ژیان چۆن بێتام و بێسوود و بێکەڵک بووە؟ نابینن کەچەند هیوابڕاو



ئۆشۆ

**لە ڕاستیدا ئێستا ئێمە خۆمان بە شتێکی زیاد دەبینین و خۆمان بەسەرباری ئەوانی تر دەزانین. پێمان وانەبێت کە ژیان شتێکی بێسوود و بێکەڵکە و بە کاری هیچ نایە، کامیل بوونی ژیان قەت کۆتایی نایە.**

و بێتاقەت، ماندوو وهیلاکن؟ ژیان ئامانج و واتا و چەمکی خۆی لەدەستداوە.

ڕوون و ئاشکرایە ئەگەر لە دڵی مرۆڤەکان ڕووناکی و نوور نەبێت، بێ گومان نائومێدی و بێ هیوایی داوێنی هەموو لایەک دەگرێت و باڵ بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا دەکێشێت. وەختێکیش لەناو دڵی مرۆڤدا ڕووناکی نەبێت هیچ شادی و خۆشییەک ژیانی ئەو داگیرناکات و ژیانێکی ساردوسڕی دەبێت.

لە ڕاستیدا ئێستا ئێمە خۆمان بە شتێکی زیاد دەبینین و خۆمان بەسەرباری ئەوانی تر دەزانین. پێمان وانەبێت کە ژیان شتێکی بێسوود و بێکەڵکە و بە کاری هیچ نایە، کامیل بوونی ژیان قەت کۆتایی نایە. بەداخەوە ئەو ڕێگایەی کە ئێمە بە ئامانج دەگەیەنێت لێمان بزر بووە، ئەو ڕێگایەی کە دەبێ ئێمە بەرەو کامیل بوون ببات لە بیرمان چۆتەوە و فەرامۆشمان کردووە. ئێمە تەنها هەین دەنا کارێکی ئەوتۆمان بە ژیان نییە، لە ڕاستیدا کارمان بە ژیانی ڕاستەقینە نییە، ئێمە تەنها هەین هەر ئەوەندە. ئێمە زۆر بە سادەیی ژیان لە کیس خۆمان دەدەین، ژیان زۆر بە سادەیی و سانایی دەسوتێنین و لەناویی دەبەین، ژیان تەنها ئەوە نییە لە بیری مردن و چاوەڕوانی لەناوچوون بین. کە واتە چۆن دەبێ لە بیری مردندابین و هاوکاتیش هیوابڕاو و نا ئومێد نەبین و ورە لە دەست نەدەین و نیگەران و پەشۆکاو نەبین؟ چۆن لە وەها ژیانێک کە زۆر بە خێرایی تێدەپەڕێت چاوەڕوانی خۆشی و شادی لێبکەین؟

مزگێنیتان دەدەمێ کە ڕێگایەک بۆ وشیاربوونەوە و دەربازبوون لەو دڵەڕاوکێ و نیگەرانی و پەشێوییە هەیە. ئێوە دەتوانن لەو خەوە بێزارکەر و هیوابڕە ڕزگارتان بێت، دەبێ دەتوانن لەو ژیانە پڕ لە هەڵەیە دەربازتان بێ. ئەو ڕێگایەی کە ئێوە لە تاریکییەوە بەرەو ڕووناکی دەبات، ڕێگەیەکی هەمیشەییە کە

قەت لەناو ناچێت. ئەو ڕێگایە  هەمیشە هەبووە و ئەوە ئێمە بووین کە ڕووی خۆمان لێوەرگێڕاوە و پشتمان لێ کردووە و چاومان لێنەکردووە. ئەخلاق گەراییەکی پاک و بێگەرد و دیانەتێکی پاکی دەروونی تەنها ڕێگای ڕزگارکردنی مرۆڤە، ئەو مرۆڤەی کە دوورکەوتۆتەوە لە ڕەوتی سروشتی ژیان.

ئەگەر گەرەکتانە بزانن کە چ شتێک ڕەوشت و ئەخلاق و دیانەتی دەروونی مرۆڤەکانی بە لاڕێدا بردووە، ئەگەر تامەزرۆی بینینی ڕووناکی ژیان و خۆشییەکانی ژیانیت، بانگهێشتەکەی من قەبوڵ بکەن. بۆ ئەوەی ژیانێکی پڕ لە ڕووناکی و خۆشیی ببینن چاوەکانتان بکەنەوە. پێویست ناکات کەسی تر زەحمەت بدەن و باری خۆتان بخەنە سەر شانی کەسێکی تر ، بەڵکو تەنها لە خەو هەستن و سەیر بکەن. لە ڕاستیدا ئەگەر چاوەکانتان لەبەرامبەر ئەو ڕووناکی و خۆشیانە داخەن، ئەوا تاریکی سەرتاپای ئێوە دادەگرێت و لە تاریکی دا نوقم دەبن.

چاوەکانتان بکەنەوە و پێ لە قەڵەمڕەوێکی نوێ بنێین و شکست و سەرنەکەوتن بگۆڕنەوە بە سەرکەوتن، تاریکی بگۆڕنەوە بە ڕووناکی و مردن بکەن بە نەمریی. وەرن هاوڕێ و هاوسەفەر و هاوگەشتی من بن، من دەمەوێ لەو عەشقە خواییە شەریک و برا بەشی ئێوە بم. هەر ئەندازەی ئەو عەشق و خۆشەویستییە پەرە پێبدەین زیاتر گەشە دەکەین. سەروەت و سامانە ڕاستەقینەکان کاتێک دابەشبکرێن، ڕێژەکەی زیاتر و زۆرتر دەبێت و کەم ناکات و بە پێچەوانەوە زیاد دەکات.

عەشق، عەشق دێنێت و خۆشەویستی خۆشەویستی لێدەکەوێتەوە و  نەفرەتیش نەفرەتی لێ شین دەبێ. هەر شتێک بدەین هەر هەمان شت وەردەگرینەوە و هەرچی بکێڵین هەر هەمان شتیش دەدوورینەوە،



ئەمە یاساییەکی هەمیشەیی و نەگۆڕە. تۆ ئەگەر دڕک و داڵت بە دیاری دا بەکەسێک، ناتوانی چاوەڕەوانی گوڵی لێبکەی، هەر شتێک بدەی بە کەسێک هەمان شت وەردەگریەوە.
من لە چاوەکانی ئێوەدا چرۆکردنی گوڵەکانی عەشق و خۆشەویستی و ئاشتی و ئارامی دەبینم. عەشق هەموو دڵەکان پێکەوە گرێدەدات و دەیانکات بە یەک، عەشق یەکریزی و یەکگرتوویی بنیات دەنێت. جەستەی فیزیکی لە یەکتر جیادەکاتەوە بەڵام عەشق و خۆشەویستی و یەکبوون پێکەوە دەلکێنێت. کاتێک گڕ و تینی یەکبوون و یەکگرتوویی هاتە گۆڕێ، ئەو کات مرۆڤ لە هەمووشتەکان تێدەگات و دەتوانێت لەسەر هەموو شتێک قسە بکات. پەیوەندی ڕوحی و گیانی تەنها لە ڕێگای عەشقەوە مسۆگەر دەبێت و سەر دەگرێت. ئەوەی من باسی دەکەم و ئەوەی ئێوە دەبیستن، هەمووی لە ڕێگەی عەشقەوەیە. هەمیشە دەرگاکانی دڵ بۆ عەشق کراوەیە. لەبیرتان بێت ئەوە دڵە شتەکان دەبیستێت نەک گوێ، ئەو کاتە تۆ شتەکان بە باشی دەبیستی کەبەدڵ گوێت لێ گرتیبێت. ڕەنگە بە لاتانەوە سەیر بێت و پرسیار بکەن جا شتی وا چۆن دەبێت؟ مرۆڤ بە دڵ ببیستێت؟ بەڵێ من دەڵێم ئەگەر شتێک هەبێ بۆ بیستن ئەوە دڵە دەبیستێت نەک گوێ، چونکە سەرەکان (بەرد)ن و گوێچکەکان هەموویان کەڕن. تەنها گوێچکەی دڵ بە باشی شتەکان دەبیستێت. هەر لە کۆنەوە وتوویانە: ئەو قسەیەی لە دڵەوە بێ لەسەر دڵیش دەنیشێت. ئەو قسەیەی کە لە ناخی دڵەوە بێت و بەڕاستی قسەی دڵیش بێت، وەک گوڵێک وایە کە بۆن و بەرامەی خۆی بڵاودەکاتەوە. ئەگەر دەرگاکانی دڵتان بخەنە سەر گازەرەی پشت، ئەگەر دەرگای دڵتان بکەنەوە، ئەوکات پەیوەندی دروست دەبێت کە پەیوەندییەکی ڕوحی و گیانییە کە تێیدا وشەکان کەمترین دەسەڵات و هێز و توانا و ڕۆڵیان هەیە، لەو کاتەدا زۆر شت هەیە بێ ئەوەی وشە تێیدا بە کاربهێنرێت و بە زمان بوترێت قابیلی تێگەیشتنە. لە ڕاستیدا ئەوە عەشقە واتا و مانا بە وشەکان دەبەخشێت. وشەکان خۆیان سیمبولی بێهێزی و بێ توانایین، ئەوە عەشقە گوڕ و تینیان پێدەبەخشێت . ئەگەر بە مێشکێکی ئارام و لەسەرخۆ و هێدی گوێ لەو وشانە بگری کە عەشق هێزی پێبەخشیون، ئەوە لە واتا و مانا دڵنشینەکانیان تێدەگەین. ئەوجۆرە لە بیستن پێدەڵێن بیستنی دڵ، یانی تەنها دڵ دەیبیستێت.
بەداخەوە ئێمەی مرۆڤ کاتێک گوێ لە کەسێک دەگرین، مێشکمان ئاسودە نییە و هاوکات لە بیروهۆشی بۆچوونەکانی خۆماندان و لە ڕاستیدا ئێمە گوێگرێکی درۆزنین. بۆ ئەوەی گوێگرێکی ڕاستەقینە بین دەبێ بەر لە هەر شتێک مێشک و زەینی ئێمە لە کەشوهەوایەکی ئارام و بێدەنگ دا بێت. دەبێ زۆر بە سادەیی گوێبگرین و خۆمان لە شتی تر دوور بگرین، ئەوە لەو کاتەدایە کە دەبیستین و تێدەگەین و باش تێگەیشتن نیشانەی ئەوەیە کە باش گوێمان داوەتێ و باش بیستوومانە، ئەو کاتەیە تێگەیشتن و گۆڕانکارییەکان لە هەست و بیری ئێمەدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بە تەواوی گوێمان گرتووە و بیستومانە و تێگەیشتووین. ئەگەر وەها کارێک ئەنجام نەدەین، ئەوە تەنها هەر گوێمان لە خۆمان گرتووە و گوێمان نەداوە بەکەس و هەر ئەوەش وا دەکات کە هەراوزەنا و دەنگە دەنگ و هەرا و فەرتەنە و ئاشوب دەروونی هەموو لایەک داگیر بکات و ئەو سەرقاڵبوونە ڕێگە نادات لەوەی کە پەیوەندییەکی ڕاستەقینە و پەیوەندییەکی ڕۆحی

دروست ببێت، هەرچەند بە ڕواڵەت گوێت گرتووە، بەڵام لە ڕاستیدا گوێت لە هیچ نەگرتووە و هیچ شتێک نابیستی.
حەزرەتی مەسیح دەڵێ: " ئەوانەی کە چاویان هەیە لێیان گەڕێن با ببینن و ئەوانەی کە گوێیان هەیە بۆ بیستن، لێیان گەڕێن با ببیستن".
مەبەستی حەزرەتی عیسا ئەوەیە چاو و گوێ تەنها بۆ بینین و بیستن بەس نییە بەڵکو شتێکی تریش هەیە کە پێویستی بە بینین و بیستن هەیە، ئەویش دەروونێکی ئارام و گوێگر و وشیار و زیرەکە، کاتێک ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندیانە لە مێشکدا بوونی هەبێ، ئەوکاتە دەرگاکان کراوەن و بیستن و بیستراو زۆر بە ئاسانی و سانایی ئەنجام دەگرێت.
هەرکاتێک خوت لەسەر ئەو شێوازە لە بیستن ڕابهێنی، ئەوا بۆ هەموو تەمەنەت دەحەسێتەوە و ئەو هونەرە (گوێگرتنە) وات لێدەکات مێشک و زەین و دڵ و دەروونت لە دەست هەموو جۆرە سەرقاڵبوونێکی بێسوود و بێکەڵک ڕزگاری بێت و ئەوە یارمەتیتان دەدات کە ئاگاداری ڕاز و نهێنییەکانی جیهانی دەورووبـەرت بی و وردە وردە بەهرەمەند بی لەو ڕووناکی و ڕازانەی کە لە دەروونتدایە .
ئەساس و بناغەی ژیانێکی باش لە بیستن و بینینی باش دایە، یانی باش بیستن و باش بینین بناغەیەکی پتەو و قایم و بەهیزە بۆ ژیانێکی باش. هەر وەک چۆن لە ئاوێکی ئارام و پاکی دەریادا هەمووشت دیـارە، لەناو مێشک و زەینێکی پاک و بێگەردی مرۆڤیش حەقیقەت کە هەمان (خواوەندە) بە جوانی دەبیندرێت. بۆ ئـەوەی لە حەقیقەت تێبگەین و هەستی پێبکەین، دەبێ ئامادەکاری و زەمینەسازی بۆ بکرێت، هەر وەک چۆن ئەگەر بتەوێت بەرهەم و دەستکەوتی کشتوکاڵیت هەبێ، دەبـێ زەوی بکێڵی و ئاوی بدەی و خزمەتی بکەی هەتا بەرهەم دێت، هەر بە هەمان شێوەش دەبێ مێشک و زەینی مـرۆڤ ئامادە بکرێت و بۆ ئـەوەش دەبـێ چەند پەند و ئامۆژگارییەک بکەی بە ئەل□قەی گوێت و لەبەرچاوی بگری تا بەدەستهێنانی حەقیقەتت بۆ ئاسان ببێتەوە.
بەشێوەی سروشتی و بە دوور لە هـەر جۆرە ساختەچێتییەک بژین، بە گشتی زۆرجـار ژیانی مرۆڤەکان بە شێوەی ساختە و ناسروشتییە و بە پێی هەندێ بارودۆخی درۆینەیە، هەندێ بە پێی هەلومەرجی درۆیـنـەی زاڵ بەسەر کۆمەڵگایە. مرۆڤەکان هەمیشە خۆیان لە ناو جلوبەرگێکی درۆینە و ساختەچێتیدا شاردۆتەوە و هەر ئەوەش وای کردووە لە " وجود" و "بوون"ی ڕاستەقینەی خۆیان دوور بکەونەوە و سیمای ڕاستەقینەی خۆیان لە دەسـت بـدەن و هەموو شت بن تەنها خۆیان نەبن. هەر بۆیە دەبێ ئەو دەمامکە درۆینەی کە بە روخساری خۆیانەوە ناوە بخەنە لاوە و سیمای ڕاستەقینەی خۆیان دەربـخـەن، هەر وەک چۆن هونەرمەندێکی شانۆکار پاش ئەوەی کە رۆڵەکەی گێرا، دەست و دەموچاوی لەو رەنگ و دەرمانەی کە بۆی کراوە دەشوات و جلوبەرگی خۆی دەگۆڕێ و دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی شەخسی خۆی، ئێوەش وابکەن خۆتان لە دەست ئەو دەمامک و جلوبەرگە درۆینانە ڕزگار بکەن و شەخسیەتی ڕاستەقینەی خۆتان دەرخەن و بە شێوەیەکی سروشتی و ئاسایی بژین.

سەرچاوە/ کتاب راه کمال

# تیۆریاکانی سروشتی ئەخلاق

نووسینی: جەیمس ڕەیچڵ و ستوارت ڕەیچڵ
و. لە ئینگلیزییەوە: کارزان عزیز

داستانێکی کۆن چیرۆکی ئەڵقەکەی (جیگس)مان بۆ دەگێڕێتەوە، جیگس شوانێکی هەژارە، ئەڵقەیەکی سیحری دەدۆزێتەوە کە لە پاشماوەی بوومەلەرزەیەکەوە دەردەکەوێت. ئەڵقەکە تایبەتمەندییەکی هەیە، ئەوکەسەی لە دەستی دەکات نادیار دەبێت، واتە کەس توانای بینینی بەکارهێنەکەی نامێنێت. بۆیە بەکارهێنەکەی دەتوانێت هەر کارێک و بۆ هەر شوێنێک بڕوات کە ئارەزووی دەکات. شوانەکە مرۆڤێکی خراپە و خێرا ئەوەی بەیاددا دێت کە دەتوانێت ئەڵقەکە لە بەرژەوەندی خۆیدا بەکاربهێنێت. بەهۆی ئەڵقەکەوە دەچێتە ناو کۆشکەوە و دەستدرێژی دەکاتە سەر شاژن و دەست بەسەر دەسەڵاتی شایەتیدا دەگرێت. لە شوانەوە دەبێتە بە پاشای وڵات.

ئەم چیرۆکە لە کتێبی دووی کۆماری ئەفلاتۆندا هاتووە، کە لەلایەن "گلاوکۆن"ەوە وەک ئارگومێنتێک بەکاردێت، دەڵێت: دوو ئەڵقەی سیحری دەستی دوو مرۆڤ دەکەون، یەکێکیان بۆ کاری ئەخلاقی و باش بەکاریدەهێنێت، لە کاتێکدا کەسی دووەم بۆ کاری خراپ و نائەخلاقی بەکاریدەهێنێت. گلاوکۆن پێیوایە هیچ یەکێک لەوان لە ئەوی دیکەیان باشتر نیە، چونکە پێیوایە هەردووکیان



جەیمس ڕەیچل ستوارت ڕەیچل

**فەلسەفەی ئەخلاق هەوڵدانێکە بۆ بەدەستخستنی تێگەیشتنێکی سیستیماتیکیانە لەئەخلاق، ئەوەی کە ئەخلاق لێمان دەخوازێت، بە پێویستی دانان و دیاریکردنی چۆن دەبێت بژین، هەروەها لێکۆڵینەوە و پرسیارکردن لە بۆچی دەبێت بەم شێوەیە بژین؟ پرسیار گەلێکن کە فەلسەفەی ئەخلاق زیاد لە دوو هەزار ساڵە بەدوای وەڵامەکانیاندا دەگەڕێت**

بەبێ ترسی تۆڵە سەندنەوە ئەو کارانەیان ئەنجامداوە. مەبەستی گلاوکۆن لێرەدا ئەوەیە کە دەبێت هەمیشە ترسێک لە ئەنجامدانی کارەکانماندا هەبێت، بەمانایەکی تر مەبەستی بە مەرجدانانی چاودێری و ترسی تۆڵە سەندنەوەیە لەهەمبەر هەر کارێکدا ئەنجامی دەدەین.
فەلسەفەی ئەخلاق هەوڵدانێکە بۆ بەدەستخستنی تێگەیشتنێکی سیستیماتیکیانە لەئەخلاق، ئەوەی کە ئەخلاق لێمان دەخوازێت، بە پێویستی دانان و دیاریکردنی چۆن دەبێت بژین، هەروەها لێکۆڵینەوە و پرسیارکردن لە بۆچی دەبێت بەم شێوەیە بژین؟ پرسیار گەلێکن کە فەلسەفەی ئەخلاق زیاد لە دوو هەزار ساڵە بەدوای وەڵامەکانیاندا دەگەڕێت.
تیۆری ڕێژەگەرایی: لەوانەیە کۆنترین تیۆرەی فەلسەفەی ئەخلاق ئەوەبێت کە (باش و خراپ) ڕێژەیین بە بەراوورد بە داب و نەریتەکانی هەر کۆمەڵگایەک، لەم تێروانینەوە، ئەخلاق هیچ شتێک نیە جگە لە داب و نەریتەکانی کۆمەڵگا.
"هێرۆدۆتس" بە یەکەمین و گەورەترین مێژوونوسی یۆنان دادەنرێت، لە سەردەمی سۆکرات دا دەژیا و ئاشنامان دەکات بە چەندین چیرۆکی گرنگ بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم تیۆریە، لە یەکێک لە چیرۆکەکانیدا باس لە هۆزی (مەسەگێتەی) دەکات کە لە ناوەراستی ئاسیادا دەژین، بەم شێوەیە هەندێک لە نەریتەکانیان وەسفدەکات و دەڵێت:
ژیانی مرۆڤ بەشێوە سروشتییەکەی خۆی کۆتای نایەت (کە مەبەستی لە مردنی سروشتییە)، کاتێک کەسێک زۆر پیردەبێت هەموو خزم و کەس و کارەکەی کۆدەبنەوە و دەیکەنە قوربانی لەگەڵ (گا)یێکدا. پاش بە قوربانیکردنەکە گۆشتەکەی دەکوڵێنن و ئاهەنگی لەسەر دەگێڕن، هەروەها ئەوانەی بەهۆی ئەم نەریتەوە دەگەنە کۆتای ژیانیان بە (خۆشبەختترین) کەسەکان دادەنرێن، بەڵام گەر کەسێک بە نەخۆشی بمرێت ئەوا گۆشتەکەی ناخۆن،

بەڵکو بەخاکی دەسپێرن و نیگەراندەبن بە (خراپ -بەختی)یکەی، چونکە نەکرایە قوربانی.
دانەوێڵە ناچێنن و سەرچاوەی ژیانیان لەسەر ئاژەڵداری و ڕاوەماسی و خواردنەوەی سەرەکیشیان شیرە. تاکە خودایەک کە دەیپەرستن (خۆر)ە هەروەها ئەسپ دەکەنە قوربانی خوداکانیان.
"هێرۆدۆتس" پێی وایە کە ناکرێت ئەم هۆزە بخەینە بەر ڕەخنە بەهۆی ئەم چۆنیەتیە لە پەیڕەوکردنی نەریتەکانیان. دەڵێت نەریتەکان نەخراپترن و نەباشترن لە نەریتی کۆمەڵگاکان و خەڵکانی دیکە، هێندە نەبێت کە ئەم هۆزانە جیاوازی کلتورییان هەیە. یۆنانییەکان وایاندادەنا کە ئەوان مەدەنیتر و شارستانیترن لەسەر ئەو بنەمایەی کە نەریتەکانی ئەوان لە نەریتەکانی تر باشترن، بەڵام هێرۆدۆتس دەڵێت ئەمە تەنها لەبەرئەوەیە کە هەرکەسێک واتێدەگات نەریتەکانی خۆی باشترینن، کەواتە لێرەدا هەقیقەت لە زیهن و تێڕوانینەکانی ئێمەدایە، ئەمەش لەسەر ئەوە دەوەستێت کە ئێمە لە چ کۆمەڵگایەکدا گەورە پەروەردە دەبین.
ڕێژەگەراکان پێیان وایە کە هێرۆدۆتس ڕوونە لەوەی کە دەڵێت ئەوانەی بڕوایان بە هەڵە و خراپی ئۆبجێکتیڤ (بابەتیانە) هەیە ساویلکەن، بەڵام هێشتا ڕەخنەگران ڕەخنەیان لەسەر ئەم تیۆرە هەیە، بۆ نموونە ئەو تێڕوانینەی کە زۆرینەی کۆمەڵگا هەیەتی لەسەر پرسێک، ئایا دەبێت هەمیشە ڕاست و دروست و تێڕوانینێکی ئەخلاقیانە بێت؟ بەمانایەکی تر ئایا هەرچییەک زۆرینە ڕەزامەندی لەسەر دەربڕیبێت لە کۆمەڵگەیەکدا دروستە و بۆچوونی کەمینەش نادروست و هەڵەیە، چونکە وەک پێشتر ئاماژەمان پێکرد ئەم تیۆرە پشت بە تێڕوانینەکانی ئێمە دەبەستێت، واتە شتەکان بۆخۆیان خاوەن و هەڵگری ڕاست و هەڵە و باش و خراپی ئەخلاقی نین، هەربۆیە گۆڕانکاری لە بەهاکاندا گران دەبێت، چونکە زۆر کات دژی بۆچونی زۆرینە دێنەوە.
"سوقرات" جەخت لەسەر کێشەیەکی قوڵتری ئەم تیۆرەیە دەکاتەوە و دەڵێت هەندێک نەریتی کۆمەڵایەتی هەن هەڕەمەکین و هەڵگری هیچ بنەچە و بنەمایەکی پشتبەست بە عەقڵ و لۆجیک نین، بۆ نموونە لە ڕێوڕەسمی مردندا یۆنانییەکان مردووەکانیان بە خاک دەسپارد، لە کاتێکدا "گالاشیەکان" مردووەکانیان دەخوارد، بۆیە دەڵێت هیچ یەکێکیان لە ئەویتریان باشتر نییە، هەرچەند ئەمە بەمانای ئەوە نایەت کە هەموو نەریتێکی کۆمەڵایەتی بەم شێوەیە بێت.
هەروەها هەردوو کۆمەڵگاکە ئازادبوون لە هەڵبژاردنی هەر جۆرە ڕێوڕەسمێکی مردندا، بۆیە باشتر و خراپتر دوو چەمکن لە دەرەوەی دونیای هەر جۆرە نەریتێکی لەم شێوەیەدا. لە پاڵ ئەوەشدا بە پشتبەستن بە عەقڵ دەتوانین هەردوو چەمکی باشتر و خراپتر بەسەر هەندێک لە نەریتەکاندا بسەپێنین، بۆنموونە کارێکی ئاسان دەبێت گەر بڵێین ڕاستگۆی و ڕێزگرتن بۆ مرۆڤ کاری باشن و کۆیلایەتی و جیاوازی ڕەگەزی خراپن، چونکە بە گەڕانەوە و پشتگیری عەقڵ دەتوانین بۆ سەلماندنیان ئارگومێنتی عەقڵیانە بخەینەڕوو.

### تیۆری فەرمانە ئاسمانیەکان

تیۆری فەرمانە ئاسمانیەکان دووەمین بیرۆکەی کۆنە، "سوقرات" ئاشنابوو بەم تیۆریە و پێیوابوو ژیانێکی ئەخلاقیانە بریتییە لە گوێڕایەڵی بۆ فەرمانە ئاسمانیەکان، لێرەشدا دەتوانین وەڵامی "چیرۆکی ئەڵقەکە" بدەینەوە کە لە کتێبی کۆماری ئەفلاتۆندا هاتووە و لەسەرەوە ئاماژەمان پێداوە، بۆیە ناتوانین هەرشتێک ئەنجامبدەین کە ئارەزووی لێدەکەین، لە هەمانکاتدا سوقرات پێیوابوو کە ژیانێکی ئەخلاقیانە بریتی نییە لە هەوڵدان بۆ خۆشبەختکردنی خوداکان و

هەمیشه و هەردەم گوێڕایەڵی نواندن بۆیان.
لەیەکێک لە دیالۆگەکانیدا "سوقرات" پرسیارێک دەوروژێنێت کە ئایا هەرچییەک خوداکان فەرمانی لێدەدەن ڕاستن؟ ئێستا و لێرەدا لەوانەیە تێبینی ئەوە بکەین کە ڕووبەڕووی هەندێک کێشە و ئاڵۆزی دەبینەوە، وەک تیۆرەیەکی گشتی سەبارەت بە ئەخلاق , چۆن؟ بۆ نموونە , ئایا ئێمە ئەوانە بە ڕاست دەزانین کە خوداکان فەرمانی لێدەدەن؟ هەندێک لەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ڕێنمایەکان و فەرمانی خوداکان بە ڕێگەی گواستنەوە ڕادەگەیەنن متمانەپێکراوترین و ڕاستگۆترین کەسەکان نین، ئیتر چۆن بڕوایان پێبکرێت، یان بیستنی دەنگ "کە یەکێک لە نیشانەکانی نەخۆشی شیزۆفرینیایە" بە فەرمانی خودای ناودەبرێت، وەک ئەوەی کە ئەو کەسە پەیوەندییەکی لەگەڵ خودادا هەبێت، بۆ نموونە: ئەو شتە ناڕوون و دژبەیەکانەی کە لەناو کەنیسەدا هەیە؟ دەکرێت بڵێین هەموو ئەو کتێب و دەستنووسە مێژووییانەی کە هەیە فەرمانی خوداین؟ یان ئەو دەستنوسانەی کە لە سەردەمێکی مێژوویدا هاتوونەتە خوارەوە تا چەند دەتوانن پرسە نوێکانی سەبارەت بە ئەخلاق ڕوون و یەکلایی بکەنەوە، وەک ئەوەی کە پەیوەندی بە پاراستنی ژینگە و گەرمبوونی گۆی زەوییەوە هەیە؟ یان دەبێت چەندێک لە بڕی سەرچاوەکانمان ببەخشین لە پێناو نەخۆشی ئایدزدا؟ لەوانەیە تائێستاش وابڕوانین کە فەرمانەکانی خودا دوا بڕیار و دەسەڵاتن بۆ ئەخلاق، ئەمە ئەو پرسەیە کە سوقرات ڕایگەیاند. سوقرات بڕوای وابوو کە خودا بوونی هەیە و لەوانەیە ڕێنمای و فەرمان ڕابگەیەنێ، بەڵام ئەم فەرمانانە ناتوانن ببنە دوا بنەماکان لەمەڕ ئەخلاق، سوقرات دەڵێت دەبێت دوو پێشگریمانە لە بەرچاوبگرین بۆ ئەخلاق , ئایا خوداکان بنەمایەکی عەقڵییان لە فەرمانەکانیاندا هەیە، ئەگەر نا ئەوا ئەو فرمانانە فرمانی هەڕەمەکین و


سوقرات"

خوداكانيش وەكو ستەمكارەكانن كە داوامان لێدەكەن چیبكەین و چینەكەین بەبێ بوونی بنەمایەک , بەڵام ئەمە تێڕوانینێكی نادینیانەیە كە دینیەكان دەڵێن جۆرە بۆچونێكی لەم شێوەیە شایەنی بەڵێ بۆ كردن نییە، لەلایەكی تریشەوە گەر بڵێین خوداكان بنەمای عەقڵییان هەیە بۆ فەرمان و ڕێنماییەكان ئەوا دانبەوەدا دەنێین كە خوداكان پێوەدانگ و ستانداردیان هەیە بۆ باشێتی و خراپێتی كە ئەم پێودانگانە سەربەخۆن لە فەرمانەكانیان بەناوی ئەو پێودانگانەی كە خوداكان پشتی پێدەبەستن بۆ ئەو شتانەی كە لێمانی دەخوازن.

باسەكە درێژەی هەیە , تەنانەت گەر كەسێك دنیا لە وێنایەكی دینیانەوە ببینێت ناتوانێت لە باشێتی و خراپێتی كردارەكانمان تێبگات، تەنها لەبەر پەیوەستبوونی بە فەرمانە ئاسمانییەكانەوە، لەوانەیە هەمیشە پرسیاری ئەوە بكەین بۆ خوداكان فەرمانی ئەوە دەكەن كە دەیكەن؟ ئەمە ئەو پرسیارەمان بۆ دەردەخات بۆ كردارە باش و دروستەكان باش و دروستن و بۆ كـردارە خراپەكانیش خـراپ و نادروستن؟

### تیۆری فـەزیـلـەتـی ئـەرسـتـۆ

هەرچەندە هــەردوو تیۆرەی ڕێژەیی و فەرمانی ئاسمانی پاڵپشتیان هەبوو، بەڵام نەبوونە جێگەی بایەخی زۆری قوتابییە جدییەكانی فەلسەفەی ئەخلاق.

یەكەمین و درێژترین و سیستیماتیكترین نوسراو لەسەر فەلسەفەی ئەخلاق بە دوو سەدە پاش سوقرات لەلایەن ئەرستۆوە نـوسـرا (nicomachean ethics) لە ساڵی (٣٣٠پ ن) ، كە بـاس لە فەزیلەت (باشێتی goodness) دەكـات یان ئەو تایبەتمەندییانەی كە مرۆڤ پێویستە هەیبێت بۆ ئەوەی بەختەوەر و باش بژی كە پێكدێت لە (ئازایەتی , بەخشندەی , ڕاستگۆی....هتد) هەروەها ئەرستۆ هەوڵی دۆزینەوەی مانا و گرنگییەكەیدا، وەڵامی ئەرستۆ بۆ چیرۆكی ئەڵقەكەی نێو كتێبی كـۆمـار كـە فـەزیـلـەت گرنگە بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ خۆشبەختی بەدەست بهێنێت، بەهۆی ئەمەوە مرۆڤی باش دواجار بەهۆی باشێتییەكەیەوە خۆشبەختە.

بۆچوونی ئەرستۆ بۆ ژیانێكی باش پەیوەست بوو بەجیهانبینییەكەیەوە و هەروەها جێگەی ئێمە لە نێو جیهاندا، تێگەیشتنی ئەرستۆ لە چییەتی و چۆنێتی بوونی جیهان زۆر كاریگەری هەبوو , تەنانەت بەسەر بیری خۆرئاوادا بۆ زیاتر لە ١٧٠٠ساڵ زاڵبوو، خاڵی سەرەكی لە جیهانبینییەكەیدا دەڵێت (هەر شتێك لە سروشتدا مەبەستێكی هەیە)، هەروەها دەڵێت سروشت سەر بە گرووپی هۆكانە كە كار دەكات لە پێناو شتێكدا.

ئەوە لەلای ئێمە ڕوونە كە ئەو شتانەی ئێمە دروستیان دەكەین مەبەستەكانیان لە ناو مێشكی ئێمەدایە، وەک چەقۆ بۆ بڕین و گالیسكە بۆ گواستنەوە و جەنگ، چونكە ئەوە مرۆڤە لێرەدا دەبێتە دروستكەری ئـەوان. بەڵام ئایا ئەو دروستكراوە سروشتیانەی كە ئێمە دروستمان نەكردوون، بەهەمان شێوە بۆ مەبەستی جیاجیا و دیاریكراو دروستكراون؟ ئەرستۆ دەڵێت ئەوانیش بۆ مەبەستی دیاریكراو لە ژیاندا دروستكراون.

بۆ ڕوونكردنەوەی ئەم پرسیارە نموونەی جۆراوجۆر بەكارهاتووە , بۆ نـمـوونـە (ددان)، مەبەست لەم دروستكراوە سروشتییە جوین و وردكرنی خواردنە یان چاو و گوێ و لووت كە مەبەستەكانیان بینین و بیستن و بۆنكردنە، بەڵام باسەكەی ئەرستۆ تەنها بە ئەندامە بایۆلۆجییەكانەوە پەیوەست نیە و مەبەستی نووسینەكەی زۆر لەمە قووڵتر دەبێتەوە، نموونەی (بـاران) نمونەیەكی كاریگەرە , ئەرستۆ دەڵێت مەبەست لە باران بارین گەشەی ڕووەكە هەرچەند

ئەمە بۆ خوێنەرێكی مۆدێرن تاڕادەیەك سەیر و بڕواپێنەكراوە، لە كاتێكدا ئەرستۆ زۆر سوربوو لەسەر ئەم تێڕوانینەی.

بە هۆی ئەم تێڕوانینەوەیە دەڵێین (جیهان) لە سیستمێكی ڕێكخراو و عەقڵانیدا دروستكراوە كە تێیدا هەر شتێك لە شوێنی گونجاوی خۆیدایە و خزمەت بە مەبەستەكەی خۆی دەكات، هەروەها شێوەیەكی ڕێكوپێكی پێكهێناوە. باران بۆ ڕووەكەكان دەبارێت و ڕووەكەكان گەشەدەكەن لەپێناو ئاژەڵەكاندا و ئاژەڵكانیش بوونیان هەیە لە پێناو مرۆڤدا، هەر ئەمەشە وادەكات بوونی مرۆڤ ببێتە چەق و سەنتەر لەم پێكهاتەیەدا وەك چۆن لە (سیاسەت )دا دەنووسێت: ئێمە پێویستە بڕوا بەوە بكەین كە سەرەتا ڕووەكەكان لەپێناو ئاژەڵدا هەن و پاشان هەموو ئاژەڵەكان هەن لەپێناو مرۆڤدا , ئاژەڵە ماڵییەكان بۆ خواردن و ئاژەڵ كێوییەكانیش هەرچەندە ناخورێن، بەڵام جل و بەرگ و چەندین جۆر ئامرازیان لێ دروست دەكرێن، ئەگەر وابێت ئەوا سروشت هیچ شتێك ناخوڵقێنێت بەبێ بوونی تێڕواننێكی كۆتای و مەبەستێك، بۆیە سروشت خاوەنی مەبەستی دیاریكراوە لە هەر دروستكراوێكدا.

## --تیۆری یاسای سروشتی--

بیریارەكانی دینی مەسیحی كە لەم دوواییانەدا دەركەوتن، زۆر كۆكبوون لەگەڵ تیۆری فەزیلەتی ئەرستۆدا، بەڵام هەمیشە لە تیۆریەكەی ئەرستۆدا جەختییان لە سەر خاڵێك دەكردەوە ئەویش ئەوەبوو كەدەیانگووت بوونێك وونبوو و نادیار و ئاماژەپێنەكراوە، یان وێنەكە تەواونەكراوە، كە ئەویش بوونی خودایە لە وێنەكەدا، پێیان وابوو بوونی خودا زۆر گرنگە بۆ ئەوەی وێنەكە تەواوبكات، چونكە ئەرستۆ دینییانە نەیدەڕوانی لەم پرسە. بەهۆی ئەمەوە بیریارە مەسیحییەكان پێیان وابوو باران دەبارێت بۆ گەشەی ڕووەكەكان لەبەرئەوەی ئەمە ئەوەیە كە خودا دەیەوێت، هەروەها ئاژەڵەكانیش هەن لەپێناو مرۆڤدا ئەمەش لەبەرئەوەیە كە خودا ئەوانی بۆ ئەوە درووستكردووە، بۆیە بەهاكان و مەبەستەكان خاڵی جەوهەرین لە سرووشتی شتەكاندا، لەبەرئەوەی بڕوا وابوو كەجیهان بەگوێرەی پلانێكی ئاسمانی دروستكراوە.

ئەم جیهانبینییە بۆ بابەتی ئەخلاق چەند دەرئەنجامێكی بەدوای خۆیدا هێنا. لە ئاستی یەكەمدا دڵنییایی لە بەخشینی باڵاترین بەها بە ژیانی مرۆڤ و زاڵبوونیان بەسەر جیهاندا. یەكێكی تر لە دەرئەنجامەكانی ئەم تیۆریە ئەوەیە كە یاساكانی سروشت پێمان دەڵێن چۆن دەبێت شتەكان ببن و پێویستی چۆنێتی بوونی شتەكانمان پێدەڵێن، هەروەها پێناسی چۆنێتی بوونی شتەكانمان بۆ دەكەن، لە بەرامبەردا پێویستی بوونی شتەكان توانایەكمان پێدەبەخشن بۆ هەڵسەنگاندنی ئۆبجێكتیڤانە بۆ هەردوو چەمكی (باش یان خراپ) لە دۆخە جیاوازەكاندا.

لەم تیۆریەدا دەبێت و پێویستە شتەكان بەو شێوەبن كە خزمەت بە مەبەستە سروشتییەكانی خۆیان بكەن كە لە پێناویاندا دروستكراون، كاتێك لە مەبەستە سروشتییەكانی خۆیان لادەدەن و دەبنە هۆی پێشێلكردنی یاسا سروشتییەكان، هەربۆیە خراپ بەكارهێنانی دروستكراوێك بە كارێكی خراپ و نا ئەخلاقی ئەژماردەكرێت وەكو ئەوەی لایەنگرانی ئەم تیۆرییە دەڵێن هاوڕەگەزبازی (هۆمۆسێكشواڵێتی) كارێكی نائەخلاقییە، یان خراپبوونی ددانەكان و ووشكە ساڵی دەبنە هۆی لادان لە مەبەستە سرووشتییەكانیان، چونكە دەبێتە هۆی لەناوبردنی ڕووەكەكان، كە ئەمە بەهەمان شێوە پەیڕەو دەكرێت بەسەر كردار و ڕەفتارەكانی مرۆڤدا، لەم بۆچوونەوە یاسا ئەخلاقیەكان یەكجۆرن لە یاساكانی سروشت. خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە كە هەندێ لە كردارەكانی مرۆڤ سروشتین و هەندێكی تریان

ناسروشتین، بۆ سوود گەیاندن کارێکی سروشتییە لەبەرئەوەی خــوودا مرۆڤی وەکــو بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی درووســتــکــردووە. ئێمە دەمانەوێت و پێویستمان بە هاوڕێیەتی ئەوانی دییە، بۆیە هەرجۆرە هەڵسوکەوتێکی توندوتیژی و دڕندانە دەبێتە کارێکی ناسرووشتی. ئەگەر نموونەیەکی تر وەربگرین، ئەندامەکانی سێکس بە گوێرەی ئەم تیۆریە بۆ منداڵبوون و وەچەخستنەوەیە بۆیە بەکارهێنانیان، جگەلەم مەبەستە، دەبیتە کارێکی دژ بە یاسای سروشتی، بۆیە کەنیسە ڕێگەی گرت لە هاوڕەگەزبازێتی و بەکارهێنانی دەرمانی بەرگری دژی منداڵبوون و هەرجۆرە چالاکییەکی تری سێکسی کە نەبێتەهۆی وەچەخستنەوە. پێکهاتەی ئەم بیرۆکانە و هاوشێوەکانیان بوونە هۆی دروووستبوونی "ئەخلاقی یاسای سروشتی". ئەم تیۆریە بە تەواوی لەسەر دەستی سەینت تۆماس ئەکوینس لە ساڵی (١٢٢٥-١٢٧٤) گەشەی کرد، لە کاتێکدا کە تا ئەو کات جیهانبینی و تیۆریەکەی ئەرستۆ بێڕکابەربوو , تائێستاش تیۆریەی یاسای سروشتی خاوەنی لایەنگرانی خۆیەتی لەنێو کەنیسەکانی کاسۆلیکدا، بەڵام خاوەنی لایەنگری کەمە لەدەرەوەی کەنیسەدا چونکە زانستی ســەردەم بووە ئەڵتەرناتیڤی ئەم تیۆریە.

بەدەرکەوتنی گالیلۆ و نیوتن و داروین و هەندێک زانا و فەیلەسووفی تر، خوێندنەوە و جیهانبینی بۆ دیاردەی سروشتی گۆڕانی بەسەرداهات. چونکە ڕووەکەکان گەشەدەکەن لەڕێگەی ئەو بڕە ئاوەی کەپێویستیانە و دەستیان دەکەوێت و لەڕێگەی هەڵبژاردنی سروشتییەوە، چونکە ژینگەکە خۆی ئەو ئاوەی تێدایە و ڕووەکەکەش هەر لەوەوە پێویستی خۆی دابینداکات و دەمێنێتەوە، بەڵام تەنانەت لە هەڵبژاردنی سروشتیدا نەخشەیەکی پلان بۆ داڕێژراو هەیە بۆ گەشەی جۆرەکان بۆیە زۆر کەس پێیان وایە هەڵبژاردنی سروشتی هیچ نیە جگە لە وەهمێک، هەروەها یەکەم وەڵامــی کەنیسە بۆ ئەم تیۆریە ئیدانەکردنی بوو. زانستی نوێ بووە هۆی گۆڕانی تێڕوانینەکانی خەڵک دەربــارەی چۆنێتی بوونی جیهان، بەڵام بەشێک لەو چاکسازییە جیانەکراوەیە لە داهــاتــووی ئەخلاق کە لە بۆچوونە نوێکەدا خۆیدەبینێتەوە لەمەڕ سروشتی ئەخلاق.

بۆیە دەڵێین چیتر ناکرێت و نابێت ڕاست و هەڵەمان لە سروشتی شتەکانەوە دەست بکەوێت، لەم بۆچونەوە جیهانی سروشتی بەهاکان و مەبەستەکانمان پــیــشــانــنــادەن، ئــەوە پێویستی و ئـــارەزووی دانیشتووانە کە بەهاکانمان بۆ دیاریدەکەن. پێش ١٥٠ساڵ "نیچە" ڕایگەیاند کە "حەقیقەتی ئەخلاقی" بوونی نییە، فەیلەسوفی سکۆتلەندی "دەیڤد هیوم " بەهەمان شێوە گەشتە ئەو دەرئەنجامەی کە نیچە ڕایگەیاندبوو کە لە نامەکەیدا دەربارەی سروشتی مرۆڤ باسی لێدەکات، هەروەها "هیوم" دژ بەتێڕوانینەکەی ئەرستۆیە کە دەڵێت سروشت هەموو شتێکی دروستکردووە لە پێناو مرۆڤدا و دەڵێت ژیانی مرۆڤێک لە گەردووندا گەورەتر و بە بایەختر نییە تەنانەت لە ژیانی گوێچکەماسییەکیش.

## تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی

"هیچ حەقیقەتێکی ئەخلاقی و خوودا بوونی نییە" ئەمە خاڵێکی جەوهەری بوو لە تیۆری نوێدا بۆ ئەخلاق، بەڵام ئایا گەر حەقیقەتی ئەخلاقی و خوودا بوونی نەبێت، ئەوا ئەخلاق چی لێ بەسەردێت؟ پێویستە ئەخلاق وەک دیاردەیەکی مرۆڤی پەتی بخرێتە بەر باس و تێگەیشتن لە پاش دەرکەوتنی پێداویستی و بەرژەوەندی و ئارەزووەکانمانەوە، نەک هەر شتێکی تر.

"تۆماس هۆبز" بە باشترین فەیلەسووفی ئینگلیزی سەدەی حەڤدەهەم دادەنرێت، تێڕوانینێکی نوێی پێشکەشکرد بۆ تێگەیشتن لە بابەتی ئەخلاق،

ئەویش ئەخلاق وەکو (زاراوەیەکی پەتی مرۆیی). "هۆبز" دەڵێت باش و خراپ دوو چەمکن مرۆڤ دەیبەخشێت بەو شتانەی حەزی لێیەتی یان حەزی لێی نییە، هەروەها لەبەرئەوەی حەزمان لە شتی جۆراوجۆرە بۆیە لەوانەیە ناڕازییین لەمەڕ هەردوو چەمکی باش و خراپ، هەرچەندە هۆبز دەڵێت پێکهاتە سایکۆلۆجییەکانی مرۆڤ زۆر نزیکن لە یەکەوە و وەک یەکن و ئێمە مرۆڤی بەرژەوەند خوازین. ئەمە خاڵی سەرەکییە بۆ تێگەیشتن لە ئەخلاق، ئەخلاقیات لەو کاتەوە سەرهەڵدەدات و دەردەکەوێت کاتێک مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت کە چی بکات بۆ ئەوەی باش بژی.

هۆبز گرنگترین بیریاری مۆدێرنەبوو کە توانی بنەمایەکی سێکیولاری و سروشتی بۆ ئەخلاق دابنێ. ئەوەی دەرخست کە هەریەکێک لە ئێمە لە ژیانێکی باشتر و دۆخێکی گونجاوتردا دەژین گەر لە کۆمەڵگایەکی پێکەوەیی و هاریکاری دوولایەنەدا بژین، هەروەها سوودی بە کۆمەڵ ژیان زۆر لەوە گەورەترە کەئێمە پێمانوابێت تەنها هەلی هاوەڵ دۆزینەوەمان لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا بۆ ئاسان دەبێت، بەڵکو قوتابخانەکان و نەخۆشخانەکان و شەقامە سەرەکییەکان و کارەبا و فرۆکەخانە و تەلەفۆن و رۆژنامە و کتێب و فیلمی سینەمای و ....هتد لەرێگەی بەکۆمەڵ ژیانەوە بوون بە حەقیقەت، بەپێچەوانەوە ڕاستە گەر بڵێین بەبێ هاوکۆمەکی و پێکەوە ژیان، یان بەدەستیان ناخەین یان لە دەستیان دەدەین، بەهۆی ئەمەوە ئەوە لە بەرژەوەندی هەریەکێک لە ئێمەدایە هەر کارێکی پێویست ئەنجامبدەین لە پێناو دروستکردنی پێکەوە ژیاندا.

بەڵام هەردەم مانەوەی هەر ژیانێکی بە کۆمەڵ و گەشەسەندنی، پێویستی بە پەیرەوکردنی هەندێک ڕێسای ڕەفتارکردن هەیە، بۆ نموونە: ڕاستی گووتن، پەیمان بردنە سەر، ڕێزگرتن لەژیان و سەروەت و سامانی یەکتر.

-بەبێ پێشگریمانەیەک بۆ ڕاستی و حەقیقەت هۆکارێک نامێنێت بۆ ئەوەی خەڵک باری سەرنج و گرنگی بدەن بەیەکتری، بۆیە درووستکردنی پەیوەندی بەبێ وتنی ڕاستی و حەقیقەت مەحاڵ دەبێت، نەبوونی پەیوەندی لە نێوان تاکەکانی هەر کۆمەڵگایەکدا دەبێتە هۆی لێکترازان و هەڵوەشاندنەوەی ئەو کۆمەڵگایە.

-ئەگەر تاکەکانی هەرکۆمەڵگایەک پەیمانەکانی یەکتری نەبەنە سەر و نەیپارێزن ئەوا دابەشبوونی کار مەحاڵ دەبێت و کارکەرەکانیش چیتر ناتوانن پشت بە پەیمانی بەرێوەبەر و بەرپرسەکانیان ببەستن بۆ وەرگرتنی پاداشتەکانیان و دواجار داڕووخانی ئابووری دێتە ئاراوە.

-بەبێ بوونی گەرەنتییەک بۆ پاراستنی ژیان و سەروەت و سامان لە کوشتن و برین، ئەوا ناچارین هەمووومان ببین بە پاسەوانی گیان و سامانمان لە ترس و دژی ئەوانی دیکە، بۆیە ئەو کاتەی ڕێزگرتن نەما بەکۆمەڵ ژیان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەکەونە مەترسی لەناوچوونەوە.

بەهۆی ئەمەوە بۆ بەدەستخستنی پێکەوە ژیان، پێویستە پەیوەستبین بە هەندێک ڕێسای مامەڵەکردنەوە و دەبێت هەر یەکێکمان ڕەزامەندبین بە گوێڕایەڵی بۆ ئەم یاسایانە و یاساکانی تری پەیوەست بە ڕەفتارکردن، هەروەها هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی میکانیزمی جۆراوجۆر بۆ بەهێزکردنی ئەم یاسایانە. کۆی ئەم یاسایانە لەکۆتاییدا پەیمانی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن، هەر لێرەشەوە دەبێتە بنەمای ئەخلاقیات. لە ڕاستیدا دەکرێت ئەخلاق بە کۆمەڵێک ڕێسا و یاسا پێناسەبکرێت کە خەڵکی عاقڵ و ژیر کۆکن لە گوێڕایەڵیکردن پێیانەوە لەپێناو سوود و بەرژەوەندی دوولایەنە، لەکاتێکدا کە ئەوانی

دیش بەهان شێوە گوێڕایەڵی ئەو یاسایانە بن.
ئەم شێوە بۆچوون و تێگەیشتنە لە ئەخلاق، هەندێ تایبەتمەندی گرنگ و سەرنجڕاکێشی هەیە:
١-دەبێتە هـۆی ئاشکراکردنی بەشە نـاڕوون و نهێنییەکانی ئەخلاق و سەرئەنجام دەبێتە بابەتێکی کرداری و پراکتیکی بۆ ژیانێکی ئەخلاقیانە، مانای گوێڕایەڵیکردنی کوێرانە نیە بۆ فەرمانەکانی سروشت و ئاسمان و خوداکان.
٢-ئەم تیۆریە لایەنە عەقڵانی و ئۆبجێکتڤیەکانی پرسی ئەخلاقمان بۆ ڕووندەکاتەوە، ئەگەر حەقیقەتی ئەخلاقیش بوونی نەبێت، یاسای دژی کووشتنی بەئەنقەست بۆ نموونە پەیوەست نیە بەبیروڕای ئێمەوە، ئـەوە حەقیقەتێکی ئۆبجێکتیڤانەیە، واتە حەقیقەتێکە کە لە خودی کرداری کوشتنی بەئەنقەستەکە خۆیەوە دەستمان دەکەوێت نەک لەبیروڕاکانی خۆمانەوە.
٣-تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی گرنگی بایەخدانی ئێمە بە ئەخلاق ڕووندەکـاتـەوە، ئـەم تیۆرییە بەلایەنی کەمەوە وەڵامێکی بەشەکی یان هەندەکی (جزئی) مان دەداتەوە دەربارەی چیرۆکی ئەڵقەکە. گەر خوودایەک نەبێت بۆ دەبێت هەمیشە کاری باش و بەئەخلاقی بکەم؟ لە کاتێکدا ئەگەر لە بـەرژەوەنـدی خۆمدا نەبێت و لە بـەرژەوەنـدی ئەوانیتردا بێت. وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ژیانێکی ئەخلاقیانە بە سوود و قازانجی هەموومان و کۆمەڵدا دەکەوێتەوە، هەربۆیە کارێکی لۆجیکی و پەسەندە ئەگەر هاتوو ئارەزوو و ڕەوشتەکانمان سنووردرابکەین، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەر یەکێک لە ئێمە سوودمەندە لەهەر ڕەفتارێکی ئەخلاقیانەی ئەوی دی و بەپێچەوانەشەوە.
٤-یەکێکی تر لە خاڵە گرنگەکانی ئەم تیۆریە ئەوەیە کە دەتوانین بە درووستی ئەرکە ئەخلاقیەکانی خۆمان بزانین، بەداخەوە کاتێک پرسی ئەخلاقمان بـەرگـوێـدەکـەوێـت، یەکسەر و تەنها چالاکییە سێکسیەکانمانمان بیردەکەوێتەوە، لە کاتێکدا ئەمە بەشێکی زۆر بچووکی پرسی ئەخلاق پێکدەهێنێت، مەبەستی سـەرەکـی لـەم تیۆریە بەخشینەوەی بەختەوەری و سەروەرییە بە تاک لە پەیڕەوکردنی ژیانێکی ئەخلاقیانە بۆی، بایەخدانی زۆر بە ژیانی بە کۆمەڵ، لەپێناو گەڕانەوەیە بۆ تاک و خۆشبەختی و ئارامی تاک، هەروەها دوورخستنەوەی کۆمەڵگا لە جەنگی هەمووان دژی هەمووان.
٥-ئەم تیۆریە سرووشتی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی "بـەرژەوەنـدیـخـواز" پێناسەدەکات، بۆیە ئەم تیۆریە بەهۆی بنیاتنانی ژیانی بە کۆمەڵەوە و گوێڕایەڵیمان بۆ هەندێک یاسای ئەخلاقی و عەقڵانی، دەمانگەیەنێتە ئەو تێڕوانینەی کە ژیانی ئەوانی دیش وەکو ژیانی ئێمە گرنگن، بۆیە دەبێت ڕێز لە گیان و سەروت و سامانیان بگرین.

**بەرژەوەندیخوازی و چاکـەخـوازی**

ئایا مرۆڤ بەرژەوەندی خوازە؟ هەرچەندە تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی هەمیشە لایەنگرانی خۆی زیاددەکات، بەڵام فەیلەسووفان و دەروونناسانێکی زۆر هەن کە ئەو بۆچوونەی هۆبز قبوڵناکەن و ڕەتیدەکەنەوە کە پێیوایە مرۆڤ بەرژەوەندی خوازە. لە ڕاستیدا ئەوە ڕوونە کە هەر مرۆڤێک بەلایەنی کەمەوە خاوەنی هەستێکە کە وایلێدەکات بایەخ بە هەندێک کەس بدات وەک خێزان و هاوڕێ. مرۆڤ هەرچۆن بە قاچدارێتی پەرەیسەندووە بە هەمان شێوەش وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی پەرەیسەندووە، بۆیە هەم پیاسەکردن و هەم بایەخدانیش بە کەس و کار و هاوڕێکانمان سروشتین.
ئایا ئەگەر کەسێک هەندێک هەستی بایەخدانی بە ئەوانی دی هەبێت، هیچ کاریگەرییەکی دەبێت لەسەر ئەخلاق؟ دەیڤد هیوم بە بەڵێ وەڵامی ئەم پرسیارەی دایـەوە، هیوم کۆکبوو لەگەڵ هۆبزدا

کە بیروڕا ئەخلاقییەکانمان گوزارشتن لە هەست و سۆزەکانمان، هیوم کە باس لە (پێکهاتەی سروشتی مرۆڤ) دەکات دەڵێت بە دڵنیاییەوە بەشێک لە سروشتی ئێمە بایەخدانێکی خۆخوازانەیە و بەرژەوەندی خوازانەیە، بەڵام مرۆڤ لە هەمانکاتدا خاوەن هەستی هاوخەمی و بە کۆمەڵایەتیبوونە ئەم هەستانە وامانلێدەکەن کە پەیوەست بین و نیگەرانی ئەوانی دی بین، هەرچەند لە بازنەیەکی بچووکیشدا بێت. بۆیە هیوم دەڵێت هەر پێوانکردنێکی باش و خراپ، پەیوەستە بە پێودانگی بەرژەوەندییە ڕاستەقینەکانمانەوە، ئەم ئارگومێنتە بووە هۆی سەرهەڵدنی بیرۆکەیەکی نوێ کە بە سوودگەرایی ناودەبرێت (UTILITARIANISM)، هەروەها ئەم بیرۆکە نوێیە دەبێتە فەلسەفەی ئەخلاقی مۆدێرن و بوو بە تیۆری جێگرەوەی پەیمانی کۆمەڵاتی.

**تیۆری سوودگەرایی**

لایەنگرانی ئەم تیۆریە بنەمایەکیان بۆ ئەرکە ئەخلاقیەکان دانا، بنەمای گرنگ بۆ ئەخلاق لای ئەم تیۆریە ئەوەیە کە دەبێت هەمیشە کارێک بکەین کە دەبێتە هۆی فەراهەمکردنی زۆرترین خۆشبەختی یەکسان بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەکەونە بەر کاریگەرییەکانی ئەم کردارە، ئەم بنەمای خۆشبەختی یەکسان و بەرژەوەندی گشتییە پێکهاتووە لە سێ بیرۆکە:

١-بڕیاردان لەوەی کە چی بکرێت؟ دەبێت دەرئەنجامە پێشبینیکراوەکان پێشڕەوی کردارەکانمان بن بە تایبەتی ئەو دەرئەنجامانەی کە پێمانوایە باشترینن.

٢-بۆ بڕیاردان لەسەر باشترین دەرئەنجامەکان، دەبێت بایەخێکی زۆر بە خۆشبەختی و ناخۆشبەختی بدرێت کە لە دەرئەنجامەکانەوە سەرچاوە دەگرن، دەبێت هەمیشە بەو کارانە هەستین کە دەبنە هۆی زۆرترین خۆشبەختی و کەمترین ناخۆشبەختی، لە کۆتاییدا دەردەکەوێت بنەمای بەرژەوەندی و خۆشبەختی یەکسانی گشتی بۆ هەر تاکێک گرنگییەکی یەکسانی دەبێت وەک بۆ هەر تاکێکی تر.

هەرچەندە "هیوم" بیرۆکەی سەرەکی ئەم تیۆرەی دانا، بەڵام دوو فەیلەسووفی تر ئەم بابەتەیان فراوانتر و دەوڵەمەندتر کرد. "جێمی بێنتام" کە فەیلەسوفێکی ئینگلیزە لە کۆتای سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەدا ژیاوە، پێشڕەوی گروپێکی فەلسەفی ڕادیکاڵ بوو کە لە ڕێگەی ئەم تیۆرییەوە ئامانجیان چاکسازیکردن بوو لە یاساکانی بریتانیا، لەکۆتاییشدا سەرکەوتووبوون بەتایبەتی لە چاکسازییەکانی زیندان و ڕێگرتن لە کارپێکردن بە منداڵان. "جۆن ستیوارت میل" یەکێک لە شوێنکەوتووە سەرەتایی و یەکەمەکانی ئەم تیۆرییە بوو. جێرمی بێنتام بەناوبانگترین و کاریگەرترین بەرگریکرد لەم تیۆریە لە ڕێگەی ئەو کتێبەی لە ساڵی ١٨٦١ بڵاویکردەوە بەناوی (UTILITARIANIM).

هەر لەگەڵ دەرکەوتنی تیۆریەکەدا هەندێک ڕەخنەگر دەرکەوتن و پێیانوابوو ئەم تیۆریە نیشانێکە بە ئاسانی دەپێکرێت، چونکە بیرۆکە کۆن و تەقلیدییەکانی لەمەڕ ئاین پشتگوێخستووە، لە تێڕوانینی فەیلەسوفان و لایەنگرانی ئەم تیۆریەوە ئەخلاق هیچ پەیوەنییەکی بە گوێڕایەڵی خوداوە نییە، چونکە ئەم تیۆریە پەیوەست بوو بە ئاسوودەیی و خۆشبەختی مرۆڤەوە لەم دنیادا، بۆیە هەندێک لە ڕەخنەگران ڕەخنەکانیان لەوەدابوو کە ئەم بیرۆکەیە بێ خوودایە و خوودایەکی نییە، بەڵام جۆن ستیوارت میل لە وەڵامی ئەم ڕەخنەیەدا دەڵێت: ئەم تیۆریە بێ خودا نییە و بگرە لە تیۆریەکانی تر دینی ترە، گەر ئەوە ڕاست بێت کە خودا خۆشبەختی و ئاسوودەی بوونەوەرەکانی خۆی لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە، هەرئەوەشە مەبەست لە دروستکردنیان، هەروەها

خاڵی سەرەکی ئەم تیۆریە خۆشبەختی مرۆڤە.
تیۆری سوودگەرایی هێشتا نێچیرێکی ئاسانە بۆ ڕەخنەگران، چونکە بە تیۆریەیەکی لاواز دادەنرێت، لەبەرئەوەی زۆر بیرۆکەی ئەخلاقی تەقلیدی ئاوەژووکردەوە و دژیان وەستا و چاکسازی تێیاندا ئەنجامدا. بۆنموونە: ئەم تیۆرییە لە بۆچوونە تەقلیدییەکەوە ناڕوانێتە دادپەروەرێتی تاوانکار، چونکە لە پێشتردا بیرۆکەی حەق لێسەندنەوە هەبووە، بۆ نموونە گەر کەسێک کەسێکی بکوشتایە، مامەڵەیەکی دادپەروەرانە لەگەڵ تاوانکارەکەدا نەدەکرا و هەرزوو حەقی لێدەسەندرایەوە، بەڵام لایەنگرانی ئەم تیۆریە دەیانگووت کە ئەمە هەڵە بە هەڵە چارەسەرکردنە و جگە لە زیادکردنی مەینەتییەکان هیچی تری لێوە بەدەستناهێنرێت. ئەم تیۆریە هەوڵی پێشکەشکردنی وەڵام و چارەسەرکردنێکی کۆمەڵایەتیانەیان بۆ کێشەکان دەدا، کە لە سێ خاڵدا خۆیدەبینێتەوە: دیاریکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ڕەفتارە تاوانکارییەکە و هەوڵدان بۆ چاکسازی لای یاسا پێشێلکەر کە کەسی تاوانکارە و کردنیان بە هاوڵاتی بەرهەمهێنەری کۆمەڵگا و لە کۆتایدا سزادانی تاوانکار ئەویش لە کاتی زۆر پێویست و ناچاریدا بۆ ڕێگرتن لە دووبارەکردنەوەی هەر جۆرە ڕەفتارێکی تاوانکاریانەی لەو شێوەیە لەلایەن هەر کەسێکی ترەوە. لەبەر ئەمەیە ئەمڕۆ لە کۆمەڵگاکاندا ئەم بیرۆکەیە و هاوشێوەکانی زۆر باون. نموونەیەکی تر: لەم تیۆریەدا جەخت لەسەر خاڵێک دەکرێتەوە کە بناغەیەکی سەرەکی تیۆریەکەیە (خۆشبەختی یەکسان)، ئەمە مانای ئەوەیە کە دەبێت خۆشبەختی یەکسانبێت بەسەر کۆمەڵگادا و خۆشبەختی بۆ هەمووان بێت، ئەم تیۆریە دژی بیرۆکەی نوخبەکان دەبوویەوە کە گرنگی بە لە پێشینەتر و باشتری کۆمەڵگایەک بەسەر کۆمەڵگایەکی تردا یان گرووپێک بەسەر گرووپێکی تردا دەسەپاند، بۆیە ئەم تیۆریە دەڵێت دەبێت خۆشبەختی یەکسان بێت بۆ هەمووان بەبێ گویدان و گەڕانەوە بۆ ئاین و نەتەوە و ڕەگەز و هەر پێودانگێکی تر، چونکە لەئەنجامدا ئەم جیاوازیانە دەبنە هۆی دروستکردنی جیاوازی لە پایە ئەخلاقیەکاندا.
لە کۆتاییدا تیۆری سوودگەرایی بابەتێکی مشتوومڕ هەڵگرە، چونکە سوودی نەبوو لە یاسا ئەخلاقییە ڕەهاکاندا، لایەنگرانی ئەم تیۆریە پێیانوایە یاسا تەقلیدییە ئەخلاقیەکان شیاوی گۆڕانن، بۆ نموونە: یاسای دژی کوشتن لە تاو ئازار (ئەو کاتەی کەسێک لە تاو ئازارێکی زۆردا بە دەرمان دەکوژرێت) کە زۆرجار کوشتنێکی ئارەزوومەندانەیە بە هەڵواسراوی ماوەتەوە و وەڵامێکی ئەخلاقی تەواومان لێیەوە دەستنەکەوتووە، کەسێک ئازارێکی زۆری هەیە بڕیاری هەڵبژاردنی مردن دەدات بەسەر ژیانێکی پڕ لەئازار و تلانەوەدا، ئایا ئەم جۆرە لە مردن یان کوشتنە کارێکی ئەخلاقی ڕێگە پێدراوە؟ هەروەها لایەنگران دەڵێن یاسا تەقلیدییەکان گومان هەڵگرن، بۆ نموونە: تیۆرزانانی دینی مەسیحی لەمەڕ فەلسەفەی ئەخلاق پێیانوابوو هەرجۆرە بەکارهێنانێکی ئەندامە سێکسییەکان جگە لە مەبەستی وەچەخستنەوە، دەبێتە کارێکی نا ئەخلاقی، چونکە دژی یاسای سروشتی دێتەوە، بەڵام لە تێڕوانینی لایەنگرانی ئەم تیۆریەوە بە کارێکی نا ئەخلاقی ناژمێردرێت، چونکە ئازاری بۆ هیچ کەس نیە. ئەم ئیدانەکردن و چاکسازییەی بیرۆکە ئەخلاقییە کۆن و تەقلیدییەکان، بووە هۆی بیزارکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵک کە هەڵگری تێڕوانینە پێشینەکان بوون بۆ ئەخلاق. بنەمایەک کە بووە پێودانگێکی زۆر گرنگ بۆ ئەخلاق لەم تیۆریەدا ئەوەبوو کە کار و چالاکییەک گەر بووە هۆی خۆشبەختکردنی خەڵک و نەبێتە مایەی ئازار دروستکردن بۆ هیچ کەس، ئەوە نابێت ئەم کارە بە کارێکی خراپ و نادروست و نائەخلاقی سەیربکرێت.

ئەم تیۆریە دەڵێت ئەرکی ئەخلاقیمان بریتییە لە هاندانی خۆشبەختی گشتی. بۆ دەبێت ئەم کارە بکەین؟ چۆن وەڵامی چیرۆکی ئەڵقەکە دەدرێتەوە؟ جۆن ستیوارت میل بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە: هەستەکەم کە ناچارنەکراوم بە دزیکرن و کوشتن و خیانەت و هەڵخەڵەتاندنی ئەوانی دی، بەڵام بۆ ناچارکراوم و پەیوەستم وەک ئەرکێکی ئەخلاقی بە هاندانی خۆشبەختی گشتی؟ ئەگەر خۆشبەختی خۆم لە شتێکی تردا ببینمەوە ئەی بۆ لەوانەیە پەسەندی نەکەم؟ میل پێیوایە سەرەڕای ئابڵووقە دەرەکییەکان وەکو یاسا و ڕای گشتی، کە تاکە هۆکارێکی لۆجیکین بۆ پەسەندکردنی ئەمە یان هەر ستانداردێکی تری ئەخلاقی. ئابڵووقەی ناوەکی ئەخلاق پێویستە هەمیشە هەستێکی سەرچاوەگرتوو لە عەقڵ بێت بەبێ گوێدانە ئەوەی ئەم هەستە دەبێتە پاڵپشت بۆ چ ئەخلاقیاتێک.

لەم ئابڵووقە ناوەکییەدا ئەخلاقیات دەبێتە بابەتێکی "سەبجێکتیڤانە" چونکە هەستێکە دەرهاویشتەی عەقڵ و نابێت پرسیار لە چییەتی ئەم ئابڵووقە ناوەکییە ببێتە مایەی شەرمەزاری لای لایەنگرانی تیۆریەکە؟ چونکە ئەو ئابڵووقە ناوەکیانە ئەو هەستانەن کە پەیوەستن بەویژدانی مرۆڤەوە، بێ گومان هەر کەسێک کە خاوەنی هەستە ویژدانییەکان نییە، نابێتە خاوەنی ئابڵووقەیەکی ناوەکی، هەروەها دەڵێت بنەمایەکی ئەخلاقی تر نییە ئەوەندەی ئەم بنەمایە مرۆڤ پەیوەستبکات بە بڕیاری ئەخلاقییەوە. بەهۆی ئەمەوە ئەو جۆرە ئەخلاقیاتەی کە پەسەندی دەکەین پشتدەبەستێت بە سرووشتی هەستەکانمان، گەر مرۆڤ خاوەنی هەستی بە کۆمەڵایەتیبوون بوو، لەم دۆخەدا میل دەڵێت: لەم تیۆریەدا ستانداردێکی سرووشتی دەبێت بۆ مرۆڤ. هەستی بە کۆمەڵایەتیبوون ئارەزووکردنە لە ژیانکردن لە نێو یەکەیەکدا لەگەڵ هاوبوونەوەرەکانماندا.

**-بێلایەنی**

تیۆری سوودگەرایی پەیڕەو لە هەندێک تێڕوانین دەکات کە بەڕاستی سەیرن و لەگەڵ ئەخلاقیاتی کۆندا نایەتەوە. دەتوانرێت ئەمە بۆ پەیمانی کۆمەڵایەتیش بوترێت، چونکە پەیڕەو لە زۆر تێڕوانین و بنەمای هاوشێوە دەکەنەوە، وەک ئەوەی کە پێشتر ئاماژەمان پێکردن دەربارەی سزادان، جیاوازی ڕەگەزی، مافەکانی ژنان، کووشتن لە پێناو ڕزگاربوون لە ئازار و هاوڕەگەزبازێتی. بەڵام لەیەک خاڵدا زۆر جیاوازییان هەیە، لایەنگرانی ئەم تیۆریە پێیانوایە کە ئەرکێکی ئەخلاقی گەورە و فراوانمان لەسەرشانە بۆ یارمەتیدان و هاوکاریکردنی هەموو خەڵک بەڵام لایەنگرانی تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی نکۆڵی لەم تیڕوانینە دەکەن.

بۆنموونە , وادابنێ کە تۆ دەتەوێت هەزار دۆلار خەرجبکەیت بۆ کڕینی ڕاخەرێک بۆ ژووری نوێی میوانت , ئایا پێویستە ئەم کارە بکەیت؟ ئەی ئایا ئەڵتەرناتیڤ و بەدیلەکان چین گەر ئەو پارەیە خەرجنەکرا؟ یەکێک لەبەدیلەکان ئەوەیە کە ئەو بڕە پارەیە ببەخشیت بە ڕێکخراوی پاڵپشتی دارای مناڵانی نەتەوە یەکگرتووەکان. لە هەر ساڵێکدا ١٠ تا ٢٠ ملیۆن منداڵ لە وڵاتانی جیهانی سێهەم گیان لەدەستدەدەن تەنها لەبەر نەبوونی هەندێک داوودەرمانی پزیشکی کە زۆر بە ئاسانی لە وڵاتانی تردا دەستدەکەون و تێچوونێکی زۆر کەمیشیان هەیە. هەروەها ئەو نەخۆشیانەی کە تووشی دەبن لەوانەیە بە چەند حەبێکی سادە چارەسەربکرێن، بۆیە گەر کڕینی ڕاخەرەکە بۆ ماوەیەک دوابخات و لەسەر ڕاخەرە کۆنەکە دابنیشێت و پارەکە ببەخشێت بە ڕێکخراوێکی خێرخوازی، ئەوا دەتوانێت بەو بڕە پارەیە ژیانی زیاد لە ١٠ کەس لە مردن ڕزگاربکات. لەم تیۆرەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەرکی ئەخلاقی بریتیە لە گەڕان بە دوای تێکڕای دەرئەنجامێک کە لە

بەرژەوەندی هەموو کەسێکدایە، گوومانی تێدا نییە کە دەبێت ئەو برە پارەیە ببەخشرێت بە رێکخراوێکی خێرخوازی چونکە رزگارکردنی ژیانی خەڵک لە مردن ئەرکێکی گەورەتری ئەخلاقییە لە چاو کرینی راخەرێکدا، هەروەها ئەو سوودەی کە لە بەخشینی پارەکە دەکەوێتەوە زۆر زیاترە لەوەی کە لە کرینی راخەرەکە دەکەوێتەوە. بەڵام بۆچوونی تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی زۆر جیاوازە، چونکە پەیمانی کۆمەڵایەتی پشتدەبەستێت بە ئەو پەیمانەی کە لەنێوان خەڵکیدا دەبەسترێت، بەڵام دەبێت ئەوەمان لە بیرنەچێت کە هۆکاری سەرەکی لە بەستنی ئەم پەیمانە پارێزگاریکردنە لە بەرژەوەندییەکانمان، بەڵام لە تیۆری سوودگەرایدا ئەرکە ئەخلاقیەکانمان دەکەونە پێش بەرژەوەندییەکانمانەوە و هەندێک کات لە دژی بەرژەوەندییەکانی خۆمان دەوەستێتەوە. لەراستیشدا ئەوە بە سوودی هەموومان دەشکێتەوە و لەوانەیە باشترین بەرژەوەندیمان لەوەدابێت کە ئەم ئەرکە دوولایەنە پەسەندبکەین بۆ یارمەتیدانی ئەوانیتر لە هەر کاتێکدا کە توانامان هەبێت، بەڵام ئایا خەڵکە ژیر و عاقڵەکان ئەرکێکی گشتی پەسەند دەکەن کە پاڵپشتییەکی ناسنووردارە بۆ بیانییەکان و تەنانەت کە لە تێچوونی زۆر و لەبەرژەوەندی یارمەتیدەر و بەخشەر خۆیدا نیە ئەو کارەی کە دەیکات.

خاڵی جیاواز و گرنگ لە نێوان هەردوو تیۆرییەکەدا ئەوەیە کە تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی لە نێو بازنە و چوارچێوەیەکی دیاریکراوی خەڵکیدا پەیرەودەکرێت، بەمانایەکی تر ئەرکی ئەخلاقی لە تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتیدا لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانمان پەیرەودەکرێت، بەڵام بە پێچەوانەوە لە تیۆری سوودگەرایدا مرۆڤ هەمیشە ئەرکە ئەخلاقییەکەی لە جیهاندا و لەودیو سنوورەکانەوە رەنگدەداتەوە، ئەمە لەلای تیۆریناس (جان ناڤێرسون) بە روونی لە کتێبەکەیدا لەسەر ئەخلاق دەردەکەوێت.

ئایا کام بۆچوون و تێروانین بۆ ئەخلاق راست و درووستە؟ ئایا ئەرکێکی ئەخلاقیمان لەسەرە ناچارمان بکات بە دابینکردنی یارمەتی بۆ کەسانی بیانی و دوور لەو بازنانەی کە خۆمان تێیاندا دەژین یان ئەو ئەرکە ئەخلاقییە فراوانەمان لەسەر نییە؟ لە کۆتاییدا هەردوو بۆچوونەکە پەیوەستن بە سۆزەکانمانەوە. یەکێک لە خاڵە جەوهەرییەکانی ئارگومێنتی ناڤێرسون ئەو راستییەیە کە ئێمە بایەخی زیاتر بە هەندێک کەس دەدەین لە ئەوانیتر، وەک دەڵێت بایەخی زیاتر بە منداڵەکانی خۆمان دەدەین تا منداڵانی بیانی و دوور لە خۆمان. ئایا دەکرێت لەبەر هەندێک سوودی لاوەکی منداڵەکانی خۆمان، ژیانی منداڵانی تر لە یادبکەین؟ وادابنێ دوو دووگمە لەسەر مێزەکەت هەیە، بە دەستنان بە دووگمەی (A) دا دەتوانیت ئاهەنگێکی جوان بۆ کورەکەت سازبکەیت، بەڵام بەدەستنان بە دووگمەی (B)دا ژیانی دەیان بیانی و نائاشنا رزگاردەکەیت. ئایا ئەوە کارێکی راست و شیاو دەبێت گەر دەستبخەیتە سەر دووگمەی (A)؟ تەنها لەبەرئەوەی ئەو کورتە و دەبێت بایەخی زیاتری پێبدەیت , میل دەڵێت دەبێت لە بریاردانda پشت بە هەستەکانمان ببەستین کە مەبەست لێی هەستە ویژدانییەکانمانە، هەروەها دەڵێت گەر ویژدانمان هەبێت و بیربکەینەوە ئەوا ناتوانین دەستبنێین بە دووگممەی (A)دا.

سەرچاوە: لە کتێبی (The Right Thing to Do)، لە نوسینی ( جەیمس رەیچڵ و ستوارت رەیچڵ)، دەزگای (McGraw-Hill)،پەرەکانی ١-١٥

# ئەخلاق لە سەردەمی نوێدا

نووسینی: مستەفا مەلەکیان
و. لە فارسییەوە: فاتیمە ئەدهەم

لە ڕۆژگارێکدا ژیان بەسەر دەبەین کە پێویستی مرۆڤ بۆ ژیانی ئەخلاقیانە و ئەخلاقیانەژیان لەبەر چەند هۆکارێک کە باسیان لێوە دەکەین زۆر لە سەردەمەکانی پێشوو پێویستترە، بە درێژایی مێژوو مرۆڤ نیازمەندی ژیانی ئەخلاقیانە بووە، هیچ کات پایەی ئەخلاق و ئەخلاقیانەژیان بۆ مرۆڤ شتێکی زیادە و جوانکاری نەبووە. بەڵام لە ڕۆژگاری نوێدا واتە ڕۆژگاری پاش شەڕی جیهانی دووەم، پێویستی مرۆڤ بە ژیانی ئەخلاقیانە پلە بە پلە بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا زیاتر بووە.

ئێستا کە لە ڕۆژگارێکدا ژیان دەگوزەرێنین کە پێویستیمان بە ئەخلاقیانە ژیان زۆر گرنگتربووە و لەلایەکی ترەوە ئەخلاقیانە ژیان پلەپلە بە بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی پێشوودا دژوارتر و پڕ کێشەدارتر بووە، هەم گەڕانەوە بۆ ئەخلاق و هەم قوڵبوونەوە لە ئەخلاقدا هەردووکیان دەبێت لەم ڕۆژگارەدا زیاتر لە لایەن بیرمەندان و چاکسازان و دڵسۆزانی بارودۆخی مرۆییەوە جەختیان لەسەر بکرێتەوە. من لێرەدا لەو ڕووەوە قسە دەکەم کە بە چ هۆکار و بەڵگەیەک ئێمەی مرۆڤ ئەمڕۆ نیاز و پێویستمان



مستەفا مەلەکیان

بە ئەخلاقە زیاتر لە ڕۆژگارانی پێشوو و هەروەها بە چ بەڵگە و هۆکارێک ژیانی ئەخلاقیانە لە ڕابردوو دژوارتـــرە. بارودۆخی ئێمە سەبارەت بە ئەخلاق کتومت وەکـو نەخۆشێکە کە لە نیوەی شـەودا پێویستی بە پزیشکە، لە لایەکەوە زیاتر پێویستی پێیەتی لە هەر کاتێکی تر و لە لایەکیترەوە دەست گەیشتن بە پزیشک لە هەرکاتێکی تر کەمترە. من ئەم دوو خاڵە یەک لە دوای یەک عەرز دەکەم، بەڵام پێش ئەم دوو خاڵە دەبێت چوار خاڵ وەکو پێشەکی بڵێم و پاشان برۆمە نێو باسەکەوە. ١-١- لێرەدا کاتێک باس لە ئەخلاق دەکەین ، مەبەست لە ئەخلاق بەمانای ووردی ووشـەیـە، ئەخلاق بەمانای ووردی وشەش واتە ئەخلاقێک کە لەگەڵ مافدا تێکەڵ نەبێت، ئەخلاق دیاردەیەکە و ماف دیاردەیەکی تر. ژیانی ئەخلاقیانە شتێکە و ژیانی یاساییانە شتێکە، شتێکی سێیەمیش هەیە کە نابێت تێکەڵ بە ئەخلاق ببێت ئەویش بریتییە لە ئادابی هاوژیانی و مامەڵەکردن کە شتێکی جیا لە ئەخلاقە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا کارمان بەسەر "فقە"یشەوە نیە، چونکە ئەو شتەی ئێمە لە فەرهەنگی ئیسلامیدا ناوی "فقە"ی لێ دەنێین پێکهاتەیەکە لە ئەخلاق، ماف، دابونەریت و ژیانی پێکەوەیی و هاوژیانی.

١-٢- ئەخلاق دەتوانێت سێ جێکەوتی هەبێت، لەم ووتارەدا بە پێویست لەگەڵ جێکەوتی یەکەم سەروکاریمان هەیە، قسەکردن لەبارەی جێکەوتەکانی ترەوە بواری دیکەی پێویستە، لێرەدا جێکەوتی یەکەم لە دووانەکەی پێشوو لێرەدا پێویسترە و لە هەمانکاتدا سەرەتایترە، دەبێت سەرەتا کار لەسەر ئەوە بکەین. ژیانی ئەخلاقیانە سێ جۆر ئەنجامان بەدەستەوە دەدات.

**ا - داخوازییە کۆمەڵایەتیەکان دەستەبەر دەکات:**

ئەگەر هاوڵاتیانی کۆمەڵگەیەک، ئەخلاقیان بژین، داخوازییە کۆمەڵایەتیەکان بە ڕێگەیەکی ئاسانتر، دڵنیاییتر و بێ کێشەتر دێنە دی. داخوازییە کۆمەڵایەتییەکان واتای چیە؟ داخوازییە کۆمەڵایەتییەکان گەلێک زۆرن بەڵام هەمیشە پێنج داخوازی بە گرنگترین داخوازییە کۆمەڵایەتییەکان دەژمێردرێن، ئەوانیش:١- ڕێکخستن. ٢- ئاسایش. ٣- خۆشگوزەرانی. ٤- عەدالەت. ٥- ئازادی.

**ب - داخوازییە دەروونناسیەکان فەراهەم دەکات:**

جێکەوتی دووەمی ئەخلاق: دەست گەیشتنە بە داخوازییە دەروونیەکان: واتە کاتێک تاکێک ئەخلاقیانە مامەڵە دەکات، لەگەڵ ئەوەی داخوازیە کۆمەڵایەتیەکانیش فەراهەم دەبن، ئەوا داخوازییە دەروونیەکانی خودی خۆشی دەست دەکەوێت، مرۆڤێک کە ئەخلاقیانە دەژی لەگەڵ کەسێک کە ئەخلاقیانە ناژی لە ڕووی دەروونیەوە جیاوازە، ژمارەی ئەم داخوازییە کۆمەڵایەتیانە دیاریکراوە، هەرچەندە جیاوازی لە نێوان دەروونناساندا هەیە بەڵام هەموویان بە لایەنی کەمەوە لەسەر ئەم چوار داخوازییە کۆکن: ١- ئارامی و ئارامش. ٢- شادی دەروونی. ٣- ڕازیبوونی دەروونی. ٤- دۆزینەوەی مانای ژیان.

**ج - گۆڕانی رۆحی لە مرۆڤدا دروست دەکات:**

جێکەوتی سێیەمی ژیانی ئەخلاقیانە ئەوەیە کە گۆڕان بەسەر ڕۆحی مرۆڤەکاندا دەهێنێت، گۆڕانی ڕۆحی مرۆڤ شتێکە لەسەرووی ئارامش و ئارامی، شادمانی، ڕازیبوونی ناوەکی و دۆزینەوەی مانایە، گۆڕانی ڕۆحی واتە مرۆڤ لەم دۆخەی کە تیایدایە دەگۆڕێت بۆ مرۆڤێکی تر. جۆرێک لە گۆڕانی حاڵ و باروودۆخ بۆ مرۆڤ دێتە پێشەوە کە وورده وورده پەیوەست بوونەکانی جیاواز دەبن. کاتێک ئێوە کردارێکی ئەخلاقی وەکو بەخشین ئەنجام دەدەن، جێکەوتی کۆمەڵایەتی ئەو کردارەتان دیاریکراوە، بە دڵنیاییەوە بە بەخشین هەندێک لە جێکەوتی کۆمەڵایەتی دەهێنێتە دی، بۆ نموونە لە ڕووی خۆشگوزەرانیەوە یارمەتی بەرامبەرەکەتان داوە. بەخشینی ئێوە جێکەوتێکی تاکە کەسیشی هەیە، ئەویش ئەوەیە ئێوە بۆ ئەنجامدانی کارێک هەست بە ئارامیەک دەکەن، ئەگەر ئەو هەژارەتان برەنجاندایە هەستتان ئەم ئارامیەی نەبوو لە جێگەیدا توشی دوودڵی و دڵەراوکێ دەبوون. ئەم کردارە جۆرێک ڕەزامەندی ناوەکی دروست دەکات، بەڵام جێکەوتێکی سێیەمیشی هەیە ئەویش ئەوەیە پەیوەندی ئێوە وورده وورده لەگەڵ ماڵ و ساماندا کەم دەبێتەوە، ئەمە گۆڕانێکی ڕۆحیە کە وورده وورده تاک پەیوەندی لەگەڵ دونیا و شتە دونیاییەکاندا — واتە سەروەت و سامان، توانا، ناوبانگ، خۆشویستن، جێگە و پلەی کۆمەڵایەتی - کەمتر دەبێتەوە، کاتێک پەیوەندی مرۆڤ بەم شەش شتە کەم دەبێتەوە، جۆرە گۆڕانێکی مەعنەوی لە تاکدا دروست دەبێت.

ئەم گۆڕانە مەعنەویە مرۆڤ لە حاڵەتی پێشووی زیاتر گەورە دەکات، لە جێکەوتی دووەمدا - جێکەوتی دەروونناسی - ئێوە هەر ئەو کەسەن بەم جیاوازیەوە کە پێشتر دوودڵیتان هەبووە بەڵام ئێستا ئارامن، بەڵام لە گۆڕانی سێیەمدا ئێوە

گەورەتر دەبن، گەشەی مەعنەوی پەیدا دەکەن بەو مانایەی کە زەرفیات بوونتان بە ساتی جیاواز زیاتر دەبێت.

ئەخلاق ئەم سێ جێکەوتەی هەیە، لەم باسەدا من تەنها جەخت لەسەر جێکەوتی یەکەمی ئەخلاق، واتــە جێکەوتی کۆمەڵایەتی ئەخلاق دەکەمەوە. لێرەدا کاتێک کە دەڵێین ئەمڕۆ زیاتر لە هەر کاتێک پێویستمان بە ژیانی ئەخلاقیانە هەیە ئەم پێویست بوونە تەنها لە ساتی جێکەوتی یەکەمدا باس دەکەم و جێکەوتی دووەم و سێیەم - ئەگەر چی زۆر بەڕێز و بەربڵاون- لە قۆناغەکانی دواتــردا دێـن. سەرەتا دەبێت ئێمە جێکەوتە کۆمەڵایەتیەکانی ژیانی ئەخلاقیانە فەراهەم بکەین تاکو دواتــر بە جێکەوتە دەروونناسی و تاکە کەسی و دواتر باس لە جێکەوتە ڕۆحانی و باڵاکان "Transcendental" دەکەین.

٣-١- بەڵام خاڵی سێیەم ئەوەیە کە کاتێک باس لە دۆخی ئێستای مرۆڤ دەکەین و لە دڵی زانینی ئەمەشەوە نیازی زیاتری مرۆڤی ئەمڕۆ بە ژیانی ئەخلاقیانە و قورس بوونی زیاتر وێنا دەکەین، ئەم هەواڵ زانینەش ڕاڤەی ئەو شتەیە کە ڕوویداوە، بــەڵام بە مانای بەهای داوەریــکـردن لەبارەی ئەو شتە نیە. ناڵێین ئەو شتەی کە ڕوویــداوە چاکە یان خراپ، تەنها دەڵێین ڕوویـداوە. کاری پزیشک چارەسەرکردنی خـودی نەخۆشە نەک سەرزەنشتکردن و سەرکۆنەکردنی. پزیشک دەبێت ئەم دۆخەی نەخش بە ناونیشانی واقیعیەتێک قبوڵ بکات و بە قبوڵکردنی ئەم واقیعیەتەش چارەسەری نەخۆشیەکە دەکات.

کاتێک دەوترێت مرۆڤی ئەمڕۆ دوچاری ئەم بـارودۆخ و حاڵەتە بۆتەوە، مانای ئەوەنیە کە" باش بووە دوچاری بووە" یان" خراپە کە دوچاری بووە" لە بنەرەتدا کارم بەسەر چاکە و خراپەیەوە نیە. باس لەوەیە کە ئێمە لە دۆخێکی لەمجۆرە ژیـان بەسەر دەبەین و لە بنەڕەتیشدا بەهای داوەری پۆزەتیف یان نێگەتیف مان نیە.

٤-١- خاڵی چوارەم ئەوەیە کە نابێت هیچ کات گوزەرکردنی دەروونناسی لەگەڵ گوزەری لۆژیکی بە هەڵە تێکەڵ بکەین، هەندێجار داخوازییەک لە ڕووی لۆژیکیەوە داواکاریەکی دیکە دەبەخشێت و هەندێجاریش داخوازییەکی لۆژیکی داخوازییەکی دیکە دەدات، بەڵام ڕەنگە لە ڕووی دەرونیەوە بەرەو ئەو داخوازی و داواکارییەتان بگوێزێتەوە. بۆ نموونە ئەگەر من بە ئێوە بڵێم "ئێستا شەوە" لەم گوزارەیەوە ئەو ئەنجامە دەگیرێت کە " ئێستا ڕۆژ نیە". واتە لەم گوزارەیەوە دەتوانین تەنها ئەم ئەنجامە وەربگرین و زیاد لەمەش شتێکی دیکە وەرناگیرێت "لە ڕووی لۆژیکیەوە گوزارەیەکی دیکەی لێ دەرناهێنرێت"، ئەگەر ئێمە ئامێرێکمان هەبێت کە بیر بکاتەوە و ئەم گوزارەیەی پێ بدەین، ئەوا تەنها ئەم ئەنجامەی لێوەر دەگیرێت کە " ئێستا ڕۆژ نیە". ئەمە گوزارەیەکی لۆژیکیە، گوزارەی لۆژیکی واتە گوزارەیەک لەسەر بنەمای ڕێسا و یاسای ئیستیدلالی لۆژیکی لە تەنها گـوزارەیـەکـەوە شتی لێ دەردەهێنرێت. بەڵام لە زۆرکاتدا کەسێک شتێک دەڵێت و لە هزر و مێشک و دەروونی ئەو کەسانەی کە ئەم ڕستەیە دەبیستن، چەند گوزارەیەکی دەروونناسی دروست دەبن، هەر لەم نموونەیەدا مومکینە گوێگر لەم گوتەیەی من "ئێستا شـەوە" ئەنجامێکی دیکە

وەربگرێت، بۆ نموونە:" ئێستا چ کەسێک لای منداڵەکانمە." یان "ئێستا من چۆن سەیارەم دەستبکەوێت و بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە؟" . ئایا ئەم ڕستانە ووتەکانی من بوون؟ نەخێر! بەڵام ئێوە بە بیستنی ئەم ڕستەیەی من لەگەڵ شتەکانی دەروونتان زنجیرەیەک شتی دیکە دێتە نێو هزر و مێشکتانەوە.

ئەم پێشەکیەم بۆیە عەرز کرد کە هەندێک لەو کارانەی بۆ مرۆڤی ئەمرۆ هاتونەتە پێشەوە، ئەنجامی گەڕان و دۆزینەوەی لۆژیکی مرۆڤ نین، بەڵام دەبنە ئەنجامی دەروونناسی مرۆڤ. واتە بارودۆخی ئەمڕۆی مرۆڤ ئەنجامی لۆژیکی دۆزینەوەکانی نیە و نابێت لە ڕووی لۆژیکیەوە بەم دۆزینەوانە بگەین. مرۆڤ تەنها لۆژیک نیە، ئەگەر مرۆڤ تەنها و تەنها ئامێرێکی بیرکەرەوە یان کۆمپیوتەرێک یان شتێکی هاوشێوەی کۆمپیوتەر بوایە، لە دۆزینەوەکانی تەنها دەرەنجامی تایبەتی دەست دەکەوت نەک شتانی دیکە. بەڵام مرۆڤ تەنها ئامێری بیرکەرەوە نیە، جگە لە بازنەی بیرکردنەوە بازنەی دیکەی بەناوی هەستەکان و سۆزەکان و هەڵچونەکانیشی هەیە، جگە لەم بازنەیە بازنەی دیکەی بەناوی نیاز و ویست و داخوازییەکانی هەیە. پێکهاتەی ئەم سێ بازنەیە، واتـەی بازنەی ئەندێشەکان، باوەڕەکان، زانیارییەکان لەگەڵ بازنەی نیاز و ویست و داخوازییەکان، بەم بازنانەشە کە مرۆڤ پێکدەهێنن، لەم ڕوەشـەوە کە ئەو قسانەی بۆ مرۆڤ دەگوێزرێنەوە تەنها و تەنها هەروا تێپەر نابن و تەنها ئەنجامی لۆژیکیان لێ بەدەست ناهێنرێت، بەڵکو لە بوارەکانی تریشدا تێدەپەڕێت و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی گوزارەی " ئێستا شەوە" لە هزر و مێشکی زۆرێک لە مرۆڤەکاندا دەیەها ئەنجامی سـۆزاوی، دەروونـی وجوڵێنەر دروست بکات کە دەرەنجامی لۆژیکی ئەم گوزارەیە نین. ئێستا بەم چوار پێشەکیە دەچینە سۆراغی بنەڕەتی باسەکە، ئەم پێشەکیانەتان لە هزردا بێت و لێیان بێئاگا نەبن.

٢. بانگەشەی یەکەمی قسەم ئەوەیە کە ئەمڕۆ نیاز و پێوستی ئێمە بە ئەخلاق زیاتر لە هەر کاتێکی ترە، مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە ئەخلاق هەبووە، بەڵام ئەمڕۆ زیاتر لە جاران پێویستی بە ئەخلاقە. پاش شەڕی جیهانی دووەم، سەرەتا لە ئەوروپادا و ئەوروپای باکور و ڕۆژئاوادا و هەروەها لە ئەمریکای باکوردا و پاشتر هەموو جیهان کەم تا زۆر و بە پلەی جیاواز، چەندین گۆڕانکاری لە جیهانی مرۆییدا ڕوویدا و ئەمەش بوویە هۆی ئەوەی کە ئێستا لە دۆخێکدا بین کە پێش شەڕی جیهانی دووەم و-بە ڕێگەی یەکەمیش لەسەدەی نۆزدە و سەدەکانی پێشووتردا — لەو دۆخەدا نەبووین و ئەم بارودۆخەش بوو بەهۆی ئەوەی کە ئێمە ئەمڕۆ پێویستیمان بە ژیانی ئەخلاقیانە زیاتر بێت.

٢-١- لە ڕۆژگارانی پێشوودا ئەخلاق بۆ چۆنیەتی ژیانمان پێویست بوو، بەڵام مانەوەی چەندیەتی کۆمەڵگە بە بێ ئەخلاق کەم تا زۆر شیمانەی بوونی هەبوو، کۆمەڵگە کۆنەکان لە ڕووی دابینکردنی ئەو دۆخەی کە پێویست بوو، پێویستی بە ئەخلاق بوو بەڵام دەیتوانی خاوەنی چەند ڕێسا و یاسایەکی ئەخلاقی کەمتر و کەمتر بێت و لەگەڵ ئەمەشدا بتوانن لە ڕووی چەندیەتیەوە درێـژە بە ژیانی خۆیان بدەن. لەو ڕۆژگارانەدا ئەخلاق چۆنیەتی

بە ژیان دەبەخشی و چەندێتی ژیانمان کەمتر پەیوەست بوو بە ئەخلاقەوە، ناڵێم هیچ وابەستەی ئەخلاق نەبوو، بەڵام کەمتر پێوەی پەیوەست بوو. بەڵام ئەمرۆ ئێمە ئەگەر مرۆڤەکان ئەخلاقیانە ژیان بەسەر نەبەین لەم حاڵەتەدا هەر بەو جۆرەی لە هەواڵ و ڕاپۆرتەکانی نەتەوە نێودەوڵەتیەکاندا هاتووە، ژیانمان نەک تەنها لە ڕووی چۆنایەتیەوە زیانی پێدەگات بەڵکو لە ڕووی چەندێتیشەوە لە شەش ڕووەوە بە سەختی لە مەترسیدایە:

١.پیسبوونی هەوا، ٢.پیسبوونی ئاو، ٣.لە دەستچوونی دارستانەکان کە ژینگەکەمان پاک و خاوێن ڕادەگرن، ٤. هەژارتر و هەژارتربوونی ڕۆژبەڕۆژی خاک، ٥. سەرهەڵدانی نەخشی نوێ، ٦. دەرکەوتنی شەڕی ناوەکی.

ئەم زیانانە کە ڕووبەڕووی چەندێتی ژیانمان واتە ژیانی بایۆلۆژیمانن، دەرەنجامی بەکارهێنانێکە کە یەکێکە لە گەورەترین ڕەزیلەتە ئەخلاقیەکان. کە پیسبوون ڕوویدا نەخۆشی نوێ لە دایک دەبن و ئەم نەخۆشیانەش تەنها چارەسەریان دروستکردن و دۆزینەوەی دەرمانی نوێیە، ئەمە خاڵێکە کە لە هەواڵە جیهانیەکاندا دەوترێت: ئەو نەخۆشیانەی کە لەم بیست ساڵی دواییدا ڕووبەڕوویان بوینەتەوە یەکەمین جارە مرۆڤایەتی لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە.

ئەوتوانایەی کە جەنگی ناوەکی پێی بەخشیوین لە ڕاستیدا توانایەکە کە مانەوەی چەندایەتی مرۆڤایەتی خستۆتە مەترسیەوە. جەنگیز ئەگەر لە سەردەمی خۆیدا تەواوی تەمەنی لەسەر پشتی ئەسپ بووە و کوشتن و برینی دەکرد، دەیتوانی هێندەی چەند خەڵک بگوژێت و لەناوبەرێت؟ ئەو ژمارەمرۆڤەی کە جەنگیز لە هەموو تەمەنیدا دەیتوانی بکوژێت، ئێستا لە دە دەقیقەدا دەتوانرێت بکوژرێن، بە فشار خستنە سەر دوگمەیەک تەواوی ئەو کوشتنانەی بە درێژایی مێژوو ڕوویانداوە لە نیوەی ڕۆژێکدا دەتوانرێت ئەنجام بدرێت. ئەمە واتە ئەگەر کەسێک ئەم توانا و لێهاتنەی بەدەستهێناوە ئەگەر ئەخلاقی نەبێت، توانای وێرانکردنی زۆر زۆرە، کاتێک جەنگیز لە ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلام خەڵکی دەکوشت، خەڵکی لە ئەندەلوس و ئیسپانیا ژیانی خۆیان بەسەر دەبرد. بەڵام ئێستا چ شوێنێکی جیهان هەیە کە ئەگەر وێران ببێت خەڵکی لە شوێنەکانی دیکەی جیهانەوە بتوانن بە پێی ژیانی ئاساییان بژین و درێژەی پێ بدەن. کەواتە لە ڕابردوودا بە نائەخلاقیانەژیان تەنها چۆنیەتی ژیان دەکەوتە مەترسیەوە بەڵام ئێستا چەندێیەتیشی دەکەوێتە مەترسیەوە.

٢-٢- بەڵام پێویستی دووەم بە ژیانی ئەخلاقیانە ئەوەیە کە پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنۆلۆژیا ببێتە هۆی ئەوەی کە توانای چوونە ناو ژیانی ئەوانی ترەوە زیاتر لە جاران بێت. پێنج سەد ساڵ پێش ئێستا ئەگەر کەسێک بیویستایە زیان بە گیانتان بگەیێنێت، بە دڵنیاییەوە دەبوو لە بیست مەتر نزکیتر بێت لە ئێوەوە هەرچ کاتێکیش لە بیست مەتر زیاتر بووایە ئەوا ئێوە لە ئارامی و دوور لە مەترسیی بوون، لەبەرئەوە تاکو کاتێک کەسێک تەنانەت لە دوژمنانەترین ژینگەکان و بێگانەترین و دوورترین بیابانەکان و شارەکان، ئەگەر لە بیست مەتر دوورتر بوایە لەم کەسەوە بە ئاسودەیی بە ڕێگادا دەڕویشت چونکە لە لایەن کەسێکەوە نەدەکەوتە مەترسیەوە، ئیدی هەر کەسێ بوایە

تیر هاوێژە یان کەسێکی دی بەلایەنی کەمەوە دەبوو بیست مەتر لەو کەسەوە نزیکتر بوایە ئینجا دەیتوانی ئازاری پێ بگەیێنێت. بەڵام ئێستا کە لە ژوورەکەی خۆتانەوە دانیشتوون دەتوانن لە چەند مەترێکی نزیکتانەوە لە مەترسی دڵنیابن؟ کتومت ئەگەر لە خاڵێکی بەرامبەرتانەوە لە لاکەی دیکەی کورەی زەویەوە کەسێک دانیشتبێت توانای ئەوەی هەیە مەترسی بە ئێوە بگەیێنێت. تەکنۆلۆژیا بۆتە هۆی ئەوەی کە ئێمە توانای ئەوەمان زیاتر بووە تاکو لە کاروباری خەڵکیدا تەداخول بکەین. لە کۆندا ئەگەر کەسێک بویستایە دەنگی ئێوە ببیستێت، لە دووری سەد مەتر زیاترەوە نەیدەتوانی دەنگتان ببیستێت. لەبەرئەوە ئەگەر لە سەد مەتر لە دووری منەوە کەسێک نەبوو تۆ دەتوانی قسە بکەیت و دڵنیا دەبوویت کە کەسێک نیە نابیستێت، بەڵام ئەمرۆ ئێوە دەتوانن قسە بە گوێی چ کەسێکدا بکەن و دڵنیابن لەوەش کەسێک نەیبیستووە. ئەگەر ووردببنەوە بازنەی ئاسایش تان گەیشتۆتە سفر، واتە ئێوە لە هیچ روویەکەوە ناتوانن برۆن بۆ جێگەیەک و هەست بە ئاسایش بکەن و هەرچی دڵتان خوازیاریەتی ئەنجامی بدەن، لەبەرئەوەی کاری تەکنۆلۆژیا ئەوەیە کە ئەو شتەی دوورە بۆ تۆی نزیک دەکاتەوە و هەروەها بۆ ئەوانی دیکەشی نزیک دەکاتەوە. تەکنۆلۆژیا جیاوازی ناکات، ئەکەر دەتانوێت دەنگێک لە ئەمریکاوە ببیستن بۆتان نزیک دەکاتەوە، دەنکی ئێوەش بۆ هەرکەسێک کە دەیەوێت لە ئەمریکا گوێی لێبێت نزیکی بخاتەوە، تەکنۆلۆژیا هەموو جۆرە دووریەک کەم دەکاتەوە، دووری شوێن و کات و حاڵ و دۆخ کەم دەکاتەوە، تەکنۆلۆژیا لە پێناسەیەکدا واتە، کەمکردنەوەی دووری شوێن و کات و ئێستا و ئەم کەمکردنەوەیەش تەنها بۆ من نایەتە دی بەڵکو بۆ دوژمنانیشم دێتە دی و لەبەردەستدایە و لەگەڵ ئەوەشدا بۆ چاودێرەکانم و تەنانەت بۆ ئەوانەش کە نایانەوێت من بن هەر دەست دەکەوێت.

لە ڕاستیدا ئێستا ئێمە توانای چوونە ناو بارودۆخی ئەوانیترمان پەیدا کردووە کە پێشتر ئەمەمان نەبووە، دەستێکی درێژمان پەیدا کردووە کە دەتوانین بۆ هەر گۆشەیەک لە جیهان ئەکەر بمانەوێت دەست درێژ بکەین و هەربەهەمان شێوەش دەستەکانی ئەوانی تر بۆ ئێمە درێژە و هیچ کەس بێ توانا نیە لە ئەنجامدانی کارێکی لەمجۆرە. لە ڕابردوودا "دەستی ئێمە کورت و خورما لەسەر دارخورما" بوو، بەڵام ئەمرۆ بە یارمەتی تەکنۆلۆژیا ئیدی " دەستمان کورت و خورما لەسەر دارخورما: نیە. لەبەرئەوە لە کۆندا ئەکەر کەسێک ئەخلاقیانە ژیانی بەسەر نەبردایە، جارێکی دی ئازار و زیانی کەمتر دەگەیشتە لاتان، بەڵام ئەمرۆ ئەگەر کەسێک نەیەوێت ئەخلاقیانە بژی ئازار و زیانی بە ئێوە دەگات، هەربەو جۆرەی ئەگەر ئێوە ئەخلاقیانە ژیان بەسەر نەبەن زیان و ئازارتان بەوانی تر دەگات.

٢-٣- پێویستی سێیەم ئەوەیە کە تەکنۆلۆژیا کاریگەرییەکی دیکەی هەیە و کەمتر سەرنجمان داوە، دەروونناسانی کۆمەڵایەتی و ئەو کەسانەی کە لە دەروونناسی تەکنۆلۆژیا و فەلسەفەی تەکنۆلۆژیادا کار دەکەن سەرنجیان بۆلای بابەتێک ڕاکێشراوە ئەویش ئەوەیە: ئێمە پێشتر بیرمان دەکردەوە کە تەکنۆلۆژیا تەنها بەو ویستانەمان

دەگەیێنێت کە هەمانن، بیری دیکەمان نەدەکردەوە کە خودی تەکنۆلۆژیا ویستێم دروست دەکات. واتە ئەوەی نەک تەنها حەز و ئارەزووە ناکۆتاکانمان کە لەبەر نەبوونی تەکنۆلۆژیا نەدەگەیشتنە ئەنجام و کردار و ئێستا بەشێکی کەمیان دەبنە کردار، بەڵکو تەکنۆلۆژیا بەرامبەر بە خۆی دەمانجوڵێنێت و بزوانمان تێدا دروست دەکات. تەنانەت کاتێک سەیری نینۆکگرێک دەکەین کە لە ڕووکەشدا بێگوناهە، مومکینە مەیل و حەزی کورتکردنەوەی نینۆکامن تێدا دروست ببێت کە ئەگەر ئەم نینۆکگرەمان نەبینیایە ئەم حەز و ئارەزووە پەیدا نەدەبوو. ئێوە ئەو کاتەی کە تەلەفۆنتان نەبوو، بەو جۆرە بوو کە دەتانویست دەنگی چەند کەسانێک ببیستن بەڵام تواناتان نەبوو، ئێستا کە تەلەفۆنتان هەیە نەک تەنها دەنگی هەندێ کەس، بەڵکو دەتانەوێت دەنگی هەنێ کەسی دیکە ببیستن. واتە هۆکارەکان وامان لێدەکەن کە "سوودمان لێوەربگرن". هەر هۆکارێک لەگەڵ ئەوەی بە ڕووکەش ئامادەگی بێتاوانیان هەیە و دەڵێی بە زمانی حاڵ دەڵێن کە "ئەگەر کارێکتان هەیە، لە خزمەتتاین" بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە دڵماندا هەزار وەسوەسە دروست دەبن، هەر هۆکارێکی نوێی و مۆدێرن دێتە تەنیشت مرۆڤەوە، چەند حەز و ئارەزوویەک لە مرۆڤدا دروست دەکەن کە ئەگەر بوونیان نەبوایە ئەم حەزانەش لە ئێمەدا دروست نەدەبوون. ئەمڕۆ هۆکارەکان دێن بۆ یارمەتی مرۆڤ تاکو ئەو ئامانجانەی پێیان نەگەیشتووە پێیان بگات، بەڵام هەڵبەتە ئامانجی نوێ لە هزر و مێشکی مرۆڤ دروست دەکات و گەشەیان پێ دەکات. مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا دەڵێت ئێستا کە ئەم هۆکارەم هەیە، زۆر چاکە کاری دیکەش ئەنجام دەدەم. ئەمە مانای هۆکارە، شتێکی خراپ نیە، تەکنۆلۆژیا شتێکی خراپ نیە، تەکنۆلۆژیا تەنها نالێت: (ئەی ئەو کەسانەی پێویستیتان هەیە وەرن بامن پێداویستیەکانتان جێبەجێ بکەم.) بەڵکو لە هەرشوێنێکی نوێ کە دادەنیشێت چەند پێداویستیەکی تری نوێ بەرهەم دەهێنێت. لە کۆندا هەر مرۆڤێک زەریایەک بوو لە تواناکان بەڵام لە درێژایی تەمەنیدا لەم زەریایە دە شەپۆل دروست دەبن و لە شتەکانی دیکەدا لەبەرئەوەی شتانی دیکە بوونیان نەبووە، هیچ شتێکی دیکەی تێدا دروست نەدەبوو. ئێستا دەم بە دەم ئۆقیانوسە "بالقوە"کانی مرۆڤ زیاتر بە ڕەوی ڕووی "بالفعل" بوون دەڕۆن، واتە هەمیشە نیاز و پێداویستی نوێمان تێدا دروست دەبن. ئەمە شتێکە کە فەیلەسوفەکانی تەکنۆلۆژیا وەکو تیلۆر لە کەنەدا دەڵێت: ئێمە ڕۆژێک دەستمان درێژکرد بۆ لابردنی نیاز و پێداویستیەکانمان، ئێستا دەبینین کە تەکنۆلۆژیاش نیاز و پێداویستیەکانمان جێبەجێ دەکات و هەروەها چەند پێداویستیەکی دیکەمان بۆ دروست دەکات. ئەمەش بۆتە هۆی ئێمە وەکو "تیتان" - وەکو بوونەوەرێکی پەیکەر دێو- مان لێهاتووە، بوونەوەرێک کە تاڕادەیەک دەیەوێت هەموو کارێک بکات.

٢-٤- پێویستی چوارەم ئەوەیە کە لە ڕابردوودا بازنەی ڕێگەپێدانمان هەمیشە لە بازنەی تواناکانمان بچوکتر بوو. ئەگەر مرۆڤ بیتوانیبایە هەموو ئەو کارانەی کە دەیەویستن ئەنجامیان بدات، لە خاڵێکدا وێنەی دەکێشان و پاشان بازنەی ئەو کارانەی کە لەم بازنەی توانایەدان

ڕێگەی بەخۆی دەدا ئەنجامیان بدات ئەوانیش وێنەی ئەوانیشی دەکێشا لەم کاتەدا ئەم بازنەیە واتە بازنەی ڕێگەپێدان بچوکتر بوو لە بازنەی تواناکانی و دڵیدا بـوون. بە دەستەواژەیەکی دیکە مرۆڤی سوننەتی دەیتوانی زۆر لە کارەکان ئەنجام بدا بەڵام ڕێگەی بە خۆی نەدەدا ئەنجامیان بدات، دەیگوت دەبێت ئێمە لە نێوان ئەو کارانەی دەتوانین ئەنجامیان بدەین هەڵبژاردن ئەنجام بدەین، هەندێکیان ئەنجام بدەین و ئەوانی تریش کە دەتوانین ئەنجامیان بدەین ئەنجامیان نەدەین، بۆچی؟ بە بەڵگەی ئەوەی باوەڕی وابوو کە ئەگەر هەموو تواناکانمان بگۆڕین بە ڕێگەپێدان ئەوا بۆ خودی خۆمان و ئەوانی تریش ترسناکە. لەبەرئەوە ئەگەر بتوانیبایە دەست بۆ دە کار ببات، دەستی بۆ کارێک دەبرد ڕێگەی ئەنجامدانی ئەوانی تری بە خۆی نەدەدا، ئەو هەمیشە دەیوت، ڕێگە پێدانم کەمتر لە تواناکانم، بەڵام مرۆڤ وورده وورده بۆ جێگەیەک ڕۆیشت کە هەرچی لە توانایدا هەیە ئەنجام بدات کە ڕێگە بە خۆیشی بدات بۆ ئەوەی ئەنجامیان بدات. بۆیە جۆرێک پوچگەرایی بەها بە مانای وردی وشە، واتە بەهاکان بێبەهان یاخود بە پێوانەیەک بەهایان هەیە، لە هزر و ویژدانی مرۆڤی نوێدا دروست بووە. بە دەستەواژەیەکی دیکە مرۆڤی کۆن پۆلیسێک و پاسەوانێکی دەروونی هەبوو کە دەیگوت: ( لە سەد کاردا، نەوەد کاریان ئەنجام مـەدە.) بەڵام ئیدی ئەم پاسەوانە دەروونیە لە ناو چووە. ئەمڕۆ ئەگەر دەبینیت کەسانێک هێشتا پاسەوانێکی دەرونیان هەیە، هێشتا نەبونەتە ئەمڕۆی ئەمڕۆیی وە گەرنا ئەگەر دروست وەکو ئەمڕۆ ژیانیان بەسەر ببردایە، هەستیان دەکرد

هەرکارێک کە ئەنجامی نادەن لەبەرئەوەیە کە ناتوانن ئەنجامی بدەن و هەرکارێکیش کە دەتوانن ئەنجامی بدەن ڕێگە بە خۆیان بدەن کە ئەنجامی بـدەن، بەمە دەڵێین پوچگەرایی بەها. بەندی ئەرزشیم هێنا تاکو لە جۆرەکانی تری پوچگەرایی جیا ببێتەوە.

پوچگەرایی بەها واتە هەرکارێک دەتوانی ئەنجام بدە، ڕێگەی ئەنجامدانی ئەو کارە بە خۆت بدە، ئەگەر ئەنجامی نادەیت بەو مانایەیە کە ناتوانی ئەنجامی بدەیت، بە دەستەواژەیەکی دیکە لەم دیدگا نوێیەدا دەبێت بازنەی ڕێگە پێدانەکانمان لەگەڵ بازنەی تواناکانمان یەکسان بن. بەڵام ئەگەر بازنەی ڕێگە پێدانەکانەکانمان یەکسان بن لەگەڵ بازنەی تواناکانمان، لە ڕاستیدا بەرد لەسەر بەرد ناوەستێت و لەناو دەچین. تەنها ڕێگایەک کە بۆ ئەم بابەتە بیرمان لێکردۆتەوە بریتیە لە یاسا، یاسامان بۆ ئەوە داناوە کە نەهێڵین مرۆڤەکان هەرکارێک کە بیانەوێت ئەنجامی بدەن، بەڵام یاسا جێگەی ئەخلاق ناکرێتەوە.

ئەم چوار هۆکارە بونەتە هۆی ئەوەی کە بارودۆخ ئێستا زۆر لە جاران جیاوازتر بێت و هەر لەبەرئەمەش زیاتر پێویستمان بە ئەخلاق هەیە، چونکە ئەگەر ئەم ئەخلاقەمان نەبێت ترسناکتر لە باوباپیرانمان توشی نائەخلاقی دەبین و لەبەرئەوەش ئەم چوار هۆکارە هەمیشە فراوان دەبن نەوەکانمان ئەگەر بێ ئەخلاق بمێننەوە لە ئێمە ترسناکتر دەبن.

سەرچاوە: سایتی فەرهەنگی نیلوفر.

# ئەخلاقی فەردی و کۆمەڵایەتی*

نووسینی: برتراند راسل
لەفارسییەوە: ڕێبین هەردی

لەو وتارەدا ئەمەوێت دوو کار بکەم: سەرەتا ئەمەوێ ئەو دەرئەنجامانەی لە وتارەکانی پێشودا بەدەستهاتووە، بە کورتی دوبارە بکەمەوە، دوهەمیش ئەمەوێت تێزە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بە ئەخلاقی فەردیەوە ببەستمەوە کە هەر کەسێک ئەبێت بە ڕێنمایەکانی ئەو بڕواتە پێشێ. لەگەڵ هەموو ئەو خراپیانەی کە دیاریمانکرد و ئەو مەترسیانەی دانمان بە بونیدا نا، لەگەڵ ئەوەشدا ئومێدگەلێک بەم بە ئایندەی زۆر دوری مرۆڤ نا، کە دەرئەنجامی لیکۆڵینەوەکانی ئێمەیە و من بڕوام وایە بەپێی هەڵسەنگاندنی بەهێزی ئەگەرەکان پاساویان هەیە.

سەرەتا پیاچونەوەیەکی خێرا بەسەر سەردێری بابەتەکانی پێشودا: بەشیوەیەکی گشتی دوو

**لە سەرتاسەری مێژوودا تا ئەو جێگەیەی بەڵگە لەبەردەستدایە، بڕوا ئەخلاقیەکان دوو سەرچاوەی یەکجار جیاوازیان هەبووە: یەکێکیان سیاسی و ئەوی تریان پەیوەستە بە باوەڕە دینی و ئەخلاقیەکانەوە**



برتراند راسل

مەبەستی سەرەکیمان بۆ چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان دەستنیشان کرد: لەلایەکەوە ئاسایش و دادپەروەری، پێویستی بە ناوەندێتی کۆنترۆڵی حکومیە کە ئەگەر بڕیارە کاریگەر بێت، ئەبێت بۆ حکومەتی جیهانی گشتگیر بکرێت. پێشکەوتن پێویستی بە فراوانترین مەیدانە بۆ داهێنانی فەردی کە ناکۆک نەبێت لەگەڵ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیدا.

شێوازی دابینکردنی هەرچی زیاتر ئەم دوو ئامانجە، بەخشینی دەسەڵاتە لە حکومەتی ناوەندیەوە بۆ بەرپرسیارە لۆکاڵی و ناوچەییەکان. حکومەتی جیهانی ئەبێت حکومەتە نیشتیمانیەکان لە هەموو شتێکدا جگە لە جەنگ ئازاد بکات، حکومەتە نیشتیمانیەکانیش ئەبێت بەپێی خۆیان ڕێگا بە بەرپرسیارە لۆکاڵیەکان بدەن. لە پیشەسازیدا نابێت وا تەسەور بکرێت کە بەتەئمینکردن هەموو کێشەکان چارەسەر ئەبن. بۆ نمونە پیشەسازیەکی گەورەی وەک ڕێگای شەمەنەفەر ئەبێت تارادەیەکی زۆر سەربەخۆ بێت، پەیوەندی کارمەندان لەگەڵ دەوڵەتدا لە پیشەسازیەکانی تەئمینکردندا، نابێت لاسایکردنەوەی پەتی بێت لەگەڵ کارمەندانی تایبەتی پێشویان، هەر شتێکی وەک ڕۆژنامە و کتێب و پڕوپاگەندەی سیاسی کە پەیوەندی بە بیروڕاوە هەیە ئەبێت ملکەچی ململانییەکی ڕاستەقینە بێت و بە وردی لە هەموو کۆنترۆڵێکی حکومەت و هەروەها لە دەست هەموو شێوەیەکی پاوانخوازی بپارێزرێت. بەڵام ململانێ ئەبێت خاوەن چونایەتیەکی کلتوری و فکری بێت، نەک ئابوری. و نابێت ڕەهەندێکی سەربازی هەبێت یان لە ڕێگەی یاسای سزدانەوە

ئەنجام بدرێت.
لە مەسەلە کلتوریەکاندا مەرجی پێشکەوتن، هەمەڕەنگی و جیاوازیە. دەزگاکانی وەک زانکۆ و ئەنجومەنە زانستیەکان کە جۆرێک سەربەخۆیان لە حکومەت هەیە، لەم رووە زۆر نرخیان هەیە. جێگەی داخە کە ئەمڕۆ بۆ نمونە لە روسیا (یەکێتی سوڤێت) ئەبینین بە فەرمانی ئەو سیاسیانەی هیچ لە زانست نازانن، ئامادەن و ئەتوانن بڕیارە کۆمیدیەکانی خۆیان بە پەنابردن بە هێزی ئابوری یان پۆلیسی ئەنجام بدەن، زانایان ناچارن قسە پڕوپوچەکانی تاریک بیران بسەلمێنن. تەنها بە شێوەیەک رێگری لەم دیمەنە بەزەیهێنەرە ئەکرێت کە چالاکی سیاسیەکان کورت بکرێتەوە بۆ ئەو بوارەی سەڵاحیەتیان تێدایە. بێ شەرمیە ئەوان دەستنیشانی بکەن مۆسیقای باش یان زانای بایەلۆجی باش یان فەلسەفەی باش چیە. من هەرگیز نامەوێت لەم وڵاتەدا ئەمجۆرە شتانە ببینم کە بەپێی سەلیقەی تایبەتی هیچ سەرۆک وەزیرێکی چ رابردوو یان ئێستا یان ئاییندە دیاری بکرێت، تەنانەت گەر بە رێکەوت سەلیقەی کامڵ و بی کەموکوڕ بێت.
هەنوکە دێینە سەر مەسەلەی ئەخلاقی شەخسی بە جیاکردنەوە لە دەزگا کۆمەلایەتی و سیاسیەکان. هیچ کەس نە بەتەواوی ئازادە نە بە تەواوی کۆیلە. مرۆڤ تا ئەوکاتەی سود لە ئازادی وەرئەگرێت، بۆ رێنمادکردنی خۆشی پێویستی بە ئەخلاقی شەخسی هەیە. کەسانێک هەن ئەڵێن مرۆڤ تەنها پێویستە پەیڕەوی لەو رێسا ئەخلاقیانە بکات کە لەلایەن ئەو کۆمەڵگایەوە قەبوڵکراوە کە بەشێکە لێی. بەڵام لەو بڕوایەدام هیچ ئەنترۆپۆلۆگێک بەم وەڵامە رازی نابێت. کاری وەک مرۆڤخۆری یان قوربانیکردنی مرۆڤەکان یان سەربڕین و نمایشکردنی کەلەسەری دوژمنان، تەنها بەهۆی ناڕەزایی ئەخلاقیەوە لە بیروڕا باوەکان، کەم کەم کەوتن. ئەگەر کەسێک بە جدی ویستی بە باشترین شێوەی شیاو بژی، ئەبێ فێربێت رەخنە لەنەریتی خێڵەکی و بیروباوەڕی خێڵەکیانە بگرێت کە لەلایەن هاوسێکانیەوە قەبوڵکراوە.
بەڵام رەنگە کەسێک سەر بە کۆمەڵگایەک بێت، بەڵام لەبەر هۆی ویژدانی ئامادە نەبێت ئەوە قەبوڵبکات کە کومەڵگا بەراستی ئەزانێت. لێرەدا ئەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان بەڵگەی سەنەدبونی دابونەریت و حوجیەتی یاسا. بۆ پاساوهێنانەوە بۆ کارێکی نایاسایی، هۆی زۆر بەهێزتر پێویستە تا پاساوێکی پراکتیکی کە ئەخلاقی باو ئەشکێنێت. رێزگرتن لە یاسا مەرجی پێویست و چاوپۆشی لێنەکراوی بونی هەموو جۆرە رێکخستنێکی کۆمەڵایەتی قابیلی تەحەمولە. کاتێک یەکێک یاسایەک بە خراپ و نا پێویست بزانێت، مافی ئەوەی هەیە و بگرە ئەرکێتی هەوڵ بۆ گۆڕانی بدات، بەڵام لەزۆر حاڵەتی دەگمەندا هەقی شکاندنی ئەو یاسایەی هەیە. من نکوڵی لە بونی ئەو دۆخانە ناکەم کە یاساشکێنی، وەک ئەرکێکی لێدێت، هەر کاتێک کەسێک هەستبکات ملکەچی بۆ فلان یاسا گوناهە، شکاندنی ئەو یاسایە ئەرکی سەرشانێتی.
ئەم حوکمە ئەو رەخنەگرانەش ئەگرێتەوە کە بە هۆکاری ویژدانی رەخنەیان هەیە. رەنگە کەسێک لەبەر هەندێک هۆی ویژدانی رەخنەی لە شتێک هەبێت، و ئێوە بڕواتان وا بێت کە ئەو کەسە زۆر هەڵەیە، بەڵام ناتوانن بڵێن کە ئەو نابێت بەو شێوەیە رەفتار بکات کە ویژدانی داوای ئەکات.

ڕەنگە یاسا بەشێوەیەک دارێژرا بێت کە لە دوو ڕێگا زیاتر بۆ کەسێکی بە ویژدان نەهێڵێتەوە: یان ڕەچاوی یاسا بکات و بەمشێوەیە دوچاری گوناه بێت، یان بۆ خۆپاراستن لە گوناه، کارێک ئەنجامبدات کە لەروی یاساوە تاوانە. یاسادانەری عاقڵ تا ئەوپەڕی توانا هەوڵئەدات خۆی لە دانانی ئەمجۆرە یاسایانە بە دور بگرێت.

هەستئەکەم هەروەها ئەبێت ئەوە قەبوڵبکرێت کە لەهەندێک دۆخدا شۆڕش پاساوی هەیە. لەهەندێک لە حاڵەتاکاندا حکومەت بە یاسا سەرچاوەی کارێکی هێندە خراپە، کە سەرنگونکردنی ئەوە ئەهێنێ ئاژاوە ببێت. ئەم مەترسیە بەڕاستی واقعیە. شایەنی سەرنجە کە سەرکەوتوترین شۆڕشەکان ــ واتە شۆڕشی ١٦٨٨ی ئینگلتەرا و شۆڕشی ١٧٧٦ ئەمەریکا ــ بەدەستی ئەو پیاوانە بەرپاکرا کە بونیان پڕ بوو لە رێز بۆ یاسا. لە جێیەک کە ڕێزگرتن بۆ یاسا نەبوو، ڕەنگە شۆڕش بە ئاژاوە یان دیکتاتۆری بگات. لێرەوە ئەگەرچی ملکەچی بۆ یاسا یەکێک لە بنەما ڕەهاکان نیە، بەڵام ئەبێت وەک بنەمایەک قورسایی بۆ دابنرێت و گرنگی پێبدرێت، و تەنها پاش بیرکردنەوەیەکی کامڵ و عاقڵانە ئەویش لە زۆر کاتی دەگمەندا، ڕێگە بە ئاوارتنی ئەدرێت.

ئەمجۆرە مەسەلانە ئێمە بە دوالیزمێکی ئەخلاقی قوڵ ئەگەیەنێت کە هەرچەند سەرگەردانکەر بێت، ئەبێ بناسرێت.

لە سەرتاسەری مێژوودا تا ئەو جێگەیەی بەڵگە لەبەردەستدایە، بروا ئەخلاقیەکان دوو سەرچاوەی یەکجار جیاوازیان هەبووە: یەکێکیان سیاسی و ئەوی تریان پەیوەستە بە باوەڕە دینی و ئەخلاقیەکانەوە. لە کتێبی پیرۆزی دێریندا (تەورات) ئەم دوانە بە جیا لەیەک دەرئەکەون. یەکێکیان بەشێوەی شەریعەت و ئەوی تریان بەشێوەی پێغەمبەران. هەر ئەم جیاوازیەش لەسەدەکانی ناوەڕستدا هەبوو: لەلایەک ئەخلاقی فەرمی کە بەزۆرداری خاوەن پلەکان ئەسەپێنرا و لە لایەکی تر پیرۆزکردنی شەخسی کە عارفە مەزنەکان فێری خەلکی ئەکەن و کاریان پێئەکرد. هەر تیورەیەکی ئەخلاقی پڕاوپڕ، ئەبێت ئەم دوالیزمەی نێوان ئەخلاقی مەدەنی و شەخسی کە هێشتا ماوە ئەژمار بکات. بەبێ ئەخلاقی مەدەنی کۆمەڵگا توانای بەردەوامی ژیانی نیە، بەبێ ئەخلاقی شەخسیش مانەوەی نرخێکی نابێت. لەبەرئەوە بۆ ئەوەی جیهان باش و خوازراو بیت، بونی ئەخلاقی مەدەنی و شەخسی پێویستە.

ئەخلاق تەنها کورت ناکرێتەوە بۆ ئەو ئەرکانەی بەرامبەر دراوسێکانم هەمە، چەند وێنای من بۆ ئەو ئەرکانە دروست بێت. باش ژیانیش تەنها جێبەجێکردنی ئەرکە کۆمەڵایەتی و گشتیەکان نیە. شتێکی تر بەناوی کەماڵی کەسێتیەوە هەیە. مرۆڤ گەرچی کەمێک بونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، بەڵام هەمووی نیە. بیرکردنەوە و هەست و کردارگەلێکی هەیە عاقڵانە یان ناعەقڵانە، بەرز یان دزێو، پڕ لە میهرەبانی یان پڕ لە کینە. ئەگەر بڕیارە ژیانی مرۆڤ تەحەمول بکرێت، ئەبێ دەرفەت بەبیرکردنەوە و هەستەکان و کردارە باشەکانی بدرێت. ئەگەرچی ڕەنگە کەم کەس هەبێت بەختیار بێت بەوەی تەنیا و بیکەسە، ئەوا کەمتر کەس ئەتوانێت لەناو کۆمەڵگادا بە بەختیاری بگات کە دەرفەتێک بۆ ئازادی کرداری فەردی نەهێڵێتەوە.

کەماڵی فەردی بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیە

لە رەفتاری دروست لەگەڵ ئەوانی دیدا، بەڵام لایەنێکی تریشی هەیە. ئەگەر بە هۆی خۆشگوزەرانی بێ نرخەوە لە ئەرکەکانی خۆت غافل بیت، توشی ئازاری ویژدان ئەبیت. بەڵام ئەگەر ئاهەنگێکی مەزن یا دیمەنێکی جوانی خۆرئاوابوون ئێوەی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبێت، بێ ئەوەی هەست بە شەرمەزاری و بێ ئەوەی هەست بەوە بکەن کاتتان بە فیڕۆ داوە، دوبارە ئەگەڕێنەوە بۆ کارەکانتان. ترسناکە گەر بهێڵین سیاسەت یان ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان بەسەر وێنای ئێمەدا بۆ ماهیەتی کەماڵی تاکەکەسیدا زیاد لە سنور زاڵ بێت. ئەوەی ئەمەوێ بیڵێم گەرچی نەبەستراوە بە هیچ بڕوایەکی دینیەوە، هاوئاهەنگیەکی نزیکی لەگەڵ مەسیحیەتدا هەیە. سوقرات و حواریەکان (ی حەزرەتی مەسیح) وایان داناوە کە ملکەچی خوداوەند بین نەک مرۆڤ، لە ئەنجیلەکاندا ئەوەندەی جەخت لە عەشقی خوداوەند کراوەتەوە، هەر هێندەش پێشنیاری خۆشەویستی دراوسێکان ئەکات. هەموو رابەرە مەزهەبیە گەورەکان و هەموو هونەرمەندان و داهێنەرە فکریە مەزنەکان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی هێزە داهێنەرەکانی خۆیان بێ هەڵبژاردن بون و کاتێک لەم کارەدا سەرکەوتو بون، هەستیان بە هەژان و سەرمەستی کردووە. ئەم هەژانە بناغەی ئەو شتەیە کە لە ئنجیلەکاندا بە ئەرکی مرۆڤ بەرامبەر خودا ناونراوە و (دوبارەی ئەکەمەوە) لە بڕوای دینی جیایە. ئەرکی من بەرامبەر دراوسێ، بەهەرحاڵ بەوشێوەیەی کە دراوسێ وێنای ئەکات، رەنگە هەموو ئەرکی من نەگرێتەوە. ئەگەر بە ویژدانەوە و بە قوڵی بڕوام وابێت کە ئەبێ بەشێوەیەکی دیاریکراو رەفتار بکەم، ئەگەرچی ئەو رەفتارە لە لایەن حکومەتەوە ئیدانەکراو بێت، ئەبێت پەیڕەوی لە بڕوای خۆم بکەم. بە پێچەوانەوە کۆمەڵگاش ئەبێت من لە پەیڕەوکردنی بڕواکانمدا ئازاد بکات، مەگەر ئەو کاتەی هۆی یەکجار بەهێز بۆ راوەستانم هەبێت. بەڵام ئەو کردارانەی ئیلهامیان لە هەستی ئەرکەوە وەرگرتووە، تەنها کردارێک نین کە ئەبێت لە فشاری زیاد لە سنوری کۆمەڵایەتی دور بن. هونەرمەند یان دۆزەرەوەی زانستیش رەنگە سەرقاڵی کارێک بێت کە لەرووی کۆمەڵایەتیەوە زۆر سودمەند بێت، بەڵام ناتوانێت تەنها بە پاڵنەری هەستی ئەرک، کارەکەی خۆی بە دروستی ئەنجامبدات. ئەبێت پاڵنەرێکی خۆبەخۆیانەش بۆ وێنەکێشان یان دۆزینەوەی (ئیکتشاف) تیا بێت، ئەگینا وێنەکەی بێ نرخ و دۆزینەوەیەکەی بێ بەها ئەبێت.
بواری کاری تاکەکەسی نابێت لەڕوی ئەخلاقیەوە، لە بواری ئەرکی کۆمەڵایەتی لەخوارتر بێت. بەپێچەوانەوە بەشێک لەباشترین چالاکیەکانی مرۆڤ لانیکەم لەرووی هەستەوە، زۆرتر لایەنی تاکەکەسی هەیە تا کۆمەڵایەتی. پێغەمبەران و شاعیران و دۆزەراوانی زانستی، کەسانێکن لەبنەڕەتدا دیدێکی تایبەت بەسەر ژیانیاندا زاڵە. کاتێک پاڵنەرە خۆبەخۆکە بەهێز بێت، هەست ئەکەن ناتوانن مل بۆ هیچ مەرجەعێک دانەوێنن ئەگەر فەرمانەکانی بەپێچەوانەی ئەو شتە بێت کە بە قوڵی بڕوایان بە باشیەتی. گەرچی بەگشتی لەبەر ئەم هۆیە لە رۆژگاری خۆیدا ئازاریان ئەچێژا، بەڵام رەنگە کەسانی ئایندە بەرزترین شانازیان پێببەخشن. نەک تەنها لەدین و هونەر و زانستدا، بەڵکو لەشێوەی هەستمان بۆ

دراوسێکانیش، بەنرخترین شتەکان ئەم کەسانە بە جیهانی ئـەدەن. چونکە باشبونی هەستی ئەرکناسی کۆمەڵایەتیش وەک هەر شتێکی تر، بەستراوە بەو تاکەکەسە تەنیایانەوە کە بیر و هەستیان ملکەچی خەڵکی نیە.

ئەگەر نەمانەوێت ژیانی مرۆڤ گەرد بگرێت و وەڕسکەر بێت، ئەبێت تێبگەین بایەخی هەندێک شتی سەربەخۆ لە سودمەدنیاندایە. شتێک سودمەندە، چونکە ئامێرێکە بۆ شتێکی تر. بەڵام ئەو شتەی تر ئەگەر بڕیار بێت تەنها ئامێرێکی تر نەبێت، ئەبێت لەبەرخۆی بەهای هەبێت و ئەگینا سودمەندی لە خەیاڵیکی پۆچ زیاتر نابێت.

دروستکردنی هاوسەنگیەک لەنێوان ئامانج و هۆکارەکاندا، هـەم زەحمەتە و هـەم گرنگ. ئەگەر بتانەوێت جەخت لەسەر هۆکار (وسیلە) بکەن، ڕەنگە بڵێن کە جیاوازی نێوان مرۆڤی شارستانی و دڕنـدە، یان گەورە و بچوک یان مـرۆڤ و جـانـەوەر، بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیە لەو گرنگیدانە جیاوازەی هەریەکەیان لە ڕەفتاریاندا بە ئامانج و هۆکاری دەدەن. مرۆڤی شارسیانی ژیانی بیمە ئەکات، دڕندە شتی وا ناکات. گەورە بۆ ڕێگەگرتن لەکلۆربون، دانی ئەشوات، مناڵ وا ناکەت مەگەر ناچار بکرێت، مرۆڤ بۆ دابینکردنی ئازوقەی زستان لە کێڵگەدا خۆی ماندوو ئەکات، بەڵام جانەوەر شتی وا ناکات. بیرکردنەوە لەداهاتوو پێویستی بەوەیە کە بۆ شتە خۆشەکانی ئایندە، هەنوکە مل بۆ شتی ناخۆش بدەین. بیرکردنەوە لە ئایندە یەکێک لە گرنگترین نیشانەکانی پێشکەوتنی فکریە، بەڵام لەبەرئەوەی زەحمەتە و پێویستی بە کۆنتڕۆڵکردنی خواستە هەنوکەییەکان هەیە، ئامۆژگاریکاران پێداگری لەسەر پێویستی ئەکەن و زۆرتر جەخت لەسەر لەخۆبوردوی پراکتیکی ئەکەن تا لەسەر خۆشی پاداشتی داهاتوو. ئەبێ کاری دروست لەبەر دروستبونی بکەن، نەک لەبەر ئەوەی ڕێگەیەکە بۆ بەهەشت. ئەبێ پاشەکەوت بکەیت، چونکە هەموو خەڵکی عاقڵ پاشەکەوت ئەکات، نەک لەبەر ئەوەی دەرامەتێکتان بۆ دابین ئەکات و ئەو ئەگەرە ئەڕەخسێنێت لەزەت لە ژیان وەربگرن و بەمشێوەیە.

بـەڵام ئەگەر کەسێک بیەوێت لەبری هۆکار پتر جەخت لە ئامانج بکاتەوە، ڕەنگە بەڵگەی پێچەوانەی ئەوەی بێنێتەوە کە وتمان و بەهەمان ئەندازەش ڕاستبکات. شایەنی بەزەییە کاتێک ئەبینین بازرگانێکی پیرەمێرد و دەوڵەمەند بەهۆی کار و نیگەرانی زۆرەوە لە گەنجێتیدا، هەنوکە توشی خراپ هەرسکردن بووە کە جگە لە نانی وشک و ئاو هیچ شتێک ناتوانێ بخوات، لە کاتێکدا میوانەکانی بێ هیچ دوودڵیەک تێر نان ئەخۆن. لەزەتی ماڵ و سامان کە ئەو بە درێژایی چەندان ساڵ لە ڕەنج و زەحمەت چاوی ئومێدی تی بڕیبوون، لە چنگی ڕائەکەن، و تەنها خۆشیەکی ئێستا ئەوەیە کە بەسودوەرگرتن لە توانا مادیەکانی، کوڕانی ناچار بکات بە هەمانشێوەی خۆیان ماندوو بکەن. بەگشتی ئەوە ئەسەلمێنرێت ڕەزیل کە بەشێوەیەکی نەخۆشانە گرنگی بە هۆکار ئـەدات، عەقڵانی نیە، بەڵام شێوە سوکترەکانی هەمان نەخۆشی بەگشتی ستایش ئەکرێت. ژیان بێ جۆرێک هوشیاری بەرامبەر بەئامانج، سـارد و بێ تین و گیان ئەبێت، و بەداخەوە پێویستی بەهەژان لەڕێگەی خراپتری وەک جەنگ و دڵڕەقی یان دەسیسە یان

ویرانکاری ترەوە دەرئەکەوێت.
کەسانێک لافی ئەوە لیئەدەن «پیاوی کارن» زوربەیجار بیریان بە هۆکارەوە سەرقاڵە، و لێرەوە لە نیوە عەقڵ زیاتریان نیە. کاتێک نیوەکەی تری عەقڵیش لەبەرچاو بگرین کە پەیوەندی بەئامانجەوە هەیە، پرۆسەی ئابوری و سەرتاسەری ژیانی مرۆڤ بەتەواوی سیمایەکی تر وەرئەگرێت: ئیتر ناپرسین بەرهەمهێنەران چی بەرهەمدێنن و مەسرەفیش بۆ مەسرەفکەران توانایداوە چی بەرهەمبهێنن؟ لەبەرامبەردا ئەپرسین: لەژیانی بەرهەمهێنەران و مەسرەفکەراندا چی بووە کە بۆتە هۆی ئەوەی خۆشحال بن بەوەی ئەژین؟ هەستیان بە چیکردووە یان چیان زانیووە یان ئەنجامداوە، کە پاساوی بۆهەڵسوکەوتیان هێنابێتەوە؟ ئایا زانینێکی تازەیان بەدەستهێناوە کە لەزەتیان لێ دیبێت؟ ئایا دەرکی عەشق و خۆشەویستیان کردووە؟ ئایا لەژێر تیشکی خۆر و لە بەهاردا و لەژیر بۆنی خۆشی گوڵەکاندا بەیەک گەیشتون؟ ئایا چالاکی ژیانیان کە خەڵکی سادە بە سەما و گۆرانیەوە دەریئەخەن، هەست پێکردووە؟ رۆژێک لە لۆس ئەنجلۆس منیان بۆ بینینی گەڕەکی مەکسیکیەکان برد و وتیان ئەمانە کۆمەڵێک سەرسەری و بێکار و تەمەڵن، بەڵام بۆ من وا دەرئەکەوت ئەوان زیاتر لە میواندارە ڕاڕاکەیان بەختی ئەوەیان هەبوو دەستیان بەوە بگات کە ژیان لەبری لەعنەت، ئەکات بە بەهرەیەک. بەڵام کاتێک ویستم ئەم هەستەی خۆم رون بکەمەوە، روبەڕوی تێنەگەیشتنی تەواو بومەوە.
خەڵک هەمیشە بیریان ناکەوێتەوە کە سیاسەت و ئابوری و بەگشتی رێکخستنی کۆمەڵایەتی، سەر بە بواری ئامێرە نەک ئامانج. بیرکردنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێمە توشی شتێک بووە کە دەکرێت ناوی بنێین «هەڵەی بەڕێوبەرایەتی»، واتە عادەتی بینینی کۆمەڵگا وەک گشتێکی سیستماتیک کە ئەگەر نمونەی رێکخستن و تەرتیب بێت و ئەگەر ئۆرگانیزمی بێت کە بەشەکانی بەشێوەیەکی جوان بەیەکەوە گونجابن و لە سەیرکردنیشی هەستێکی خۆش بەدەستەوە بدات، ئەوا ئەڵێن باشە. بەڵام کۆمەڵگا بۆ ئەوە دروستبووە یان لانیکەم ئەبێت بۆ ئەوە دروستبوو بێت کە بۆ ئەو کەسانەی کە دروستیان کردووە، ژیانێکی باش و خوازراو برەخسێنێت، نەک بۆ ئەوەی لە دەرەوە دیمەنێکی جوانی هەبێت. ئەبێ بالاترین بەهاکان لە تاکدا بدۆزینەوە، نەک لە گشتدا. کۆمەڵگای باش ئامێرێکە بۆ تاکەکانی کۆمەڵگا بە مەبەستی گەیشتن بە ژیانێکی باش، نەک وەک شتێکی جیا کە بۆخۆی جۆرێک کەماڵی هەیە.
کاتێک ئەڵێن نەتەوە جۆرێک ئۆرگانیسمە، تەشبیهێک بەکار ئەهێنن کە ئەگەر سنوردارییەکانی لەبەرچاو نەگرین، رەنگە مەترسیدار بێت. مرۆڤەکان و جانەوەرەکان بالاترین ئورگانیسمن بە مانای وردی وشە: هەر باش یان خراپەیەک کە بە مرۆڤێک بگات، بەخودی ئەو وەک یەک کەس ئەگات، نەک بە فلان و فیسار بەشی ئەو. ئەگەر من دانم یان پەنجەی پێم ئازاری هەبێت، منیش ئەو ئازارەم هەیە، ئەگەر ئەو بەشەی لەشم بەهۆی دەمارەکانەوە بە مێشکەوە نەبەسترا بۆوە، ئازارێک نەبوو. بەڵام کاتێک فلان جوتیار لە فلان هەرێمی ئینگلتەرا لەناو بەفر و بۆراندا گرفتار ئەبێت، حکومەتی لەندەن نیە کە هەست بە سەرما ئەکات. کەوابوو کەسی مرۆڤ بکەری

خێر و خراپەیە، نەک هیچ بەشێکی جیا لەو یان هیچ کۆمەڵەیەکی مرۆڤەکان. هەڵەیە کەسێک بڕوای وابێت سەرەڕای چاکە و خراپەی لای تاکە جیاوازەکان هەیە، چاکە و خراپەش لەناو کۆمەڵە مرۆڤێکدا هەبێت-هەڵەیەک کە ڕاستەوخۆ ئەبێتە هۆی تۆتالیتاریسم، لەبەرئەوە مەترسیدارە.
لەناو فەیلەسوفان و پیاوانی دەوڵەتدا کەسانێک هەن کە پێیانوایە دەوڵەت مومکینە نەک وەک ئامێری باشتربونی ژیانی هاوڵاتین، بەڵکو خۆی لە خۆیدا خاوەن کەماڵێک بێت. من هیچ هۆیەک نابینم بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەم رایە بم. «دەوڵەت» بابەتێکی ئەبستراکتە کە نە هەست بە لەزەت ئەکات و نە هەست بە ئازار و نە ئومێدی هەیەو نە ترس، ئەوەی ئێمە بە مەبەستی دەوڵەتی دائەنێین لەڕاستیدا مەبەستی کەسانێکە کە هەڵیئەسوڕێنن و بەڕێوەی ئەبەن. کاتێک بەشێوەیەکی دیاریکراو و هەستپێکراو بیربکەینەوە نەک بە ئەبستراکتی، لەبری «دەوڵـــەت» کۆمەڵێک کەس ئەبینین کە زیاد لەبەشی زۆرینەی خەڵک دەسەڵاتیان هەیە. لێرەوە ستایشکردن و پیاهەڵدان بەسەر «دەوڵەت»دا، لەڕاستیدا ئەبێت بە ستایشکردن و پیاهەڵدانی کەمینەی فەرمانڕەوا. هیچ کەسێکی دیموکرات توانای تەحەمولکردنی تیورەیەکی لەبنەڕەتدا نادایەروەرانەی نیە.
تیورەیەکی ئەخلاقی تر هەیە کە ئەویش بە بڕوای من کەموکوڕ و نەگونجاوە و ئەکرێت بە «تیورەی بایەلۆجی» ناوی بنێین (هەرچەند مەبەست ئەوە نیە کە بایەلۆجیەکان بڕوایان پێی بێت) و لە بینینی پەرەسەندن بەدەست دێت. گریمانەکە ئەوەیە کە ململانێی مانەوە ئەبێتە هۆی پەیدابونی ئورگانیسمی ئاڵۆزتر و ئاڵۆزتر تا ئەوەی بۆتە هۆی پەیدابونی مرۆڤ. بەپێی ئەم دیدە باڵاترین ئامانج یان بەدەربڕینێکی باشتر، مانەوەی رەگەزە. ئەگەر ئەم تیورەیە دروست بێت، هەموو ئەو شتانەی زیـادە بخاتە سەر ئاپۆڕەی مرۆڤ لەسەر زەویدا، ئەبێت بە «باش» بژمێرێت. هەرچیەکیش لێی کەم بکاتەوە، ئەبێ بە «خراپ» بژمێرێت.
من هیچ پاساوێک بۆ ئەمجۆرە تیورە میکانیکی و ژمارەییە نابینم، بەئاسانی ئەکرێت نیو هەکتار زەوی پەیدا بکرێت کە ژمارەی مێرولەکان تیاییدا زۆرتر بێت لە ژمارەی هەموو مرۆڤەکان لەسەر زەوی، بەڵام لەبەرئەمە ناڵێین مێرولە لە مرۆڤ باڵاترە. کام مرۆڤە، ئاپورەیەکی زۆر کە لە فەقیر و بەدبەختیدا ئەژین لەلای باشترە لە ئاپورەیەکی کەمتر کە لە خۆشحاڵی و ئاسایشدا ئەژین؟
ڕاستە مانەوە مەرجی پێویستی هەموو شتێکی ترە، بەڵام تەنها مەرجی بونی شتیکی بەنرخە و خۆی لەخۆیدا رەنگە نرخێکی نەبێت. مانەوە لە جیهانێکدا کە زانست و تەکنیکی تازە دروستیان کردووە، پێویستی بە رادەیەکی زۆری کاری حکومی هەیە، بەڵام ئەوەی مانەوە بەنرخ ئەکات، ئەبێ بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەرچاوەی دەرەوەی حکومەت سەرچاوە بگرێت. ئاشتکردنەوەی ئەم دوو مەرجە دژ بە یەکە، کێشەی سەرەکی ئێمە بووە لەم باسەدا.
ئێستا ئەمەوێ بە کۆکردنەوەی باسەکان و بیرهێنانەوەی مەترسیەکانی ڕۆژگـاری ئێمە، جەخت لەسەر هەندێک دەرئەنجام بکەم و بەتایبەتی ئومێدگەلێک بهێنمە پێشێ کە بڕوام وایـە بەهۆی عەقڵیەوە ئەتوانین لەبەرچاوی بگرین.

لەسەردەمی یۆنانی کۆنەوە جەنگێکی دێرینە هەبووە لە نێوان کەسانێکدا کە زیاد لە هەموو شتێک گرنگی بە رێکەوتن و پەیوەستی کۆمەڵایەتی ئەدەن، ئەوانەش کە لەپلەی یەکەمدا گرنگی بە داهێنانی فەردی ئەدەن. لە ململانێیەکی وا درێژخایەندا، ئەکرێت دڵنیا بین کە هەردوو لا راست ئەکەن، و بەهێزترین ئەگەر ئەوەیە رێگەچارەیەکی نەک براوە و رون، بەڵکو هەلگری هەندێک گۆڕانکاری و سازشی جوراوجۆر پەیدا بکرێت.

لەسەرتاسەری مێژودا بەرزونزمیەک هەبووە لە نێوان قۆناغەکانی ئاژاوەی زۆر و قۆناغی کۆنترۆڵی زیاد لەسنوری حکومەتی. لەخودی رۆژگاری ئێمەدا جگە لەو کاتانەی باسی حکومەتی جیهانی ئەکەین، زیاد لەوەی رەوایە دەسەڵاتگەری هەبووە و کەمتر لەوەی پێویستە کەڵکەڵە بۆ پاراستنی داهێنانی تاکەکەسی. ئەو کەسانەی رکێفی دەزگا گەورەکانیان بەدەست بووە، دیدیان زۆرتر لەسەر شتە ئەبستراکتەکان بووە و لە بیریان بردۆتەوە کە مرۆڤە واقعیەکان چۆنن، و ویستویانە لەبری ئەوەی دەزگاکان لەگەڵ مرۆڤەکاندا بگونجێنن، مرۆڤەکان بخەنە قاڵبی دەزگاکانەوە.

نەبونی خۆهاندان کە کۆمەڵگاکانی ئێمە بە توندی گرفتاری بون، پەیوەندی بەو کۆنترۆڵە زیادەڕەوەوە هەیە کە مەرجەعەکانی دەسەڵات لە رێگەی دورەوە بەسەر بواری فراواندا ئەنجامی ئەدەن.

یەکێک لەباشیەکانی داماڵینی ناوەندگەری، ئەو هەلە تازانەیە کە ئەیڕەخسێنێت بۆ ئومیدواری و بۆ چالاکیە فەردیە ئومیدبەخشەکان. ئەگەر بیرکردنەوەی سیاسی ئێمە سەرقاڵی کێشە گەورەکان و کارەساتە جیهانیەکان بێت، نائومێدبون کارێکی زەحمەت نابێت. بە پێی میزاج و ئارەزوی حیزبی، رەنگە توشی ترس لە جەنگ یان ترس لە شۆڕش یان ترس لە کۆنەپەرستی بن، رەنگیشە وا هەست بکەن لەبەرامبەر ئەم مەسەلە گەورانەدا هیچتان لەدەست نایەت، مەگەر لە زومرەی تاکە دەسەڵاتدارەکان بن کە بە پەنجەی دەست ئەژمێرێن. بەڵام سەبارەت بەشتە بچوکترەکان — وەک مەسەلەی شار یا یەکێتیە کرێکاریەکان یان کۆمیتەی حیزبی ئەو ناوچەی کە تیایدا ئەژیت— ئەتوانن ئومێدوار بن کە کاریگەریەی پۆزەتیف بەجێئەهێڵن. ئەمە رۆحیەتێکی پر ئومێد دروستئەکات. ئەگەر بڕیارە رێگەیەکی سەرکەوتوانە بۆ مامەلەکردن لەگەڵ مەسەلە گەورەترەکاندا بدۆزرێتەوە، پێش هەموو شتێک رۆحیەتی ئومێد پێویستە. جەنگ و کەموکوڕیە جیاوازەکان و بێ پارەیی لەهەموو کەسێک و هەموو جێگەیەکدا ماندویەتی دروستکردووە و سیمایەکی روکەشی بە ئومیدواران بەخشیوە. باشترین چارەی ئەم حاڵەتت هیلاکیەی هاوکاتە لەگەڵ بەدبینیدا، سەرکەوتنە ئەگەرچی بە پێوەری بچوکیش بێت. و بۆ زۆرێک لەخەڵکی سەرکەوتن یەکسانە بە دابەشکردنی کێسەکان بۆ بەشی بچوکتر و سەرقاڵی بەو بەشانەی کە ئەوەندە گەورە نین، نائومێدی دروستبکەن.

جیهان بووە بە داوی مەرامە سیاسیە دۆگماکان، بەهێزترین ئەم مەرامانە لەسەردەمی ئێمەدا سەرمایەداری و کۆمنیسمە. من هەستناکەم هیچ یەکێک لەم دوانە بەشێوەیەکی دۆگمایی و توند دەرمانێک بۆ ئازارەکان پێشکەشبکات. سەرمایەداری هەلی داهێنان بە ژمارەیەکی کەم

کە بە پەنجەی دەست ئەژمێرێن ئەبەخشێت، کۆمنیسم ئەتوانێت جۆرێک تەئمینی هاوکات لەگەڵ نۆکەری بۆ هەموان ئامادە بکات (هەرچەند لە روی عەمەلیەوە واناکات). بەڵام ئەگەر خەڵکی نەکەونە ژێر کاریگەری تیورە ساویلکەکان و یەخەی خۆیان لە ململانێکانی دەرئەنجامی ئەم تیورانە رزگار بکەن، ئەو ئەگەرە ئەڕەخسێت کە بە سودوەرگرتنی عەقڵیانە لە تەکنیکی زانستی، هەم هەل بۆ هەموان بڕەخسێت و هەم تەئمین. بەدبەختانە ئەو رادەیە لە هۆشمەندی کە لە زانستەکاندا بەکار هاتووە، لە تیوەرە سیاسیەکانی ئێمەدا نابینرێت، هێشتا فێر نەبوین چۆن سود لە زانین و لێهاتووی بەشێوەیەک وەربگرین، کە ژیان نەک هاوتای شادمانی بەڵکو هاوتای شانازیش بێت. ئەوەی ئێمە پەریشان ئەکات، لە لایەکەوە ئەزمونی جەنگ و ترس لە جەنگە کە رەنگە هیچ خراپەیەک لەم سەردەمەدا لەو گەورەتر نەبێت، لە لایەکی ترەوە ئەو هێزە بێناو و بێ شوناسانەی کە حوکمڕانی ژیانی رۆژانـــەی ئێمەن، ئێمەیان گەرچی لە رووی یاساوە چیتر کۆیلەی کەس نین، کردۆتە کۆیلەی هەلومەرجەکان. بەڵام مەرج نیە بارودۆخەکە بەمشێوەیە بێت. بارودۆخەکە بەهۆی پەرەستنی خوا درۆزنەکانەوە وای لێهاتووە. پیاوانی بزێو، دەسەڵات لەبری خۆشی و شادی و خۆشەویستی ئەپەرەستن و خەڵکانی کەم جوڵەتر بێدەنگ بوون یان فریوی کەسانێکیان خواردووە کە لە دیاریکردنی سەرچاوەکانی خەم و ئازاردا هەڵەیان کردووە.

لـەوکـاتـەوەی مـرۆڤ کۆیلەیەتی داهـێـنـاوە، دەسەڵاتداران بڕوایان وابووە کە ئەتوانن بەهۆی ئامێرگەلێکەوە کە ئەبێتە هۆی رەنج و بەدبەختی کەسانی تر، بە خۆشبەختی بگەن. هێواش هێواش لەگەل پەرەسەندنی دیموکراسی و بە بەکارهێنانی ئەخلاقی مەسیحی لەسیاسەت و ئابوری بەشێوازە تازەکان، هەنوکە دروشمێکی تازە جێگەی دروشمی کۆیلەدارانی گرتوتەوە و زیاد لە هەموو کاتێکی رابردوو باسی پێویستی بەدیهێنانی دادپـــەروەری ئەکرێت. بەڵام داوای دادپەروەری بەهۆی رژێمە پان و بەرینەکانەوە، بۆتە هۆی ئـەوەی ئـەوە فەرامۆش بکەین کە دادپەروەری بەتەنیا بەس نیە. شادی رۆژانە و رزگاربون لە خەم و نیگەرانی و هەل بۆ داهێنان و بیرکردنەوەی داهێنەرانە، بە هیچ شێوەیەک لەڕوانگەی دروستکردنی ژیانێکەوە کە هەست بکەیت نرخی ئەوەی هەیە تیایدا بژیت، گرنگیان لە دادپەروەری کەمتر نیە. ژیانێکی یەک ریتمی، رەنگە کوشەندەتر بێت لە ژیانێک کە لە نێوان خۆشی و ئازاردا دێت و دەچێت. نەخشەی ریفۆرمی ئیداری و باشترکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی بەگشتی کەسانێک دایئەڕێژن کە چیدی گەنج نین و بەداخەوە زورجار بیریان ئەچێت کە بۆ زۆرینەی خەڵکی یەکێک لە پێداویستیەکانی بەختەوەری و شادی، نەک هەر خۆهاندان، بەڵکو هەروەها غروری شەخسیە. دنیای ئەمڕۆ کە رێکخستن و رێسا بەسەریدا حوکمڕانی ئەکات، چیدی رێگە نادات کەسێک لە داگیرکردنی وڵاتانی تر هەست بەغرور بکات، بەڵام هیچ عەیب نیە هونەرمەندان و دۆزەرەوان و کەسانێک کە بیابانیان کردووە بە گوڵستان و شادی و خۆشیان بۆ ئەو جێگایانە بردووە کە بێ ئەوانە تەنها نەگبەتی و بەدبەختی هەبوو، هەست بە غرور بکەن.

ئەو غەریزانەی کە ماوەیەکی زۆر باوانی دڕندەی ئێمەی بۆ راو و جەنگ ئـەوروژان، ئەمڕۆش هەر پێویستی بەشانۆیەکە بۆ ئەوەی خۆی تیا دەربخات، و ئەگەریش ڕێگەیەکی تری نەبێت، ئەگۆڕێت بۆ بەدنیازی و کینەخوازی سەرکوتکراو. خۆشبەختانە ڕێگەگەلێک بۆ ئەم غەریزانە هەیە کە خراپ و ئافەتیش نیە. ئەکرێت رکەبەرایەتی و وەرزش بکەینە جێگری جەنگ، و لەبری راو روو لە لەزەتی دۆزینەوە و داهێنان بکرێت. ئەم غەریزانە نابێت نادیدە بگیرێن یان مایەی ئەسەف بن، چونکە ئەتوانن نەک مایەی خراپە بن، بەڵکو هەروەها ئەتوانن ببنە سـەرچـاوەی باشترین رەگـەزەکـانـی دەستکەوتەکانی مـرۆڤ. پاش بەدەستهێنانی ئاسایش، کەسانێک کە باشتربونی ژیانی مرۆڤیان ئەوێت، کارێکی لەوە گرنگتریان نیە کە بۆ ئەم غەریزە دێرین و بەهێزانە، نەک کۆتوبەند و ڕێگر و نە ڕێگەچارەی وێرانکارانە، بەڵکو تا ئەوپەڕی توانا بوارێکی زۆرتر بدۆزنەوە کە شادمانی و غرور و شکۆمەندی بە ژیانی مرۆڤ بدات.

بەدرێژای سەردەمەکان کە مرۆڤ بە پشکوتن و کامڵبوون گەیشتووە، مرۆڤەکان روبەڕوی دوو جۆر ئازار و گرفتاری بونەتەوە: یەکێکیان ئەوەی سروشت بەسەریاندا سەپاندۆێتی، ئەوی تریان ئەوەی خۆیان بەهۆی نەزانیەوە یەکتریان پێ توش کـردووە. لەسەرەتادا خراپترین بەڵاکان لە دەوروبـەرەوە ئەهات. مرۆڤ کەسایەتیەکی دەگمەنی گیان لەبەران بوو کە مانەوەی زۆر جێگەی دڵنیای نەبوو، نە خاوەن چالاکی مەیمون بوو نە پێستی سمۆرە، لەبەر ئەوە بەزەحمەت ئەیتوانی لە چنگی دان رابکات و لە زۆرترین خاڵەکانی جیهاندا بەرگەی سەرمای زستانی نە ئەگرت. تەنها دوو خەسلەتی سروشتی هەبوو: یەکێکیان باڵای راست کە دەستەکانی ئازاد ئەکرد، دوهەمیان عەقڵێک کە ڕێگەی ئەدا ئەزمونەکانی بگۆێزێتەوە. ئەم دوو خەسڵەتە هێواش هێواش بە بەرزترین پلەیان گەیاند. ژمارەی تاکی مرۆڤ لەهەر گیانلەبەرێکی گەورەی تر زیاتر بوو. بەڵام سروشت هێشتا ئەیتوانی بەهۆی لافاو و برسێتی و نەخۆشیەکانەوە، توانای خۆی دەربخات و لە زورینەی خەڵکی لەبری خواردنی رۆژانەیان، بە بێ وەستان کار بکێشێتەوە.

لە رۆژگاری ئێمەدا و لە ئەنجامی گەشەکردنی بیری زانستی، دیلێتی ئێمە لەدەست سروشتی دەرەکی، بەخێرایی روی لە کەمیە. برسێتی و نەخۆشیە هەمەگیرەکان هێشتا دێنە پێشێ، بەڵام هەر ساڵێک باشتر لە ساڵی پێش تێئەگەین کە بۆ پێشگرتن لێیان ئەبێ چیبکەین. کاری ماندوکەرانە هێشتا پێویستە، بەڵام تەنها بەهۆی ناعەقڵانی ئێمەوە، چونکە ئەگەر هاوکاری هەبێت، ئەتوانین بە کارێکی نەرم و گونجاو، گوزەران بکەین. بەو تەکنیکانەی هەیە، ئەتوانین هەرکاتێک عەقڵانیانە بیر بکەینەوە، لە زۆرێک لە شێوەکانی دیلێتی دێرین بۆ سروشتی دەرەکی رزگارمان بێت.

بـەڵام ئەو بەڵایانەی مرۆڤەکان بەسەر یەکدا ئەیهێنن، بەهەمان رادە کەم نەبۆتەوە. هێشتا جەنگ و ستەمکاری و دڵڕەقی ترسناک هەیە و هێشتا تەماعکاران، موڵک و سامانی کەسانێک کە وەک ئەوان لێزان و دڵڕەق نین، لە چنگیان دەربێنن. ئـارەزوی دەسـەڵات هێشتا بـواری ستەمکاری فراوان ئەکات، لەهەر کوێ ستەمکاری

بەشێوەیەکی ترسناک مومکین نەبێت، لانیکەم ڕێگری لە ئازادی ئەکات. ترس — ترسی قوڵ کە تەنانەت مرۆڤ بەزەحمەت ئاگای لە بونێتی- هێشتا پاڵنەرێکی زاڵـە لە ژیانی زۆرێـک لە خەڵکیدا.
هەموو ئەمانە پێویست نیە. هیچ شتێک لە خەسڵەتی مرۆڤدا نیە کە ئەم خراپیانە بکاتە شتێکی ناچاری. ئەمەوێت بەوپەڕی جەختەوە ئەوە لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا دوبارە بکەمەوە کە لەئارەزوی جەنگی ئێمەوە ئەو ئەنجامگیریە ئەکەن کە سروشتی مرۆڤ خوازیاری جەنگ و شێوازەکانی تری ناکۆکیە، بە هیچ شێوەیەک هاوڕا نیم. من بڕوای تەواوم بەوە هەیە کە پێچەوانەی ئەمە ڕاستە. بڕوامولیە ئـارەزووە جەنگیەکان ئەتوانن دەورێکی سەرەکی ببینین و ئەکرێت شێوە زیانبەخشەکانی زۆر کەم بکەینەوە.
ئەگەر ترس لە نەزانی و بێ نەوایی نەبێت، حەزی سامان کەمتر ئەبێت. حەزی دەسەڵات رەنگە لە زۆر ڕێگەوە تێر بکرێت کە نەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە کەسانی تر: بۆ نمونە لە ڕێگەی دەسەڵاتکردن بەسەر سروشتدا لە ڕێی دۆزینەوە و داهێنانەوە، یان بەرهەمهێنانی کتێب و بەرهەمی هونەری بەرز و جێی پەسەند، یان سەرکەوتن لە قەناعەت پێکردن و قەبوڵکردنی بیروڕاکان. هێز و جوڵە و ئـارەزوی کاریگەری ئەتوانێت سودمەند بێت، ئەگەر ڕێگەی دروست پەیدا بکات، ئەگینا زیانمەند ئەبێت، وەک هەڵم کە ئەتوانێت هەم شەمەنەفەر بخاتە ڕێ و هەم مەنجەڵ بتەقێنێتەوە.
ڕزگاربونی ئێمە لە دیلێتی دەرەکی، باشتربونی ژیانی مرۆڤی بەجۆرێک مومکین کـردووە کە هەرگیز پێشینەی نەبووە. بەڵام ئەگەر بڕیارە ئەم ئەگەرە رووبدات، ئەبێت بەهەر ڕێگەیەک کە بە دڵنیایی زیانبار نەبێت، ئازادی داهێنان بونی هەبێت و هانی ئەو داهێنانانە بدرێت کە ژیان زیاتر دەوڵەمەند ئەکات. ڕێگەی دۆزینەوەی جیهانێکی باشتر، هاندانی مرۆڤە کە بێ پەروا و نەترس بن، نەک دەستەمۆ و ترساو، مەگەر ئەوکاتەی زیان بە کەسانی تر بگەیەنرێت. لە جیهانێکدا کە ئێمە لەناویدا ئەژین، هەم بۆ باشە و هەم بۆ خراپی ئیمکانی بێسنور هەیە. سەرگەردانی هەنوکە پێش هەر شتێک دەرئەنجامی ئەوەیە بەشێوەیەکی ترسناک فێربووین هێزەکانی سروشتی دەرەکی کۆنترۆڵبکەین، بەڵام زۆر دەسەڵاتمان بەسەر هێزەکانی دەرونماندا نەبێت. زاڵبون بەسەر نەفس و خۆگرتن، هەمیشە وێردی سەر زمانی ئامۆژگاریکاران و مامۆستایانی ئەخلاق بووە، بەڵام لە رابـردوودا زاڵبونێک بێ دەرککردن و تێگەیشتن. ئامانجی من لەم وتارانە دەرککردنی پێداویستیەکانی مرۆڤە، بە فراوانتر لەوەی زوربەی سیاسەتمەداران و ئابوریزانان بە بەڵگەنەویستیان زانییوە، چونکە تەنها لەرێی ئەم دەرککردنەوە ئەتوانین ئەو ئومێدانە بهێنینە دی کە تا هەنوکە بەهۆی ناعەقڵانیەت و ساوێلکەیەتی ئێمەوە بەدی نەهاتوون، بەڵام بەهۆی کارزانی و لێهاتویمانەوە لەبەردەستدان. فولادوند.

* لەم سەرچاوەیەی خوارەوە وەرگیراوە:
خرد در سیاست. گزیده و نوشته و ترجمه: عزت اللەفولادوند. طرح نو.تهران.١٣٧٦

# گفتوگۆ

*گفتوگۆ لەگەڵ ئەدۆنیس    سازدانی: نینار ئەسبەر    و. لە سویدییەوە: هیوا قادر

*گفتوگۆ لەگەڵ هارۆکی مۆراکامی    سازدانی: لۆرا میلەر    و. لە فارسییەوە: جەبار سابیر

*گفتوگۆ لەگەڵ ئەمین مەعلوف    سازدانی: شاکر نوری    و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع



# بەشی نۆهەم لەکتێبی گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەدۆنیسی باوكمدا

## پلیكانەیەك بۆ بەهەشت
## Stairway to heaven

سازدانی: نینار ئەسبەر

و. لە سویدییەوە: هیوا قادر

**نینار**: لەگەڵ دیندا نێوانت چۆنە؟

ئەدۆنیس: ئەگەرچی من لە ژینگەیەکی دینیدا گەورەبووم، بێ لەوەش عەشقێکی بێ ئەندازەم بۆ باوکم هەبوو، بەڵام هیچ بەینێکم لەگەڵ دیندا نەبووە، بەهیچ شێوەیەک نیمە.

**نینار**: ئەی لەگەڵ عەلەوی بووندا؟ هەست ئەکەیت تۆ کەسێکی عەلەویت؟ ئایە عەلەوی بوون بۆ تۆ گرنگە؟

ئەدۆنیس: بەهیچ شێوەیەک. پەیوەندی من لەگەڵ عەلەویەکاندا تەنها پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی و مێژووییە.

**بیرمەندان و شاعیران ئەیانەوێت ئازادبن لە هەموو یاسا و ڕێسایەك، لەبەر ئەوەیە بەتایبەتی حەزیان لەو شتانەیە کە حەرام و قەدەغەکراوە. سەرپێچیکردن نیشانەیەکە بۆ ئازادبوون و دژایەتیکردنی ئەو یاسا دینیانەی کە لەبەرامبەردا وەستاون.**


ئەدۆنیس

لەڕاستیدا هاوسۆزی من بۆ ئـەوان لەو ڕووە مێژووییەوەیە کە ئەوان هەمیشە ڕاوەدوونراون، قەڵاچۆکراون، ئەشکەنجەدراون و کوژراون. هەست ئەکەم هاوسۆزی من بۆ ئەوان لە پشتگوێخستن و حساب بۆنەکردنیانەوەیە لەلایەن خەڵکییەوە. من بیر لە بێرگسۆن ئەکەمەوە، ئەو پیاوێکی جولەکە بوو دینەکەی خۆی گۆڕی و بوو بە مەسیحییەکی کاسۆلیک، بەڵام کاتێک نازییەکان هاتنەئاراوە و کەوتنە قەتڵوعامکردنی جولەکەکان، هەڵوێستی خۆی وەرگـرت و هاوپشتی جولەکەکانی کرد. ئەمەش لەبەر هۆکاری دینی نەبوو بەڵکە جۆرە هەڵوێستێکی ئەخلاقی بوو. پێموایە هەڵوێستی منیش بۆ عەلەوییەکان هەمان شێوەیە. من باوەڕم بە هیچ دینێک نییە، هیچ کامێکیان، بەڵام حورمەتم بۆ ئەوانە هەیە کە باوەڕیان پێیەتی، ئەمەش لە حورمەتگرتنمەوەیە بۆ ئینسان؛ من حورمەتی ئازادی ئینسان ئەگرم.

**نینار:** کاتێک ئەڵێم عەلەوییەکان هەڵوێستی سەدەکانی ناوەڕاست لەگەڵ ژناندا بەکارئەهێنن و هیچ حسابێکیان بۆ ناکەن، تۆ بەم قسەیەی من بریندارئەبیت؟ کە من واش ئەڵێم بیر لە سیاسەت ناکەمەوە. مەبەستم عەلەوییەکانە وەک دین، نەک ئەو حیزبانەی کە دەسەڵاتی سیاسیان هەیە لە سوریا.

ئەدۆنیس: من حەزم ئەکرد ئەم بیروباوەڕانەت پشت قایم بوونایە بە زانیاری و ئەزمونی خۆت تابزانیت ژیان لەگەڵ ئەواندا چۆنە، نەک قسەکانت تێکەڵەیەک بن لە سوک سەیرکردن و حەزلێنەکردن.

**نینار:** من هیچ کێشەیەکم لەگەڵ دینداریی و دیندا نییە، خوای ئەکرد خەڵکی قالۆنچەیان ئەپەرست. گرنگی بەوەش نادەم کێ لەسەر ئەم قسەیەم شەڕم لەگەڵدا ئەکات و ئیزعاجم ئەکات. من تەنها ئەوە ئەڵێم کە خۆت یاخود «ئەروەد» هەندێک جار سەبارەت بە دۆخی ژنان باستانکردووە. چونکە ئەمە شتێکە بۆ من زۆر گرنگە.

ئەدۆنیس: ئەبێت ئەوە بزانیت کە دەنگۆیەکی لەمێژینەی زۆروزەبەندی هەڵبەستراو لەسەر ئەوان هەیە، بۆیە پێویستە بنیادەم بێ لایەن بێت. بەڵام بۆ نموونە لای عەلەوییەکان ئافرەت پیویست ناکات لەچک بکات، هەرگیزیش نایکات. بەڵام لە ڕوویەکی ترەوە ئافرەتان بۆیان نییە دین بخوێنن.

**نینار:** ئەوها!

ئەدۆنیس: بەڵام خەڵکانێکی زۆری تریش هەن کە پێویست ناکات دەرسی دینیان پێ بوترێت.

**نینار:** پیاوانیش؟

ئەدۆنیس: بەڵێ پیاوانیش. بۆ نموونە شتێک هەیە ناویان ناوە نهێنییەکانە یان «زانینە هەرە گرنگەکانە»، زۆرینەی عەلەوییەکانیش بۆیان نییە هیچی سەبارەت بزانن، بۆیە ئەوە هەر ژنان نین خراونەتە دەرەوەی ئەو زانیاریانە. لای عەلەوییەکان ژنان تەواو ئاوێتەی ژیانی ڕۆژانەن. بۆیە شتێکی خراپ نییە ئەوان بەراوردبکرێن بە کۆمەڵگا عەرەبییەکانی تر!

**نینار:** ئاوها! بەهەرحاڵێک پێ ئەچێت ئەمە تەواو بەئایدیال کرابێت. بەڵام خۆ ڕەنگبوو باشتربێت من لەگەڵ ژنێکی عەلەوی ئەم قسانە بکەم «پێ ئەکەنێت»، بەڵام هەرچۆنێک بێت شتێک لە تۆ هەڵئەکرێنم. ئەو شتانەی کە من لە ناو دینی ئیسلامیدا هەن و پێمخۆشن ئەوەیە کە هەستکردن بە گوناهت تیادا دروست ناکات لەبەرامبەر ڕەگەز و پارەدا.

ئەدۆنیس: لە ئیسلامدا ئینسان لەڕێگای باوەڕیەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ خودادا هەیە. هیچ دەلاڵێک یان کەشیشێک نییە بەو کارە هەستێت. بۆیە هەستکردن بە گوناه لەلای ئیسلام نییە.

**نینار:** بەڵام لەلایەکی ترەوە، پێموایە بێ عەقڵییەکی زۆر لەئارادایە دەرهەق بە هەموو ئەو شتانەی «نووسراون»، ئەمەوێت ئەوە بڵێم کەهەرە مەبەستی گەورەی ژیان بکرێت بەوەی کە ئینسان ئامادەبکەیت بۆ چوونە بەهەشت. هەرچی خۆشی و لەزەتبردنە لە ناو ژیاندا گرنگ نین بەڵکو تەنها شتێک کە گرنگ بێت چونە بەهەشتە. ئەگەرچی لەباشترین حاڵەتیشدا دڵنیانیت، ئەگەرچی ئەو ئینسانانە زۆر گەشبینن کە بگەن بەو جێگایە. خۆشحاڵی و سەرکەوتن بۆ ئەوان پاداشتێکە کە تەنها لەبەهەشتدا وەری ئەگرن، بۆیە ئەمە بۆتە هۆکارێکی زۆر سادە کە وایکردووە هەوڵنەدەن بۆ چاککردنی پەیوەندییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان، تا ئەو ڕادەیەی شۆڕش ناکەن و خەون بە داهێنانەوە نابینن. من زۆر دڵنیا نیم ڕوانگەیەکی لەم چەشنە لە بودیزمدا هەبێت بۆ دەستبەرداربوون

و قبوڵکردنی شکست، چونکە ئەوان ئەڵێن ژیان بریتییە لە نایەکسانی، کەسیش ناتوانێت هیچ شتێک بەرامبەر ئەو نایەکسانییە بکات، چونکە پەیوەندی بە «کارما»ـەوە هەیە. گەر ئینسان خۆی لەناو بارێکی نالەبار و غەمگیندا بینییەوە ئەوا بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەو ئینسانە بۆتە قوربانی ئەو «کارما» خراپەی کە هەیەتی، ئەوەشی کە ئەیچێژێت دانەوەی ئەو قەرزاریەیەتی.
ئەدۆنیس: لەو دۆڕاندنانەدا هەستکردن بەخۆشی و لەزەت هەیە. ئەوان ژیانی خۆیان لەناو نهێنیدا بەسەر ئەبەن.
**نینار:** وایە، بەڵام خەڵکی واش هەیە بەهیچ شێوەیەک ناژی..
ئەدۆنیس: بۆ ئەوەی ئینسان بتوانێت دڵخۆشبێت و لەزەتبەرێت پێویستی بە سەرچاوەی ترە.
**نینار:** یانی چی؟ ئایە ئەمە پرسیارە لەسەر سەرچاوەکان؟
ئەدۆنیس: بەدڵنیاییەوە پرسیارکردنە لەسەر سەرچاوە! پیاو هەیە پارەی ئەوەی نییە خانمێک داوەت بکات بۆ کوپێک قـاوە. بۆیە بە پارە ئەتوانیت سەفەر بکەیت و شت بکڕێت.
نینار: بەڵام ئەو کاتە ئەگەیت بەلەزەتبردن کە ئازابیت بەرامبەر بە خۆت و جەستەی خۆتت خۆشبوێت.
ئەدۆنیس: لەزەتبردن جۆرێکە لە خۆشگوزەرانی.
**نینار:** مەبەستت لە خۆشگوزەرانی چییە؟
ئەدۆنیس: خۆشگوزەرانی پڕکردنەوەی ئەو پێداویستیانەیە کە هەتن، کاتێک توانیت ئەو پێداویستییە سەرەتاییانە بەدیبهێنیت وەک تێربوون و جلوبەرگ و شتانی تر. بەڵام ئینسانیش هەیە بەهیچ جۆرێک لە جۆرەکان ناتوانێت ئەو پێداویسییە بچوکانە فەراهەم بکات.
نینار: پێداگیری مەکە لەسەر ئەوەی کە ئینسان ناتوانێت لەگەڵ ژنێکدا بخەوێت گەر هات و پارەی پێ نەبوو.
ئەدۆنیس: پێش هەرشت ئینسان ئەبێت ئەوە بە قەناعەتەوە بکات.
**نینار:** بە خۆشییەوە بیکات!
ئەدۆنیس: ئەگەر ئینسان قەناعەتیش بکات هێشتا هەر پێویستی بە پارە هەیە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو کەسەدا بمێنێتەوە کە قەناعەتی پێکردووە.
نینار: هەمیشە نا!
ئەدۆنیس: تا ڕادەیەکی زۆر.
**نینار:** من باوەڕم بەوە نییە.
ئەدۆنیس: ئینسانی وا هەیە پارەیەک چییە نیەتی تا کوپێک شەراب بکڕێت بۆ خۆی. بەهەرحاڵێک ئەمە پەیوەندی بە وردەکاریەکان و حاڵی ئەو کەسەوە هەیە. ئێمە بە گشتی باسی خەڵکی ئەکەین.
**نینار:** ئێمە خۆمان پێویستمان بەو بارە نییە! بێگومان ئێمە بە گشتی قسە ئەکەین، بەڵام سەربارى ئەوەش ئینسان ئەتوانێت لەم جۆرە پرسیارانە بکات، ئەی وانییە؟
ئەدۆنیس: هەروا ئاسان نییە تۆ حوکم بدەیت و سەرنجی خۆشت لەسەر ئەم شتانە دەربڕیت. ئینسان ئەبێت لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا ژیابێت کە قسەیان لەسەر ئەکات، ئەو کۆمەڵگەیە بناسێت و بزانێت خەڵکی چۆن تیایدا ئەژین. دیارە ئەزیزم تۆ خۆت ئەمە تێ ئەگەیت، ئینسان ئەبێت ئەو شتانە خۆیان چۆنن هەر ئاواش قسەیان لەسەر بکات. تەنها نابێت تۆ خۆت حەزت لەکام شتی ئینسانەکانە ئەوانە باسبکەیت بەڵکە ئەبێت

ڕاستییەکان بناسیت.
**نینار:** بەڵام من هەندێک هاوڕێی پیاوم هەیە لە بەیروت و ئەشزانم چۆن ئەژین. هەمووشیان لە تەمەنی خۆمدان. حەزیان لە ڕابواردنە و باشترین شتێکیش کە بیزانن ڕابواردنیانە لەگەڵ سۆزانیدا! دیارە ئەمە یاساغە و ئەم یاساغییەش بووە بە بار بەسەر کۆمەڵگەوە. من دژ بەوە نیم کە هاوڕێکانم لەگەڵ سۆزانیدا ڕائەبوێرن، بەڵام من پرسیار ئەکەم کە بۆچی تەنها چارەیەک ئەبێت هەر ئەمە بێت.
ئەدۆنیس: ئەها ئەبینیت! پارە پێویستە.
**نینار:** من سوورم لەسەر ئەوەی کە لە ئاسایترین حاڵەتدا ئینسان پێویستی بە پارە نییە بۆ ئەوەی بتوانێت هەستەکانی خۆی و سەرچڵییەکانی خۆی بژی. ئەوەی ئینسان لە هەرشتێکی تر زیاتر پێویستی پێیەتی تێگەیشتنی تایبەتی و جۆرێک لە کەسایەتی خۆیەتی.
ئەدۆنیس: هەروەها پێویستە ئینسان دان بەوەدابنێت کە لەو جۆرە کەسایەتیانە بوونیان هەیە. ئەتوانیت لە «ڕەئس بەیروت» بیبینیت. گەڕهات و بچیت بۆ «بورج حەمود» یان «گەرەکی ئەلیجە» ناچاری لەخۆت بپرسیت کە چۆن ئەم ئینسانە گەنجانە مامەڵە بە حەز و ویستی خۆیانەوە ئەکەن و چۆن ئەو لەزەتەش وەرئەگرن. زۆرینەی ئەوانەشی کە لەوێن خەڵکانی هەژار و بێ کارن.
**نینار:** ئەوەی تۆ ئەیڵێیت زۆر خەتەرناکە! مانای ئەوەیە لەزەتبردن و سەرحاڵبون جۆرێکە لە خۆشگوزەرانی و تەنها هی چینی مام ناوەند و دەوڵەمەندەکانە. ئەمە ناخۆشە! منێک کە باوەڕم وابووە لەزەتبردن و مەسەلەی سەرحاڵبوون تەنها تەمەنای ئینسانەکان خۆیانە بیهێننە دی ـ کاتێک کە ئەڵێت: «ئەمەوێت لەزەتبەرم» یاخود «من ڕازیم لەزەت بەرم». پێموانەبووە ئەمە پەیوەندی بە باری کۆمەڵایەتییەوە هەبێت، چونکە کاتێک کەسێک لەزەت ئەبات شتێکی زۆر تاکەکەسییە و تایبەتە بەو کەسە خۆی. ڕاستە ئەکرێت هەمووان ئەو سەرحاڵییەیان هەبێت، یاخود ئەکرێت حەزی لە جۆرە لەزەتێکی تر هەبێت. بەڵام بۆ ئەوەی ئەو جۆرە لەزەتبردنە بکڕیت کە ئینسانەکانی تر ئیرەیی پێ ئەبەن ئەوکات ئینسان پێویستی بە پارە هەیە. بۆ نموونە ئەتوانیت وەک دراوسێکانت بچێت بۆ گەشت و گوزار، هەمان مارکەی سەیارەی هاوڕێکانت لێ بخوڕیت، هەمان متومورو بۆ ژنەکەت بکڕیت کە هاوڕێکەت بۆ ژنەکەی کڕیوە، خانمێکی سپی وسۆڵی قژ زەرد داوەت بکەیت لەبەر ئەوەی مۆدەی ئەو جۆرە خانمانەیە، چەندان شتی تری لەم چەشنە. ئەم جۆرە ویستانە پارەی زۆریان ئەوێت، بەڵام بۆ من لەزەتبردن پەیوەندی بە پارەوە نییە؛ چونکە ئەوەی کە ئەکرێت جۆرێکی ترە لە ژیان لە بری ژیانی ڕاستەقینە. ئەمە وەک چوونی ئەو کەسانە وایە بۆ سەیرکردنی زۆرانبازی لەگەڵ گا دا بۆئەوەی هەست بکەن ئەوانیش وەک «ماتادۆرێک» ئازان. ئەمە وەک هەستکردن بە جۆرە ژیانێکی تر وەهایە لە ڕێگەی کەسێکی ترەوە. من ئەتوانم لە شەڕی نێوان زۆرانبازەکە و گا کە تێبگەم، ئەشتوانم ئەوە قبوڵبکەم کە زۆرانبازەکە ژیانی لە خەتەردایە، ئەو ژیانی خۆی ئەخاتە ناو قومارێکەوە و ئەشکرێت زۆر خەتەرناکانە برینداربێت. پەیوەندی هەوەسبازی نێوان ئینسان و ئاژەڵ ئێستا حورمەتی لێ

ئەگیرێت، هات و هاوار و گرووگەرمی بینەرانیش تێ ئەگەم کە هەر لە هەڵپەی داڵەکەرخۆرە ئەچێت. زۆرانبازەکە هەر لەو پیاوە ئەچێت کە پێویستی بە گەیشتنە بە ئۆرگازم، پەلاماری یەکێک ئەدات و لەبەرچاوی ئەو خەڵکەدا لەگەڵی جوت ئەبێت بۆ ئەوەی ئەوانیش بەهۆی ئەوەوە بگەنە ئۆرگازم، ئەمەش بۆخۆی کردنی شتەکە نییە بەڵکە لەبری کردنە. من تەمەنا ئەکەم هەموو ئەو جۆرە هەڵپەکردنانە بچنە ناو ئەو گۆڕەپانەوە بۆ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بکەن و بزانن ئەوەی کە ئەکرێت مانای چییە.

ئەدۆنیس:ئەوە ڕاستە مەسەلەی سەرحاڵبوون و لەزەتبردن شتێکی تەواو تاکە کەسییە تا ئەوکاتەی هەقی بەسەر کەسی ترەوە نەبێت. بەڵام ئایە لە ڕاستیدا بابەتێکی سەرحاڵی و لەزەتبردن هەیە کە هەقی بەسەر کەسی ترەوە نەبێت؟ نەخێر! چونکە مەرجە کەسێکی تر لەگەڵیاندا بەشداربێت، کەسێک ناچاربکەن لەگەڵیانبێت. گەڕان بەدوای ئەوی تردا، ئەوەی کە سەرحاڵی و لەزەتبردنەکە بەشدەکات لەگەڵیدا، ئەم باسە ئێمە ناچارئەکات بچینە ناو ئەو تەونە کۆمەڵایەتییەوە، هەروەها ئەو داب و نەریت و شێوە ژیانەوەی کە هەیە. هەربۆیە سەرحاڵی و لەزەتبردن پەیوەندی بە دەوروبەری کۆمەڵگە و ڕێگەپێدانییەوە هەیە. ئەوکاتەش ئینسان لەوە تێ ئەگات کە بۆچی لەزەتبردن لە دنیای ئێستادا ئەکرێت و ئەفرۆشرێت وەک هەموو لەزەتەکانی تر.

**نینار:** من تەواو لەوەدا لەگەڵتم کە سەرحاڵبوون و لەزەتبردن پێویستی بە ئامادەبوونی کەسێکی تر هەیە. لەبەرئەوە بۆ من زەحمەتە لەو ئینسانانە تێبگەم کە هەرە خۆشترین لەزەتبردنێکیان دەستپەڕکردنە. دیارە تێ ئەگەم گەر جارجارە ئەوە بکەن، بەڵام بەلای منەوە پێویستە کەسێک هەبێت کە ئەو لەزەتبردنەم لەگەڵدا بەشبکات.

## ڕۆژێکی تر

**نینار:** پێمبڵێ بزانم سەرنجت لەسەر ئەو جۆرە خۆکوژییە چییە کە پەیوەندی بە شەڕی بەرەنگارییەوە هەیە. بۆ نموونە کەمیکازە فرۆکەوانە یابانییەکان و چەکدارە جیهادییەکان. ئەوە ئەزانم کە جیهاد لە قورئاندا مانای ئەوە نییە تۆ بچیت خۆکوژی بکەیت، بەڵکو مانایەکی تری هەیە. بێگومان من لەگەڵ بەرگریکردنم دژ بە دیکتاتۆر و کودەتاچی و ستەمکاران و ئەوانەی لەم جۆرەن. تەنانەت من زۆر کەمەرگیری بیرۆکەی بەرەنگاریم. هەر لە منداڵییەوە ویستوومە بەشداری بەرەنگاری بکەم، بۆ نموونە سەروەختی جەنگی لوبنان، بەتایبەت ساڵی ١٩٨٢ کە ئیسرائیل لوبنانی داگیرکرد.

من ئەو کاتە تەمەنم یانزە ساڵان بوو لەپۆلی شەش بووم. ئەگەر باش بیرم بکەوێتەوە ڕۆژی ٦ی یونی ١٩٨٢ داگیرکردنەکە دەستی پێکرد. فرۆکە جەنگییەکانی ئیسرائیل دەستیانکرد بە بۆردومانکردنی باشوری لوبنان و ئینسان ئەیتوانی گوێی لە تەقینەوەکانی ناو بەیروت بێت. نزیکەی سەعات سێ و چواری دوانیوەڕۆ بوو. تۆ و دایکم لە کۆرسەکانتان بوون لە زانکۆ. من هاتبوومەوە ماڵەوە و نانی نیوەڕۆم خواردبوو.

ترسام چونکە ئەمزانی ئەو گرمانە لە فرۆکەکانەوە دێت، ئەم جۆرە گرمەیەش بۆ من و هەموو

لوبنانییەکان ئاشنابوو، بەڵام ئەو جارە تەواو لە جارەکانی تر جیاوازتر بوو. ئێستا تەنها فڕۆکەوانە ئیسرائیلییەکان کەیف ناکەن بەوەی بەئاسمانی لوبناندا بڕۆن و دەنگی فڕۆکەکانیان بکەنەوە بۆ ئەوەی خەڵکی شپرزەبێت. ئێستا زیاتر گوێت لە ناڵەی فڕۆکەکان و گرمەی یەک بەدوای یەکی تەقینەوەکان ئەبێت کە لە دوورەوە دەنگیان دێت. دواتریش دەمودەست شریخەی کلاشینکۆفەکان لە هەموولایەکەوە بەدوایاندا دێن و شەپۆلێک لە ترس و تۆقاندنێکی دژوار بەسەر هەموو دانیشتوانی شاردا بڵاوئەبێتەوە. هەموو شتێک سڕئەبێت:ماڵەکان، زرمەزرمی ناو ماڵەکان، بەردەکان، رووەکەکان، باڵدارەکان، پشیلەکان، سەگەکان، ئینسانەکان، مێزەکان، کورسییەکان، ئۆتۆمبیلەکان، دەنکە لمەکان. دڵنیام تەنانەت دەریاش ڕۆئەچێت و ئەکشێتەوە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە بوونەوەرەکانی ناو خۆی بکات.

ئەوە هاتنی شەپۆلێکی نوێ بوو لە توندوتیژی، جەنگی ناوخۆ نەی ئەتوانی بەری پێ بگرێت، شەپۆلێکی بێ هاوتا و بێ هەست و نابەخشندە بوو. ئێستا دوژمن جیاوازە، بەهێزتر و نائاسایی ترە. لە دەریا و ئەرد و بەتایبەت لە ئاسمانەوە هێرش دێنێت. کاتیک لە هەورەکانەوە دێت ئیتر فڕین مەحاڵە. ئێمە وەک مشکێکی تاقیگە وابووین کەنازانێت دەستێک بە دەستکێشەوە کەی و لە کوێوە چنگی پیائەکات. ئەمە جۆرە ئەزمونێکی تۆقێنەر بوو بۆ من. بەڵام دڵخۆشیش بووم بەوەی توانیم لەبەیروت دا بمێنمەوە، چونکە مانەوەم لەوێ جۆرێک لە بەرگریکردن بوو. ئەزمونێکی نوێ بوو بۆ من و دەنگی نوێم گوێ لێ بوو. سوپای ئیسرائیلی چەکی زۆر نوێی پێ بوو کە چەکدارە ترسنۆکە لوبنانیەکان پێیان نەبوو، چونکە چەکەکانی ئەوان کۆن بووبوون. ئەوکاتانەی ئیسرائیلیەکان بۆمبەکانی خۆیان ئەتەقاندەوە: بۆمبی بەپارچەبوو، بۆمبی فشارهێنەر، بۆمبی سوتێنەری فسفۆڕی. من ئەزمونی ئەو دەنگە سوریالییە نوێیانەم کرد؛ پێشتر هەرگیز دەنگی لەو جۆرەم گوێ لێ نەبووبوو، تەنانەت لە باشترین فیلمی پۆلیسی ئەمەریکیشدا نەم بینیبوو.

ئەو سەردەمە سەردەمی شالاوی لەناکاو و پەلاماری تەمسیلکەر بوو. پشیلەکان خۆیان لەتاریکیدا ئەشاردەوە و سەدان تووتی بەرەڵاکراو بەوناوەدا هەڵئەفڕین. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو تووتیانە لە قەفەزدا لەدایکبووبوون پێ ئەچوو پێیان خۆشبێت ئاوا بفڕن و شوێنی تر بدۆزنەوە بۆ هێلانەکردن. بەڵام لەڕاستیدا بەرەڵاکردنیان بەو جۆرە کوشتنیان بوو بە جۆرێکی تر.

بۆ یەکەمجار ناچاربووین ماڵەکەمان بەجێبهێڵین و بچینە بەشێکی ئارامتری ناو بەیروت و لای خەڵکانی تر بژین. دراوسێکانمان و هاوڕێیانی منداڵیمان بەجێهیشت. هەمووان ئەیانویست ڕابکەن بۆ جێگایەکی تر کە تیایدا هەست بکەن ئارامترن. ئەبوو دەستبەرداری ئاژەڵەکانی ماڵەوە ببین. من دەستبەرداری یەکەم پشیلەی خۆم بووم کە لە ژیانمدا هەمبوو، پشیلەیەکی بلانشێت بوو، پشیلەیەکی مێیەی کێوی توکن، دوو گوێچکەی درێژی لە ڕێوی چووی هەبوو. نەم ئەتوانی ئەم ماڵە و ماڵ لەگەڵ خۆمی بەرم بۆ لای خەڵکانی غەریبە، چونکە ناچاربووین هەمیشە شوێنەکانمان بەجێبهێڵین. بۆیە دامان بەکەسێک لەگەڵ خۆی

بردی بۆ لادێ. بۆ من ئەو ساتە زۆر ساتێکی غەمگین بوو. من ئەو کاتە تەنها یانزە ساڵان بووم و پیشموابوو ئەمە ناهەقییەکی گەورەیە، هەستم بە گوناهێکی گەورە ئەکرد بەرامبەری.
ئێمە لە شار ماینەوە. بۆ ماوەی دوو مانگ شار کەوتبووە ژێر تۆپبارانێکی بێ ڕەحمانەوە و بە سوپای ئیسرائیلی گەمارۆ درابوو ـ هەزاران تۆپ لە سەعاتیکدا ئەتەقی! هێزی بەرگری پاڵەوانانە هەوڵی ئەدا بۆ ئەوەی نەهێڵێت بەیروت بکەوێتە ژێر دەستی ئیسرائیلیەکانەوە. بەڵام لەیەکێک لەو ڕۆژانەدا سوپای ئیسرائیلی خۆی کرد بە شاردا و بەیروت ڕوخا.
دوای شەڕێکی خوێناوی سەر شەقامەکان ئیسرائیل بەیروتی گرت «ئێمە لە شەو و ڕۆژێکدا نزیکەی بیست سەعات لە ژوری خۆپارێزیدا ئەماینەوە». لەو ڕۆژەدا بۆ یەکەمجار توانیمان ڕووبەڕوو دوژمنەکەمان ببینین. بە خۆیان و سەرتاپا ڕوخساریانەوە وەک ئەڵێن «بۆ شەڕ هاتبوون» بە خودەی تۆرپێوەبوو جلی سەربازی ئاڵا پێوەبووەوە بینیمانن. بەهەموو وردە پێداویستیەکەوە هەر دە سەرباز و بە گروپێک پاسەوانی شاریان ئەکرد. کاتێک کە ئەڕۆیشتن بە زەحمەت گوێت لە دەنگیان بوو، زۆر جار لە پێچی کۆڵانەکاندا بێ ئەوەی ئاگامان لێیان بێت لوتمان بە لوتیاندا ئەتەقی و ئەترساین.
ڕۆژێک سوپای ئیسرائیل فەرمانی پێکرا بەیروت جێبهێڵێت. لەگەڵ دایکم چووم بۆ گەورەترین بازاڕ لە خۆرئاوای بەیروت لە هەمرە، لەوێ چاومان بە سەربازێکی ئیسرائیلی کەوت کە لەناو جێبێکدا بەخۆی و بڵندگۆیەکەوە وەستابوو بە عەرەبی قسەی ئەکرد: «دانیشتوانی بەیروت، وازمان لە پەلاماردانتان هێنا، ئێستاش وا ئەگەڕێینەوە». بەزەحمەت باوەڕمان بەم قسەیە ئەکرد! ئیسرائیلیەکان لە کۆتایی مانگی سێپتەمبەری ١٩٨٢ بەیروتیان بەجێهێشت. بەڵام لەبەرئەوەی زیاتر لە لوبنان مانەوە بەتایبەتی لە باشوور، سوپای ئیسرائیل و ئەوانەی لەگەڵیاندا هاوکاربوون بەزۆری ئەکەوتنە بەر شاڵاوی پەلاماردان. پێموایە ساڵی ١٩٨٤ بوو بۆ یەکەمجار ڕوداوێکی چاوەڕوان نەکراو ڕویدا کە منی تەواو گێژکرد: ژنێک ناوی «سانا محێدین» بوو پەلامارێکی خۆکوژی کردە سەر سوپای ئیسرائیل لە باکوری لوبنان. ئەو ژنە موسڵمانێکی ئیمانداریش نەبوو! ئەو ڕووداوە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر من دانا، زەحمەتبوو بۆ من لەمە تێبگەم. من سەبارەت بە فڕۆکەوانە «کامیکازە» یابانییەکان بیستبووم و خوێندبوومەوە کە لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووهەمدا بە خۆیان و فڕۆکە پڕ لە بۆمبەکانیانەوە خۆیان ئەکێشا بە سوپای ئەمەریکادا. بەڵام پێم سەیربوو کە شتێکی لەو جۆرە لە وڵاتەکەی مندا ڕووبدات! بەتایبەتی ئەو هێرشە لەلایەن ژنێکی گەنجەوە بکرێت. هێرش بەرێتە سەر سەربازەکان نەک خەڵکە مەدەنییەکان، سەرباری ئەوەی کە ژنێکی ئیمانداریش نەبێت.
بۆ ئەوەی قبوڵی مردنی پاڵەوانێکی بێ ناونیشان بکەیت پێویستی بە بەکارهێنانی هەستێکی زۆرە. کە ڕەنگە هەستان بەو کارە کەمێک شێتیش بێت. من بیر لەو بەرگریکردنەی هیندییە سوورەکانی ئەمەریکا ئەکەمەوە دژ بە سپی پێستە داگیرکەرەکان، هەروەها بیر لە بزوتنەوەی فەرەنسییەکان ئەکەمەوە لەکاتی جەنگی جیهانی

دووهەمدا. من لەگەڵ ئەو جۆرە پەلاماردانانەدام کە هۆشیارییەکی لە پشتەوەیە و حورمەتی هاوڵاتیانی مەدەنی و بێ گوناه ئەگرێت: پەلاماردانی ژێرخانی مەدەنی ئەدات وەک بانق و پرد و سکەی قیتار و هتد. یاخود جەنگ دژ بە ژێرخانی سەربازی ئەکات، بۆ نموونە چەک و کارگەی تەقەمەنی و زەخیرەی سەربازی. بەڵام من بۆخۆم تەواو دژ بە پەلاماردانی شوێنە مەدەنیەکانم، تەنانەت ئەگەر ئەو پەلاماردانە لەهەرچ بار و دۆخێکدا ئەنجام بدرێت. من ئەو جۆرە کارانە بە تاوان دائەنێم. ئەگەرهات و لەبەرامبەریشدا دڕندایەتی دوژمن سنوربەزێنیش بێت، نابێت پەرچەکردارێکی وا وەربگیرێت. کاتێک ئینسان توانای هیچی نەبوو لەبەرامبەردا بیکات جگە لە مەرگی خۆی دژ بەو نایەکسانییە هیچ ناکات جگە لە خراپەکارییەک لەبەرامبەر خراپەکارییەکدا. ئەمەش کارێکی ناهوشیارانەیە و مانای وایە ئینسان بیر لە دواڕۆژ ناکاتەوە. هەموو ئەو ئەگەرە سیاسی و چارانەی تر کە ئەکرێت لە دواڕۆژدا بێنەپێش بەهەند نایانگرێت. بە جۆرێک لە جۆرەکان نایەوێت ژیان قبوڵبکات. هەربۆیەشە هەمان کاری دوژمن ئەکاتەوە، ئیتر گرنگ نییە هەرچ دوژمنێک بێت.

من بۆیە فیلمی «دەستێوەردانی خودایی» ئیلیا سولەیمانم خۆشئەوێت. من حەزم لەو دەنگە جوان و سەرڕاست و ڕۆشنبیرەیە. ئەم فیلمە لەڕێگەی شۆخیکردنەوە باس لە بەرەنگاری کردن ئەکات بەبێ فەرامۆشکردنی ئەوەی ڕەخنە لە خۆی بگرێت، ئەمەش زۆر گرنگە! فیلمەکە تەواو واقعییە و تەواو کاریگەریشە. هەربۆیە عەرەبەکان حەزیان لەم فیلمە نییە، چونکە ئەوان بەوە ڕاهاتوون کە خۆیان قوربانین و حەزیان لەسەیرکردنی ژنی عەرەبە لەناو باخە زەیتونێکدا بە جلوبەرگی میللیەوە دابنیشێت و بگری. هەروەها حەزم زۆر لە فیلمە دۆکۆمێنتاریە نوێکەی «ڕێگا ١٨٠»ی ئیال سیڤان و میشێل خەلیفەیە. ئەم فیلمە ئەوەندە باشە پێویست ناکات قسەی لەسەر بکەیت، ئەوەشی قسە ئەکات هەر بۆخۆی قسە ئەکات! دیمەنە هەرە کاریگەرەکەی ئەم فیلمە دیمەنی کۆتاییەتی. ئەم فیلمە باس لە بەرگری ئەکات لەبەرزترین ئاستدا: باسی کەسێکی بەرەنگاریکەر ئەکات کە ئینسانەکانی تر بۆ ژیان ئەنێرێت نەک بۆ مردن. ئەو بە هەموو وەچە گەنجەکان ئەڵێت کە تەنها یەک ڕێگەچارەتان لەبەردەمدایە، پێیان ئەڵێت کە شێوازێکی تر هەیە بۆ بەرەنگاری و پێویست ناکات خۆیان بتەقێننەوە.

دیارە ڕاستە بۆ من ئاسانە بەم جۆرە قسەبکەم. چونکە لەهەمان دۆخی ئەو گەنجە فەلەستینیانەدا ناژیم کە لە ژێر فشاری داگیرکردندان و شانسی ئەوەیان نییە ئەم فیلمانە ببینن، تا هێمن ببنەوە و بیربکەنەوە، ئەوان تەنها تەلەفزیۆنی ئەلجەزیرەیان هەیە یارمەتیان بدات تێبگەن. سەرباری ئەوەی هەموو کەناڵە تەلەفزیۆنیە عەرەبییەکان بەپیشاندانی ئەو فیلمانە پەیامی «کلتوری» خۆیان ئەگەیەنن، بەو فیلمە مێژووییانەی کە شانازییە ئیسلامی و عەرەبییەکان پیشان ئەدات، یاخود بە پیشاندانی فیلمە ئەمەریکییەکان کە بینەران کەر ئەکات و برەو بە داهاتی فرۆشی فیلمەکان ئەدات، ئەوەی کە هەیە تەنها هەنگاوێکی بچکۆلەیە بۆ چوونە سەر ڕێگای ڕاستەقینە.

بەهەرحاڵ من هەم هەڵگری ڕووە دڵڕەقەکەم و هەم ڕووە ڕۆمانسییەکەش، هەرچ کاتێک خۆکوژێک لەهەرچ بستێکی دنیادا خۆی بتەقێنێتەوە، لەویادا لەخۆم ئەپرسم کە خەڵکی پارچە هەلاهەلابووەکانی ئەو کەسە کۆئەکەنەوە، ئیتر ژن بێت یان پیاو، ئەی ئەبێت دواتر چی لەو پارچانە بکەن. من پێموایە ئەمە تەواو شێتێتییە ئینسانێک بێت و بچێتە ناو سەدان ئینسانی ترەوە و خۆی بتەقێنێتەوە، بەڵام سەیرترین شتیش لەوەدایە کە پارچەی هەلاهەلای خۆکوژەکە لەگەڵ پارچەی قوربانییەکاندا ناناسرێتەوە. جەستەکان پارچە پارچە ئەبن و خوێنی هەمووان تێکەڵ بەیەکتر ئەبێت. ئەمە چ کارێکی شێتانە و ترسناکە! پرۆژەی سنووربەزێنی خۆکوژەکان لە کۆتایدا گەیشتنی خۆیانە بە قوربانییەکان لە جۆرە مەرگێکدا کە من بە «ماچی مەرگ» ناوی ئەبەم.

ئەدۆنیس: ئەم گوزارشتە جوانە! منیش لەگەڵ تۆدام کە توندوتیژی تەنها ڕەوایی ئەدات بەو شتەی کە پێی ئەوترێت بەرگریکردن دژ بە داگیرکاری.

**نینار:** بەهیچ شێوەیەک من مەبەستم لایانگری کردنی کەسی خۆکوژ نییە.

ئەدۆنیس: من لەگەڵ بەرگریدام کاتێک پەلاماربدرێیت، بەشێوەی هەڵکوتنەسەر بێت یان داگیرکردن بێت. من ئەزانم کە ئینسان پەنا بۆ ئەم جۆرە بەرگریکردنە نابات گەرهات و ئەوەی بەرامبەری لەگەڵیدا توندوتیژ نەبێت. من بە چاوپۆشین لە هەموو ئەو ڕیزپەڕییەش دژ بە هەموو شێوازێکی توندوتیژییم. گەر هات و من توانای قەناعەت پێکردنی بەرگریکەرانیشم نەبێت بە بیروڕاکانم، بە دانوسان و کارکردن لەگەڵیاندا، هێشتا هەرگیز ئەو کارە لە ڕێگەی چەک و بەندیخانە و زوڵم و ستەم و ڕاوەدونانەوە ناکەم. ئەو کاتەی کار ئەگات بەم ئاستە تاڕادەیەک من هەمان هەڵوێستی غاندیم ئەبێت.

**نینار:** وایە، بێگومان! غاندی ئینسانێکی کاریگەربوو. ناسینی ژیانی ئەو بێ ئەندازە یارمەتی منی دا. من بە بەهێزترین ئینسانی ناو هەموو مێژووی مرۆڤایەتی تێی ئەگەم، چونکە ئەو پێیوایە ئینسان لە «شیرەوە» توانای چوون بەرەو توندوتیژی هەیە.

ئەدۆنیس: وایە! من بۆ خۆم دژی هەموو پێکدادانێکم کە لەسەر توندوتیژی بنیاتنرابێت. هەرگیزیش نایبوورم. ئەوەی کە تۆ ئەیڵێیت زۆر ڕاست و جوانە. لەکاتی داگیرکردندا ئینسان هەوڵ ئەدات و بەرگری لەو شتانە ئەکات کە خۆشی ئەوێن، هەموو داگیرکردنێک جۆرێکە لە شوورەیی. ئینسان ئەبێت بەرگری لە شەرەفی خۆی و خانەوەداکەی وماڵەکەی بکات.

**نینار:** بەدەر لەوەی من ڕێزێکی زۆرم بۆ غاندی هەیە بەڵام لەگەڵ پەلاماردانی بنکەی سەربازیدام. بۆیە من حورمەتی ئەو سەربازانە ئەگرم کە نایانەوێت شەڕبکەن و هەڵدێن. سەربازێکی زۆری ئیسرائیلی هەن هەڵدێن. ئەمەش ئەوپەڕی ئازایەتییە. سەرباری ئەوەی سزای توندوتیژ چاوەڕوانی ئەم سەربازانە ئەکات بەڵام جورئەتیان هەیە و بە قسەی فەرمانی سەرۆکەکانیان ناکەن. سەربازانی ناوچە داگیرکراوەکان لەبەردەمی دوو هەڵبژاردندان هەڵهاتن یاخود ملدان. لەو کاتەشەوە کە گوێڕایەڵ ئەبن و مل ئەدەن ئەبن بە ئامانجی ئەوانەی بەرامبەر، ئەمەش هەڵبژاردنی خۆیانە و

کارێکە خۆیان بەسەر خۆیانی دێنن.
ئەدۆنیس: ئەمە مانای وایە گرنگترین کاری بزوتنەوەی بەرگریی خۆتەرخانکردنە بۆ لێدانی شوێنە سەربازییەکان.
**نینار:** بەڵی وایە، سەربازەکان یان سیاسییەکان. لە ڕاستیدا ئەگەر بتەوێت لە وڵاتێک بدەیت نابێت خۆت بە پەلاماردانی پاس و قوتابخانە و شوێنە دینییەکانەوە سەرقاڵبکەیت، بەڵکە ئەبێت بانکەکان و پردەکان بتەقێنیتەوە.
ئەدۆنیس: کەوایە ئەبێت خۆتەرخانبکرێت بۆ لێدانی ئەو ژێرخانەی سەربازەکان پشتی پێ ئەبەستن.
**نینار:** با بگەڕێینەوە بۆ سەر دین و باس لەو ڕوانگە جوان و دڵخۆشە بکەین کە تیایەتی، من بۆخۆم یەکێک لەو کەسایەتیانەی کە زیاد لە پێویست لەناو مێژووی دینە تاک خواییەکاندا سەرنجی ڕاکێشاوم فرانسیسکۆس ئەسیسە، چونکە ئەو بێ ئەندازە جیاوازبووە و پەیوەندییەکی زۆریشی لەگەڵ ئاژەڵاندا هەبووە. کەسێکی تریش کە سیحرێکی لە ڕادە بەدەری هەیە، سیمۆنی پیرۆزە، خاوەن کۆڵەکەی پیرۆز. ئەم پیاوە بۆ ماوەی بیست ساڵ لە سەر کۆڵەکەیەکی بیست مەتری ژیاوە! من چوومەتە حەڵەب و لەسەر لای خوارەوەی ئەم کۆڵەکەیە دانیشتووم. سیمۆن کەسێکی شێت و ناوازە بووە! ئەبێت ئەمە چ بیرکردنەوەیەک بێت وا لە سیمۆن بکات بۆ ماوەی بیست ساڵ لەسەر کۆڵەکەیەک دابنیشێت! لە ڕاستیدا ئەمە کردەیەکی هونەرمەندانەیە لە دیدگای هونەری مۆدێرنەوە. سیمبولێکە بۆ مەزنی پیاوبوون، چەقینی ئەو و ژیان کردنی لەسەر کۆڵەکەیەک بۆ ماوەی بیست ساڵ. بەڵام ئەم جوڵە ئیرۆتیکی و دڵەڕاوکێیە هێندەی ڕووی لە خودایە هێندەش ڕووی لە ئینسانەکانە. تۆ سەبارەت بەم کەسایەتییە لە نموونە نەبووە ئەڵێی چی؟ ئایە لەم جۆرە شێتییە بێ هاوتایە لەناو کەسە پیرۆزەکانی ئیسلامیشدا هەبووە؟
ئەدۆنیس: بەڵێ، تۆ ڕاست ئەکەیت سیمۆنی پیرۆز یەکێکە لە کەسە سەرسوڕهێنەر و کەسایەتییە بەهێزەکان، منیش بەهەمان چاوی تۆوە سەیری ئەکەم. لەم جۆرە کەسایەتیانە لە ئیسلامیشدا بوونیان هەبووە، ئەگەرچی هیچ کام لەوانە بۆ ماوەی بیست ساڵ لەسەر کۆڵەکەیەک دانەنیشتووە. بۆ نموونە ئێمە حەلاجمان هەیە، کەسێکی تایبەتی وەک رابیعەی ئەلعەدەویەمان هەیە، ئەمەی دووهەمیان وەک شاعیرێک چۆن شیعر بۆ خۆشەویستەکەی ئەنووسێت و قسەی لەگەڵدا ئەویش ئاوا شیعری بۆ خودا نووسیوە!
نینار: ئەم دوو کەسایەتییەی کە تۆ باسیان ئەکەیت زۆر عاشق بوون. من شەیدای هەردووکیانم. هەریەک لەوانە بۆ خۆیان داهێنەر بوون و بە شێوازی خۆیان لە دنیا گەیشتوون وەک لەو هەستە ڕۆحییەی کە لە شیعرەکانیاندا پیشانیانداوە.

سەرچاوە:

Samtal med min far, Adonis
Ninar Esber
Alhambra 2007

# گفتوگۆ لەگەڵ هارۆکی مۆراکامی

سازدانی: لۆرا میلەر
بۆ فارسی: فرشید عەتایی
لە فارسییەوە: جەبار سابیر

**- بیرۆکەی نووسینی رۆمانی (پانۆرامای باڵندەی قورمیشی) لە کوێ هات بە زەینتدا؟**

❊ کاتێک دەستم بە نووسین کرد بیرۆکەکە لە زەینمدا زۆر بچووک بوو، تەنها وێنەیەک بوو و لە ڕاستیدا ئەسڵەن بیرۆکە نەبوو. کابرایەکی سی ساڵە خەریکە لە چێشتخانەدا مەعکەرۆنی دروست دەکات و تەلەفۆن زەنگ لێدەدات. بەم سادەییە. بەڵام هەستێک بە منی دەوت کە لەو شوێنەدا شتێک ڕوودەدات.

**- ئایا تۆ خۆیشت سەرت لە ڕووداوی ڕۆمانەکە دەسووڕمێت، بە جۆرێك کە وەك بڵێی خەریکی چیرۆکی کەسێکی تر دەخوێنییەوە یا ئەمەی کە خۆت دەزانی ڕۆمان دوای قۆناغێکی دیاریکراو چۆن بەردەوامی پەیدا دەکات؟** ❊ نا، هەرگیز وا نییە. من لەزەت لە نووسین وەردەگرم. کاتێک دەگەمە بەشێکی تایبەت لە ڕۆمانەکە، نازانم قەرارە چ ڕووداوێک بقەومێ. ئەمەیش بۆ من وەک حاڵەتی منداڵێکە کە لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانەکەدا بێت. زۆر هەیەجاناوییە کە نەزانی ڕووداوی دواتر لە ڕۆماندا چی دەبێت. من کاتێک خەریکم ڕۆمان دەنووسم حاڵەتێکی وام هەیە. سەرنجڕاکێشە.



هارۆکی مۆراکامی

**- تۆ لەم ڕۆمانەدا باسی بابەتگەلێك دەكەیت كە بۆت تازەیە. كەسایەتییەك لە ڕۆمانەكەدا هەیە كە باس لە ئەزموونێكی ڕاستەقینەی ترسناكی جەنگی جیهانی دووهەم دەكات. بۆچی بڕیارتدا بەدوای ئەم بابەتەدا بچی؟**

* هەوڵمدا لە بارەی جەنگەوە بنووسم بەڵام ئاسان نەبوو بۆم. هەر نووسەرێک بۆ خۆی تەکنیکێکی هەیە، واتا (توانا) یا (ناتوانایی) ئەو لە وەسفکردنی شتێکی وەک جەنگ یا مێژوودا. من لە بارەی وەها بابەتگەلێکەوە باش ناتوانم بنووسم، بەڵام هەوڵی خۆم دەدەم، چونکە هەستەکەم نووسین لە بارەی بابەتی واوە پێویستە. هەندێک چەکمەجەی زەینیم هەیە، دنیایەکە. لە ناو ئەم چەکمەجانەدا یا چاوانەدا سەدان مادەی خامم هەیە. ئەوەی کە مەبەستم بێت لەناو ئەم چاوانەدا هەڵی ئەگرم. جەنگ بۆ من چەکمەجەیەکی گەورەیە، زۆر گەورە. هەمیشە هەستم دەکرد کە دواجار ڕۆژێک ئەم چەکمەجە یا چاوە دەکەمەوە، شتێکی لێدەردەهێنم و لە بارەیەوە دەنووسم. نازانم بۆ. ڕەنگە بەهۆی ئەمەوە بێت کە ئەمە چیرۆکی باوکمە. باوکم سەر بە نەوەیەکە کە لە جەنگی ساڵانی (١٩٤٠) بەشداری کردووە. کە مناڵ بووم باوکم چیرۆکگەلێکی بۆ دەگێڕامەوە، هەڵبەتە ژمارەی ئەم چیرۆکانە زۆر نەبوون، بەڵام بۆ من زۆر پڕ مانا بوون. دەمویست بزانم دواتر چییان بەسەر دێت، مەبەستم نەوەکەی باوکمە. ئەمە جۆرە میراتێکە، یادەوەرییەکەی دەڵێم. بەڵام شتانێک کە لەم ڕۆمانەدا نووسیومە، دروستکراوی خۆمە، هەر هەمووی لە هەوەڵەوە تا ئاخری خەیاڵی خۆمە.

**- ئایا بۆ نووسینی ئەم ڕۆمانە بەدواداچوونت زۆر کرد؟**

* هەڵبەتە بەدواداچوونم کرد بەڵام زۆرنا. کاتی نووسینی ئەم ڕۆمانە من لە پرینستن بووم، لەوێ

کتێبخانەیەکی گەورە هەیە. من ئەو ڕۆژانــە بۆ ئەنجامدانی هەر کارێک بە هێندەی پێویست کاتی ئازادم هەبوو. هەربۆیە هەموو ڕۆژێک دەچوومە کتێبخانەکە و کتێبم دەخوێندەوە و زیاتریش کتێبی مێژوویی. لەو کتێبخانەیەدا کتێبی باش هەیە لە بارەی ڕووداوەکانی سەر سنووری مەنگۆلستان و مەنچوری. زۆرینەی زانیارییەک کە لەوێ دەستم کەوت بۆ من تازە بوو. من لە خوێندنەوەی ئەو هەموو گەمژەیی و بێڕەحمی و خوێنڕێژیە دەساکام. دوای ئەوەی نووسینی ڕۆمانەکەم تەواو کرد چووم بۆ مەنگۆلستان، باشە ئەمەیش کارێکی سەیرە، چونکە زۆرینەی نووسەران بەر لە نووسینی کتێب بۆ بەدواداچوون دەچن بۆ جێگایەک، بەڵام من بە پێچەوانەوە کارم کرد. خەیاڵ گرنگترین دارایی منە، هەربۆیە بەر لە نووسینی ڕۆمانەکە نەچووم بۆ ئەوێ تا خەیاڵەکەم لە بار نەچێت.

– ئەم ڕۆمانەت بــەراورد بە ڕۆمانەکانی پێشتر (ژاپۆنی تر) دێتە بەرچاو. لە دیدی خوێنەرانی خۆرئاواییەوە کەسایەتی هەندێک لە زۆرینەی ڕۆمانەکانی تۆ خۆرئاوایی دێنە بەرچاو.

*** بە ڕاستـی؟**

– بەڵێ. ڕەنگە بە هۆی ئەوەوە بێت کە ڕۆمانەکانی تۆ زۆر ئارەزووی فەرهەنگی خۆرئاوایی بکەن. مرۆڤ گاڤێک ڕۆمانەکانی تۆ دەخوێنێتەوە هەستناکات ڕووداوەکانی لە ژاپۆن دەقەومێن، بەڵام هەڵبەتە ئەمە هەستی خوێنەرێکی خۆرئاواییە. بە باوەڕی تەواوەوە ئەم ڕۆمانە لەسەر ژاپۆن چڕکراوەتەوە. بۆچی بڕیاری ئەنجامدانی ئەم کارەت دا.

❊ باشە دەلیلەکەی ئەوەیە کە من ئەو حەلە لە ئەمریکا دەژیام! من لە ساڵی (١٩٩١تا ١٩٩٥) لە ئەمریکا دەژیام و هەر لەو حەلەشدا بوو کە خەریکی نووسینی ئەم ڕۆمانە بووم. بەم هۆیەشەوە بوو نیگایەکی تایبەتم بۆ وڵاتەکەم و خەڵکەکەی هەبوو. من کاتێک لە ژاپۆن ڕۆمانم دەنووسی، دەمویست هەڵبێم. کاتێکیش لە وڵاتی خۆم چوومە دەر، لە خۆمدەپرسی: ناسنامەی من چییە؟ من وەک نووسەرێک چ ناسنامەیەکم هەیە؟ بە زمانی ژاپۆنی ڕۆمان دەنووسم و ئەمەیش واتا من نووسەرێکی ژاپۆنیم، بەڵام ناسنامەم چییە؟ کاتێک لە ئەمریکا بووم، هەمیشە بیرم لەم بابەتە دەکردەوە.

بە بۆچوونم ئەمە یەکێک لەو دەلیلانە بوو کە من ڕۆمانێکم لە بارەی (جەنگ)ەوە نووسی. ئێمەی ژاپۆنی لە ڕوویەکەوە خۆمان ونکردبوو. ئێمە دوای جەنگ توند کارمان کرد. خەریکبوو دەوڵەمەند دەبووین. گەیشتینە قۆناغێکی تایبەت. بەڵام دوای گەیشتن بەو قۆناغە لە خۆمان پرسی: خەریکە بۆ کوێ دەچین؟ چیدەکەین؟ ئەمەیش واتا هەستکردن بە دۆڕان. هەڵبەت دەبێت ئەمەیش بڵێم کە من بە دوای دۆزینەوەی دەلیلێکیشەوەم بۆ نووسین. ڕوونکردنەوەی ئاسان نییە، زۆر بۆم گرفتە.

**- کـاتێك لـە ژاپۆن دوور بوویت، ژاپۆنت چۆن دەهـاتـە بـەرچـاو؟**

❊ (دوای بێدەنگییەکی تووڵانی) وتنی زۆر دژوارە.

**- دەتـەوێ بـە زمـانـی ژاپـۆنـی قـسـە بـکـەیـت؟**

❊ (بـە زمانی ژاپـۆنـی) تەنانەت بە ژاپۆنیش ڕوونکردنەوەی زۆر سەختە.

– ئایا دەتەوێ بڵێی کە کاتێک لە دوورەوە و لە وڵاتێکی ترەوە سەیری وڵاتی خۆت دەکەیت، مانای ژاپۆنی بوون و ئەمەی کە ژاپۆنی بوون واتای چی، بۆت تۆختر دەبێت و زیاتر زەینت بە خۆیەوە سەرقاڵ دەکات، ئەمەی کە مرۆڤ گاڤێک لە ژاپۆنە و لە ژاپۆن دەژی بیر لە وەها پرسێک ناکاتەوە، بەڵام دواتر کاتێک کتوپڕ خۆی لە وڵاتێکی بێگانە دەدۆزێتەوە، ژاپۆنی بوون بۆی مانایەکی تر پەیدا

دەکات.

*** بەڵێ، ئەمە بەشێکە لە پرسەکە، بەڵام... بە ڕاستی پرسەکە ئەوەندە گەورەیە کە قسە کردن لە بارەیەوە و دەربڕینی بۆ من دژوارە. دەکرێت بچینە سەر بابەتێکی تر؟**

– بێگومان پاڵەوانی چیرۆکەکانی تۆ لەگەڵ تایبەتمەندی ژاپۆنییە ماندوونەناسەکاندا نایەتەوە، هەر بە قسەی خۆت ئەم ماندوونەناسیە زۆر سەخت بوو. لە ڕوانگەی تۆوە خاڵی سەرنجکێش لە بارەی کەسێتییەکانی وەک (تورو) لە ڕۆمانی (پانۆرامای باڵندەی قوڕمیشی) کە بێکارە و زۆر لە ماڵەوە دەمێنێتەوە، چییە؟

* من لەو کاتەوەی خوێندنم تەواو کرد لەسەر پێی خۆم وەستام و تەواو سەربەخۆ بووم. پەیوەست نەبووم بە هیچ کۆمپانیا و ڕێکخراوێکیشەوە. ژیان بەم شێوەیە لە ژاپۆن ئاسانە. لێرە بڕیاردان لەسەر خۆ لەو ڕوانگەیەوە کە لە چ کۆمپانیا یان ڕێکخراوێکدابن، ئەم شتە لای ژاپۆنیەکان بایەخی زۆرە. لەم ڕوانگەیەوە من بەردەوام کەسێکی نامۆبووم. تا ڕادەیەک سەخت بوو، بەڵام من ئەم شێوە ژیانەم خۆشدەوێت. ئەم ڕۆژانە لاوەکان بە دوای ژیانێکی واوەن. ئەوان لە هیچ کۆمپانیایەک دڵنیا نین. دە ساڵ لەمەوبەر (میتسۆبیشی) یا کۆمپانیاکانی تر زۆر مەحکەم و پتەو و لە لەرزەنەهاتوو بوون، بەڵام ئێستا ئیتر بەمجۆرە نین. بەتایبەت لە ئێستادا. گەنجانی ئەمڕۆکە لە هیچ شتێک ئەرخایەن نین. دەیانەوێ ئازاد بن، ئەوان کۆمەڵگەی ئێستاکە و هەڵسووڕێنەرەکانیان قبوڵ نییە. هەربۆیە ئەم گەنجانەیش گەر زانکۆ تەواو بکەن و بۆ کارکردن نەبنە ئەندامی هیچ کۆمپانیایەک، ناچارن نامۆ بوون هەڵبژێرن. ئەمانە لە ئێستادا لە


















کۆمەڵگەی ئێمەدا خەریکە دەگۆڕێن بۆ گروپێکی گەورە. دەتوانم زۆرباش درک بە هەستەکانیان بکەم. ئەوانە لە دەیەی بیست یا سی تەمەنیاندان و من لەگەڵ ئەوان مەودایەکی تەمەنی زۆرم هەیە، بەڵام پێگەیەکم لە تۆڕی ئینتەرنێت هەیە و پێکەوە نامە گۆڕینەوە دەکەین. ئەوان ئیمەیلی زۆرم بۆ دەنێرن و باسی کتێبەکانم دەکەن. زۆر سەیرە، جیاوازی نێوان نەوەی من و نەوەی ئەوان زۆر زۆرە، بەڵام زۆر ئاسایی درکی بەیەکتر دەکەین. ئەمەی کە دەتوانین زۆر ئاسایی پەیوەندی لەگەڵ یەکتری چێبکەین بۆ من زۆر سەرنجڕاکێشە. من هەستەکەم کۆمەڵگەکەمان لە حاڵی گۆڕاندایە. ئێمە خەریکین لە بارەی پاڵەوانی کتێبەکانمەوە قسە دەکەین. خوێنەرانی من لەگەڵ ئەم پاڵەوانانەدا هاودڵی یا هاودەردی دەکەن. ڕەنگە چیرۆکەکانی من بۆ ئەو خوێنەرانە جۆرێک هەستی ئازادی یان بێ باکی تیابێت.

**- پاڵەوانەکانی تۆ تاڕادیەك وەك نووسەران دەژین چونکە کارێکی سەربەخۆیان هەیە. ئایا نووسەر بوون لە ژاپۆن سەختە؟**

* سەخت نییە. من ڕێزپەرم. تەنانەت نووسەرانیش لە ژاپۆن بۆ خۆیان یەکێتییەکیان چێکردووە، بەڵام من ئەندامی نیم. ئەمەیش یەکێک لە بەڵگەکانی هەڵاتنی بەردەوامی من لە ژاپۆنە. ئەمەیش مافی خۆمە. من دەتوانم بۆ هەرکوێ بمەوێ بڕۆم. لە ژاپۆن نووسەران کۆمەڵگەیەکی ئەدەبیان بەڕێخستووە، ئەڵقەیەکی ئەدەبی، یەکێتییەک. بە گومانی من نەوەد لە سەدی نووسەرانی ژاپۆن لە تۆکیۆ دەژین. باشە، ئاساییە کە کۆمەڵگەیەک پێکبهێنن. بە دوای ئەم دۆزەدا داب و نەریتێک هاتۆتە ئاراوە کە پێکەنینهێنەرە. ئەگەر مرۆڤ نووسەر بێت ئازادە هەر کارێک بکات، بۆ هەر جێیەک بڕوات،

ئەمەیش لە ڕوانگەی منەوە گرنگترین مەسەلەیە. باشە ئاسایی زۆرینەی ئەو نووسەرانە منیان خۆش ناوێت. من حەزم لە نوخبەگەرایی نییە. گاڤێکیش لە ژاپۆن دەڕۆم کەس دڵی بۆم تەنگ نابێت

**- ئایا ئەوان کێشەیان لەگەڵ نووسینەکانی تۆ هەیە؟**

* من عاشقی کلتوری گشتیم لەبەرئەوەشە کە وتم خۆشیم لە نوخبەگەرایی نایەت. من حەزم لە فیلمە ترسناکەکانە، ستیڤن کینگ، ریمۆند چندلەر، چیرۆکە پۆلیسییەکان. هەڵبەتە لە بارەی بابەتگەلێکەوە نانووسم. مەسەلەی سەرنجڕاکێش لای من ئەوەیە کە سوود لە بونیاتی ئەو شتانە وەرگرم نەک ناوەرۆکیان. ئەمە شێوازی منە. ستایلی منە. هەربۆیە هەر دوو ئەمجۆرە نووسەرانە کەیفیان بە من نایەت، نووسەرانی ڕۆمانی نوێش کەیفیان بە من نایەت. من بە جۆرێک لەو نێوانەدا قەرارم گرتووە و خەریکم کارێکی تازە پێشکەش دەکەم. بەم دەلیلەیش نەمدەتوانی تا ساڵانێک جێگای خۆم لە ژاپۆن بدۆزمەوە. بەڵام ئێستا هەست دەکەم کە خەریکە گۆڕانکاری سەرسووڕهێن ڕوو دەدات. خەریکە قەڵەمڕەوەکەی من فراوانتر دەبێت. لەم پازدە ساڵەدا خوێنەری وەفادارم هەبووە. ئەوانە کتێبەکانی من دەکڕن و هەواداری منن. نووسەران و ڕەخنەگران هەواداری من نین.

من کاتێک قەڵەمڕەوەکەم فراوانتر دەبێت وەک نووسەرێکی ژاپۆنی هەستی بەرپرسیارێتیش زیاتر و زیاتر دەبێت. ئەمە شتێکە کە ئێستا خەریکە بۆ من ڕوودەدات و بەم بەڵگەیەشە کە دوو ساڵ لەمەوپێش گەڕامەوە ژاپۆن. ساڵی بەرێ ڕۆمانێکم نووسی لە بارەی هێرش بە گازی سارین بۆ میترۆی تۆکیۆ لە مانگی ئازاری ساڵی (١٩٩٥)دا. من لەگەڵ شەست و سێ کەس لە قوربانیان کە لەو ڕۆژەدا لە شەمەندەفەرەکەدا بوون قسەم کرد. من ئەم کارەم کرد چونکە دەمویست لەگەڵ خەڵکی ئاسایی ژاپۆندا قسە بکەم. ڕۆژێک بوو پشوو نەبوو، ڕۆژی دوو شەممە بەیانییەکەی کاتژمێر هەشت و نیو یا کەمتر. خەریکبوون وەک ڕۆژانی پێشوو بەرەو تۆکیۆ دەچوون. میترۆکە مووبڕبوو، دەزانی کە کاتژمێرێکی قەرەباڵغە و مرۆڤ ناتوانێ بجووڵێ، مرۆڤ بەمجۆرەی لێدێت، (شانەکانی بەرەو یەک وێکدێنێتەوە). خەڵکانی ماندونەناسن، ئەم ژاپۆنییە ئاساییانە، بێ هیچ بەڵگەک بە گازی ژاراوی هێرشیان کرایە سەر. مەسخەرە بوو. تەنیا بە شوێن ئەمەوە بووم تێبگەم چییان بەسەر هاتووەو کێن!. هەربۆیە لەگەڵ یەکەیەکەی ئەوانە گفتوگۆم کرد. ساڵێکی پێچوو، بەڵام کاتێک لە ڕەوتی گفتوگۆکاندا تێگەیشتم ئەو خەڵکانە کێن کاری تێکردم. من ڕقم لەو خەڵکانەی کۆمپانیاکە بوو، لەو مووچە وەرگر و بازرگانانە. بەڵام دوای ئەنجامدانی ئەو گفتوگۆیە دڵم بۆیان سووتا. ڕاستییەکەی من نازانم بۆچی ئەوان بە بێ بیرکردنەوە کار دەکەن. هەندێک لەوان کاتژمێر پێنج و نیوی سپێدە لە خەو هەڵدەستن تا بڕۆن بۆ ناوەندی شاری تۆکیۆ. بە میترۆ زیاتر لە دوو کاتژمێری پێدەچێ، هەموویان بەمجۆرە تێکترنجاون (خۆی گرمۆڵە دەکات) تەنانەت ناتوانی کتێبێک بخوێنیتەوە. بەڵام سی یا چل ساڵ دەبێت ئەم کارە دەکەن. ئەمەیش بۆ من جێی سەرسوڕمانە. کاتژمێر دەی شەو دەگەڕێنەوە ماڵێ و لەو کاتەیشدا مناڵەکانیان نووستوون، ئەوان تەنها یەکشەممان دەتوانن مناڵەکانیان ببینن. ئەمەیش ترسناکە، بەڵام گلەیی ناکەن. لێم پرسین بۆچی لەمەڕ ئەم بارودۆخەوە گلەیی ناکەن، وەڵامیان دایەوە، بێ سوودە. ئەمە کارێکە کە هەموو خەڵکی دەیکەن، هەربۆیە دەلیلێک بۆ گلەیی کردن نییە.

**- ئایا ئەوان ئیرەیی بە ژیانی تۆ دەبەن؟**

* نا، ئیرەیی نابەن. ئەوانە خوویان بەم جۆرە ژیانەوە گرتووە. ساڵانێکە بەمجۆرە دەژین. ڕێگەیەکی تریان نییە. هەڵبەتە لە نێوان خەڵکانی گروپ و خەڵکانی ئاسایی وێکچوونێک هەیە. کاتێک گفتوگۆکانم دەپشکنی. باسکردنی زەحمەتە. بە جۆرێکی تر، من عاشقی ئەو خەڵکەم. گوێم بۆ حیکایەتی مناڵییان ڕادەدێرا. دەمپرسی لە مناڵیدا چ جۆرە مرۆڤێک بوویت؟ لە قۆناغی دواناوەندی چۆن؟ کاتێکیش هاوسەرگیریت کرد چۆن مرۆڤێک بوویت؟ لەگەڵ چ جۆرە کچێک هاوسەرگیریت کرد؟ ژیانیان پڕە لە چیرۆک. هەر یەکێک لەم خەڵکانە بۆ خۆیان چیرۆکگەلی سەرنجڕاکێشیان هەیە و ئەمەیش بۆ من زۆر وروژێنەر بوو. ئێستا کاتێک سواری میترۆ دەبم و خەڵکانێکی بەو جۆرە ئەبینم، هەرچەندە نایانناسم، بەڵام ئێستا لەگەڵیان زۆر ئاسوودەترم. دەتوانم بزانم کە ئەم خەڵکانە بۆ خۆیان چیرۆکیان هەیە. ئەو گفتوگۆیانە بۆ من سوودمەند بوون. پێموایە خەریکم دەگۆڕێم.

**- کاردانەوەی ئەو کتێبە چۆن بوو؟**

* نامەی زۆرم لە خوێنەرانەوە پێگەیشت. زۆر کەوتبوونە ژێر کاریگەرییەوە. هەندێکیان دڵگەرمیش بووبوون. بۆ ڕۆمانێکی لەم جۆرە کە پۆلیسیش نییە کاردانەوەکە سەیر بوو. خوێنەران وتیان دڵگەرم بوون. خەڵکی بە توندی و ڕاستگۆیی زۆرەوە کاردەکەن و ئەم ڕۆمانەیش بۆ ئەوان وروژێنەر بوو. ئەمەیش لەگەڵ دیدگاکانی پێشوومان وێکنەدەهاتەوە، ئەمەی کە بە توندی کارکردن شتێکی باشە.

**- ئایا لەگەڵ ئەندامانی گروپی ئانۆمیش گفتوگۆت کرد؟**

* هەنووکە سەرقاڵی ئەم کارەم. زۆر بەداخم بۆیان. ئەوان جاحێڵن، زۆربەیان بیست ساڵن. ئەوان زۆر مکوڕن و زۆریش ئامانجگەرا. ئەوان زۆر بە مکوڕی بیر لە جیهان و ڕژێمی بەهاکان دەکەنەوە. من لە ساڵی (١٩٤٩) لە دایکبووم و لە ساڵانی (١٩٦٠) دا کە دەورانی چالاکییە شۆڕشگێڕی و دژە سوونەتییەکان بوو خوێندکاری زانکۆ بووم. ئێمەیش ئامانجگەرابووین، باسی نەوەی خۆمان دەکەم. بەڵام ئێستا ئیتر شوێنەوارێک لەو ئامانجگەراییە نییە و (ئابووری بلوری) گەیشت. ئەو لاوانەیش تا ڕادەیەک وەک تافی لاویی ئێمەن، ئامانجگەرا و ناتوانن خۆیان بە بەشێک لە ڕژێمی بەهاکان بزانن. کەس ئەوانی قبوڵ نییە و هەر بەم هۆیەشەوە چوونەتە شوێن ئەو گروپە. لە دیدارەکانیاندا دەیانوت پارە بۆ ئەوان هیچ مانایەکی نییە و بە دوای شتێکی بە نرخ ترەوەن، شتێکی مەعنەوی. باشە ئەمەیش فکرێکی خراپ نییە، هەڵەیش نییە. بەڵام کەس ناتوانێ شتێک بۆ ئەوان پێشنیاز بکات، جگە لە خودی ئەندامانی تیمی ئانۆم. ئەوان سیستەمێکیان بۆ پشکنین نییە تا بتوانن حوکم بدەن چی دروستە و چیش نادروست. ئێمە ئەم سیستەمی حوکمدانەمان نەداوە بەوان. پێموایە ئێمەی نووسەران لەم بارەیەوە بەرپرسین. ئەگەر من چیرۆکێکی دروست بدەمە تۆ، ئەو چیرۆکە سیستەمێکی حوکمدان دەداتە تۆ و بە تۆ دەڵێت کە چی ڕاستە و چی ڕاست نییە. بە بۆچوونی من خوێندنەوەی چیرۆکێک وەک لە پێکردنی پێڵاوی کەسێکی تر وایە. لە دنیادا یەک دنیا پێڵاو هەیە و گاڤێک مرۆڤ پێی تێدەخات لە دیدی ئەوانیترەوە سەیری دنیا دەکات. بەشەر لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕۆمانی باش و مکوڕەوە شتانێک لە بارەی جیهانەوە فێر دەبێت. بەڵام کەس ڕۆمانێکی باشی نەدایە

ئەندامانی ئەو گروپە. کاتێک (ئاساهارا)- گوروی گروپی ئائۆم- چیرۆکی خۆی دا بەوان، ئەوان بە توندی کەوتنە ژێر هێزی چیرۆکی ئەوەوە. ئاساهارا خاوەنی هێزێکە کە هەڵبەتە ئەنجامێکی شەیتانی هەیە، بەڵام پرسی گرنگ ئەمەیە کە دەبوو (ئێمە) چیرۆکی باشمان بدایە بەوان.

**- لە ڕۆمانی (پانۆرامای باڵندەی قوڕمیشی)، (نۆبۆرۆ) ژنبراکەی تۆرۆ کەسایەتییەکی زۆر سەرنجڕاکێشی هەیە، وەك پسپۆڕێکی ڕاگەیاندنە گروپییەکان کە دەچێتە تەلەڤزیۆن تا لە بارەی سیاسەت و ئابوورییەوە قسەوباس بکات، بەڵام ئەو باوەڕی بە هیچ شتێك نییە، تەنها ئەوە دەڵێت کە بە قازانجی بێت. چ سەرچاوەیەك بووە هۆی هاتنە کایەی ئەو؟**

* تەلەڤزیۆن (پێدەکەنێ). هەڵبەتە من بە شێوەیەکی گشتی سەیری تیڤی ناکەم، بەڵام گەر تەنها ڕۆژێک لە بەیانییەوە تا ئێوارێ سەیری تیڤی بکەیت دەتوانی وەها کەسێتییەک دروست بکەیت. ئەو دەتوانێ قسە بکات، بەڵام زۆر ڕووکار و تەنک. لە ناخی خۆیدا هیچ شتێکی نییە. لە ژاپۆن لەم خەڵکانە گەلێک زۆرە، لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایش بە هەمان شێوە. زۆرێک لە نەتەوەپەرستان وەک نۆبۆرۆ خەڵکانی ڕووکار و ناو بۆشن. هەستەکەم بوونی وەها خەڵکانێک تارادەیەک مەترسی خوڵقێنە. هەڵەبەتە دەتوانین بەوانە پێبکەنین، بەڵام لە ڕاستیدا بوونی ئەوانە مەترسی خوڵقێنە.




**- ئایا لە فاشیەت و شتی لەو بابەتە نیگەرانی؟**

* فاشیزم وشەیەکی گونجاو نییە، دەبوو بتوتبا نەتەوەپەرستی و پێداچوونەوە خوازی. ئەوان دەڵێن شتێک بە ناوی کۆمەڵکوژی (نان لینگ) لە گۆڕێ نییە و پرسێک بە ناو (ژنانی ئاسایش) بوونی نییە (مەبەست لە ژنانی ئاسایش ژنانی

چینی و کۆرياييە کە بە زۆر لە لایەن سوپای ژاپۆنەوە ناچاری کۆیلەیی دەکرێن). ئەوان خەریکن سەرلەنوێ مێژوو دروست دەکەنەوە و ئەمەیش زۆر ترسناکە. چەند ساڵێک لەمەوپێش چووم بۆ مەنچوری و سەردانی گوندێکم کرد. خەڵکی ئەو گوندە پێیانوتم سەربازە ژاپۆنییەکان پەنجا شەست کەسێکیان لە دانیشتوانی ئێرە کۆمەڵکوژ کردووە. گۆڕە بە کۆمەڵەکانیان پیشاندام، هێشتایش هەیە. بە ڕاستی شۆک بوو و کەس ناتوانێت نکۆڵی لەم ڕاستییە بکات، بەڵام ئەمە کارێکە ئەوان خەریکن ئەنجامی دەدەن. ئێمە دەتوانین بەرەو پێشەوە بڕۆین بەڵام دەبێت ڕابردووشمان لە بیر بێت، ئەمە جیاوازە.

– تۆ دەڵێی خەیاڵ لە کارەکانتدا زۆر گرنگە. هەندێک کات ڕۆمانەکانت زۆر واقعگەرایانە (ریالیستی) دەبن و هەندێک کاتیش زۆر... میتافیزیکی.

* من چیرۆکگەلی سەیروسەمەرە دەنووسم. نازانم بۆچی ئەوەندە حەزئەکەم نووسینەکانم سەیروسەمەرەبن. من خۆم مرۆڤێکی زۆر واقعگەراییم. متمانەم بە هیچ شتێکی (چەرخی نوێ) نییە، تا بە دەستهێنانی کەرەسەو خەون و تاروت و ئەستێرەناسی. هەرگیز باوەڕم بەمجۆرە شتانە نییە. کاتژمێر شەشی بەیانی لە خەو هەڵدەستم و کاتژمێر دەی شەو دەنووم. هەموو ڕۆژێک لەسەرخۆ ڕادەکەم و مەلە دەکەم و خۆراکی ساغڵەم دەخۆم. بەڵام گاڤێک دەنووسم سەیروسەمەرە دەنووسم و ئەمەیش زۆر سەیرە. هەرچی زیاتر مکوڕ دەبم، سەیروسەمەرەتر دەنووسم. کاتێک دەمەوێ لە بارەی واقعییەتی کۆمەڵگە و جیهانەوە بنووسم، نووسینەکەم سەیروسەمەرە دەبێت. زۆرێک لە من









دەپرسن بۆچی و منیش وەڵامێکم نییە بیدەمەوە.

بەڵام کاتێک خەریکبووم لەگەڵ ئەو شەست و سێ کەسە گفتوگۆم دەکرد، پەیم بەم مەسەلەیە برد، ئەوانە مرۆڤی زۆر بێغەل و غەش بوون، زۆر سادە و زۆریش ئاسایی بوون. بەڵام هەندێکات چیرۆکەکانیان زۆر سەیروسەمەرە بوو و ئەمەیش بۆ من سەرنجڕاکێش بوو.

– ئایا خۆیشت قەت وەک تۆرۆی پاڵەوانی ڕۆمانەکەت، لە ناو چاڵێکی وشکدا دانیشتووی؟

* نا، بەڵام هەمیشە چاڵ بەلامەوە سەرنجڕاکێش بووە، زۆریش. هەر جارێک کە چاڵێک دەبینم، دەڕۆمە تەنیشتی و دەوەستم و سەیری ناوەوەی دەکەم.

**- ئایا ئەگەری ئەوە دادەنێیت ڕۆژێك بکەویتە چاڵێکەوە؟**

* نا، نا .

**- دەترسی؟**

* بەڵێ، دەترسم. من نووسینی کەسانێکم خوێندۆتەوە کە کەوتبووە چاڵەوە. چیرۆکێکی (ریمۆند کارڤەر)م خوێندبۆوە لە بارەی منالێکەوە کە کەوتبووە چاڵێکەوە و ڕۆژێکی تەواو لەناویا بووە. چیرۆکێکی چاک بوو.

**- ئەو نووسەرێکی زۆر واقعگەرابوو.**

* بەڵێ، زۆر واقعگەرا. بەڵام ناخودئاگا بۆ من نووسەرێکی زۆر گرنگە. من زۆر کارەکانی (یۆنگ) ناخوێنمەوە، بەڵام لە نێوان نووسینەکانی من و نووسینەکانی ئەودا وێکچوونی زۆر هەیە. (ناخودئاگا) بۆ من سەرزەوییەکی نەناسراوە. نامەوێ ئەوە شیبکەمەوە، بەڵام یۆنگ و دەروونناسەکان هەمیشە سەرقاڵی شیکردنەوەی خەون و تەرازووی بایەخی









هەر شتێکن. من نامەوێ کارێکی وا بکەم. ناخودئاگا بۆ من تەنیا ناخود ئاگایە. ڕەنگە ئەم دیدگایە تا ڕادەیەک سەیر بێت، بەڵام هەستەکەم دەتوانم بەم دیدگا سەیرە بگەمە ئەوەی کە مەبەستمە. هەندێ جار کۆنترۆڵکردنی زۆر مەترسیدارە. بۆ نموونە ڕوداوی ئەو ئوتێلەت لە بیرە؟ من چیرۆکی ئەرفۆسم خۆشدەوێ، دابەزینەکەیشی، ئەم چیرۆکە لەسەر بنەمای ئەم دۆزە نووسراوە، (دنیای مەرگ) مرۆڤ خۆی دەخاتە مەترسییەوە و دەچێتە ناوی. بە گومانی خۆم من نووسەرێکم و دەتوانم ئەم کارە ئەنجام بدەم. واتا خەریکم خۆم دەخەمە مەترسییەوە. ئەرخایەنم کە دەتوانم دەروەستی بێم. بەڵام کات دەبات. کاتێک دەستم بە نووسنی ڕۆمانەکە کرد هەموو ڕۆژێک دەمنووسی و دەمنووسی کە تاریکی دائەهات ئامادەبووم بچمە ناوی. هەڵبەتە بەرلەمەیش کاتی دەگرت، گەیشتن بەو قۆناغە دەڵێم. مرۆڤ ناتوانێ ئەمڕۆ دەست بە نووسین بکات و سبەی بچێتە ئەو دنیایەوە، دەبێت هەموو ڕۆژێک تەحەمول بکەیت و زەحمەت بکێشی. دەبێت توانای چڕبوونەوەت هەبێت. بە بۆچوونم ئەمە گرنگترین بەشی کاری نووسەرە. بۆ ئەمە مەبەستە من هەموو ڕۆژێ مەشق دەکەم. توانای جەستەیی زۆر پێویستە. زۆرێک لە نوسەران بایەخ بە هێزی جەستەیی نادەن (پێدەکەنێ) زۆر دەخۆنەوە و جگەرەیش زۆر دەکێشن. هەڵبەت من ڕەخنەیان لێناگرم، بەڵام بۆ من هێزی جەستەیی زۆر گرنگە. خەڵکی باوەڕ ناکەن کە من نووسەرم چونکە هەموو ڕۆژێ ڕادەکەم و مەلە دەکەم. بە سەرسامیەوە دەپرسن: (ئەو نووسەرە؟!)

**- ئایا گاڤێك لە بارەی ئەم شتە ڕەش و تاریکانەوە دەنووسی خۆیشت دووچاری ترس دەبیت؟**

* نا هەرگیز.

**- تەنانەت لەو چرکەساتەدا کە ئەو بوونەوەرە شەیتانییەی لە دەرگای ئوتێلەکەوە دەچێتە ژووری تا (تورو) بگرێت. یا کاتێك کە ئەو سەربازە بەزیندووی کەوڵی دەکەن؟ ئایا لە نووسینی وەها دیمەنگەلێك بێتاقەت نابیت؟**

* لەم ڕوانگەیەوە بەڵێ، تووشی ترس دەبم. گاڤێک ئەو دیمەنەم دەنووسی خۆیشم لەوێ بووم. ئەو شوێنە بەڵەد بووم. دەتوانم هەست بەو تاریکییە بکەم. دەتوانم ئەو بۆنە سەیروسەمەرانە هەڵمژم. ئەگەر نەتوانی ئەم کارانە بکەیت نووسەر نیت. ئەگەر نووسەر بیت دەتوانیت لەژێر پێستتدا هەست بەوە بکەیت. گاڤێک خەریکبووم ئەو دیمەنانەی پەیوەست بە کەوڵکردنی سەربازەکەم دەنووسی، زۆر بۆم.... زۆر بۆم ترسناک بوو، منیش زۆر ترسابووم. ڕاستییەکەی نەمدەویست ئەو دیمەنانە بنووسم، بەڵام نووسیم. لە نووسینی وەها دیمەنێک ڕازی نەبووم، بەڵام بوونی وەها دیمەنێک لەو چیرۆکەدا پێویست بوو. مرۆڤ ناتوانێ لێی هەڵبێت. بەشێکە لە بەرپرسیارێتییەکانی مرۆڤ.

**- وادێتە بەرچاو کاتێك لە نووسینی شتێك دەترسی بڕیار دەدەیت دوای بکەوی.**

* ناتوانیت لەوە هەڵبێیت، پەندێکی ژاپۆنی هەیە دەڵێت: (کە تۆ بەچکە پڵینگت بوێت دەبێت بچیتە لانەی پڵینگەوە)

سەرچاوە:

http://tarjome.blogsky.com/?PostId=21

# گفتوگۆ لەگەڵ ئەمین مەعلوف

سازدانی: شاکر نوری
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

گفتوگۆ لەگەڵ "ئەمین مەعلوف"دا تاموچێژی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە ئەو لە میانەی ڕۆمانەکانی و کتێبەکانییەوە، دەتگەڕێنێتەوە بۆ زەمەنەکانی ڕابردوو: (لیۆنی ئەفریقی، سەمەرقەند، باخچەکانی ڕووناکی، سەدەی یەکەم دوای بیاتریس، بەردی تانیۆس، پەیژەکانی خۆرهەڵات یان بەندەرەکانی خۆرهەڵات، گەشتەکەی باڵداسار، جەنگە خاچپەرستییەکان لە ڕوانگەی عەرەبەوە، خۆشەویستی لە دوورەوە، شوناسە بکوژەکان، سەرەتاکان - ژیاننامەی خێزانی، دایکە دریانا، تێکچونی جیهان)و چەندین ڕۆمان و کتێبی دیکە کە تیشک دەخەنە سەر ئەم زەمەنەی ئێستامان. هەموو ئەو بەرهەمانەی بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراون، ڕووداوی ڕۆمانەکانی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقا و لە چوارچێوەی دەریای سپی ناوەڕاستدا ڕودەدەن.

بەم دواییانە لە دێرینترین دەزگای زانستی فەرەنسی کە بریتییە لە ئەکادیمیای فەرەنسی، پۆستێکی شەرەفی وەرگرت، تەنها ئەم عەرەبە، لەگەڵ "ئاسیا جەبار"، ئەو پۆستە زانستییە کاریگەرەیان وەرگرتووە. ئەمین مەعلوف دوای ئەوەی توانی لە زمانی فەرەنسیدا داهێنان ئەنجامبدا، بووەتە پاسەوانی زمانی فەرەنسی. ڕۆژنامەوانی جێگای داهێنانەکانی تیا نەبوەوە، بۆیە لە میانەی ڕابردووە ڕووی لە خەیاڵی ڕۆماننوسین کرد. بەم دوایانە دەزگای (سوڵتان عەویس)ی ڕۆشنبیری، خەڵاتی داهێنانی ڕۆشنبیری و زانستی خولی دوانزەهەمی پێبەخشی، بەمەش چووە لیستی ئەو داهێنەرانەی ئەم خەڵاتەیان وەرگرتووە. وەرگرتنی ئەم خەڵاتە بەرزە دەرفەتێکی گونجاو بوو بۆ سازدانی ئەم چاوپێکەوتنە.

**-بەم دواییانە هەڵبژێردرایت بۆ ئەندامێتی ئەکادیمیای فەرەنسی. ئایا ئەوە لە بایەخدانی تۆ بۆ ڕۆمان کەمدەکاتەوە. ئەرکەکانی تۆ لەم پۆستەدا چین؟**



ئەمین مەعلوف

*لەو بڕوایەدانیم ئەم پۆستە تازەیە کاریگەری لەسەر نوسینی ڕۆمانەکانم هەبێت، ئەندامانی ئەم ئەکادیمیایە کە بریتین لە نوسەران و زاناکان و سیاسییەکان و ئەوانی تر، بەردەوامن لەسەر کار و چالاکییەکانی دیکەیان و تەنها بەشێک لە کاتی خۆیان بۆ ئەکادیمیا تەرخاندەکەن. بەڵام ئەرکی ئەم ئەکادیمیایە بریتییە لە پارێزگاریکردن لە سەلامەتی زمانی فەرەنسی و بەشداریکردنە لە نوسینەوەی فەرهەنگی زمان و پشکنینی ئەو وشانەی بەکارناهێنرێن.

**-ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە بە زمانی عەرەبی بنوسیت؟**

*جار بەجار هەندێ دەق دەنوسم، بەڵام هیچ کتێبێکی تەواوەتیم بە زمانی عەرەبی نەنوسیوە، وەلێ دوور نییە لە ئایندەدا شتێکی وا بکەم. هەڵبژاردنی زمانی نوسین، هەم ڕەهەندێکی شارستانی هەیە و هەم ڕیتمێکیشی لەسەر گوێچکە هەیە، زمانی نوسین بە تەنها ئامرازێک نییە بۆ داهێنان.

**-هەرچەندە نوسینەکانت بە زمانی فەرەنسییە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تۆ زۆر بە توندی پەیوەستی بە جیهانی عەرەبییەوە، ئەوە چۆن لێکدەدەیتەوە؟**

*لە هەموو نوسینەکانمدا، هەوڵمداوە خوێنەرانی جیهان، بە لایەنە ڕوناکەکانی کەلتوری عەرەبی ئیسلامیمان ئاشنا بکەم. لەو پێناوەدا، وەک دەزانیت، هەندێ لە کتێب و لە ڕۆمانەکانم بۆ ئەو لایەنە تەرخان کردووە، بۆ نمونە سەمەرقەند، لیۆنی ئەفریقی، گەشتەکەی باڵداسار و ئەوانی دیکە، ئەو کتێبانەم تەرخانکردووە بۆ لێکدانەوەی ئەو لایەنانەی عەرەب و موسڵمانەکان داهێنانیان تێدا ئەنجامداوە. بێگومان ئەوە لایەنێکی سەرەکی و بنچینەییە و بەشێکی جیانەکراوەیە لە شوناسم و لە شوناسی خێزانەکەم کە شەیدای نوسینی شیعر بوون، بەڵام من ڕومکردە نوسینی ڕۆمان.

**-ئێمە دەنگدانەوەی ڕۆمانەکانت لە زمانەکانی دیکەوە دەزانین، بەتایبەتی لە زمانی عەرەبیدا، بەڵام بە پێی زانین و ئاگاداری خۆت، دەنگدانەوەی خوێنەری ئینگلیزی بۆ ڕۆمانەکانت چۆن بووە؟**

*جیاوازی هەیە لەنێوان خوێنەری عەرەبی و فەرەنسی و ئیسپانی و ئینگلیزیدا، چونکە خوێنەری ئینگلیزی لە شوێنی جیاواز جیاوازەوە دێت، لە هندستان یان ئوستورالیا یاخود بەریتانیا یان لە ئەمریکاوە دێت، بۆیە ناکرێ چوارچێوەیەکی بۆ دابنێت و ناتوانیت بزانی بایەخ بە چی دەدات، مەگەر تەنها ئەو کاتە نەبێت کە قوڵایی ناخی ئەو خوێنەرە تاقیبکەیتەوە. وەلێ هەموو ڕۆمانەکانم کراون بە ئینگلیزی، ئەمەش




مانای وایە خوێنەرێک هەیە چێژ لەوە وەردەگرێت کە دەینوسم.

**-بیروڕات سەبارەت بە پۆلێنکردنی ئەدەبی فرانکفۆنی چییە؟**

*لەو بڕوایەدام گوزارشتی ئەدەبی فرانکفۆنی، زاراوەیەکی ورد نییە، باشتر وایە بوترێت (ئەدەبێک کە بە زمانی فەرەنسی نوسراوە). لەو بڕوایەدام زاراوەی ئەدەبی فرانکفۆنی، تێکەڵییەکی زۆر لە ڕەهەندی ڕۆشنبیری یان سیاسی یاخود تەکنیکەکاندا، دروست دەکات. من حەز بەو تێکەڵوپێکەڵییە ناکەم، بۆیە پێم باشە زاراوەی فرانکفۆنی بەکارنەهێنرێت. پێم باشە کاروباری ڕۆشنبیری دووربێت لە سیاسەتەوە.

-نوسەری ئیسپانی "ئەنتۆنیۆ گالا" ڕۆمانی (دەستنوسە سورەکە - المخطوط القرمزي) نوسیوە، ئەم ڕۆمانە باس لە دوا ڕۆژەکانی "عبدالله الصغير" دەکات، ڕات چییە بەرامبەری، چونکە ئەویش ڕۆمانی مێژویی دەنوسێت یاخود ئەو ڕۆمانە دەنوسێ کە پشت بە مێژوو دەبەستێ، ئەگەر ئەم دەربڕینە ڕاست بێت.

-ڕۆمانی (دەستنوسە سورەکە) ڕۆمانێکی جوانە، بەتایبەتی نوسەر لە تێڕوانینی کەسی دۆڕاوەوە ڕۆمانەکەی نوسیوە، ئەمە لەلایەک. لەلایەکی دیکەوە نوسەر خۆی سەر بە لایەنی براوەیە، واتە سەر بە ئیسپانیایە. ئەمەش ڕەوایەتیەکی ئەدەبیو فیکری و سیاسی دەبەخشێتە نوسەری ئیسپانی ئەنتۆنیۆ گالا.

**-گەشتی باڵداسار و ڕۆمانەکانی دیکەت، ئایا لە واقیعی لوبنانەوە هەڵتهێنجاوە یاخود لە ئەفسانەکانی دیکەوە؟**

*هەندێ لایەنی هەیە پەیوەندی بە لوبنانەوە هەیەو هەندێ لایەنی دیکەی هەیە پەیوەندی بە شارستانیەتە جۆراوجۆرەکانی دیکەوە هەیە کە جیهانی ئێستایان پێکهێناوە. من لە میانەی خەیاڵەوە ڕۆمان دەنوسم، خەیاڵیش سنوری نییە.

**-چۆن چۆنی لە نوسینی ڕۆمانەوە دەچیتە سەر نوسینی وتار یان لێکۆڵینەوە. وەك ئەوەی لە هەردوو کتێبەکەتدا ئەنجامداوە: (شوناسە بکوژەکان) و (تێکچونی جیهان)؟**

*یەکێک لە ڕەگەزە سەرەکییەکان، بریتییە لە ڕوداوەکانی دەوروبەر، ئەم ڕوداوانە هانمدەدەن بیروڕای خۆم بنوسم، چ بەشێوەی لێکۆڵینەوە یان بە شێوەی دەرخستنی بیروڕا. من نامەوێت ڕۆمان وەک مینبەرێک بۆ گوزارشتکردن لە بیروڕاکانم بەکاربێنم، چونکە ئەوە هەمیشە مەترسی ئەوەی هەیە هەڵخلیسکێیتە ناو نوسینی ڕۆمانی تەبشیرییەوە. بۆیە پێم باشترە بیروڕاکانم لە لێکۆڵینەوە و وتاردا بخەمەڕو نەک لە ڕێی ڕۆمانەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە زیان بە بنەما و بەهاکانی ڕۆمان نەگەیەنم. نابێت ڕۆمان ببێت بە دەمامک یان ببێت بە ئامێرێک بە دەستی نوسەرەوە. پێویستە ڕۆمان هەر بە (ڕۆمان) بمێنێتەوە.

**-ئایا کەسێتییەکی مێژویی یان ڕوداوی مێژویی هەیە تا ئێستا لەسەرت نەنوسیون؟**

*بەڵێ، من لەو پێنج سەد بیرۆکەیەی بە خەیاڵمدا دێت، تەنها یەک بیرۆکەیان جێبەجێ دەکەم. ئاشکرایە




پرۆژەی نوسینی هەر کتێبێکم، کاتێکی هێجگار زۆرم لێدەبات، لە دوو ساڵەوە بۆ سێ ساڵ دەخایەنێت. ڕەگەزی کات تابڵێی زۆر گرنگە و ژیانی مرۆڤیش سنوردارە، هەروەها توانای مرۆڤ بۆ کارکردن و بۆ جێبەجێکردنیشی سنوردارە. با نمونەیەکت بۆ بێنمەوە، بیرم کردەوە ڕۆمانێک دەربارەی "ئیبن بەتوتە" بنوسم، بەڵام پاشگەزبومەوە. واقعی ناوچەکەمان پێویستی بەوەیە ڕۆمانی زیاتری لەسەر بنوسرێت، تاکو تیشک بخرێتە سەر قۆناغەکانی پێشکەوتنی بە هەموو ئەو ناکۆکی و ململانێ و ئاڵۆزیانەی لەخۆیدەگرێت.

**-تۆ نوسەرێکی ڕاگوزەری لە نێوان زیاد لە سنوری دەوڵەتێك و زمانێکدا دێیت و دەچیت، تێڕوانینی تۆ بۆ دیالۆگی نێوان کەلتورەکان چییە؟ ئەی پەیوەندیت بە خۆرئاواوە چۆنە؟**

*دیالۆگی نێوان کەلتورەکان ئاڵوگۆڕی نێوان گروپەکان نییە، بەڵام پێش هەمو شتێ ئاڵوگۆڕێکە لەنێوان تاکەکاندا. کەلتورەکان بە تەنها بەهایەک نین. کەلتورەکان تەنها لە میانەی ئەو کەسانەوە بونیان هەیە کە نوێنەرایەتی دەکەن، ئەم کەسانەش لە هەر وڵاتێک یان شارێک یاخود گەڕەکێک یان قوتابخانەیەک یا کۆمپانیایەکدا بن، کەسانی جیاواز جیاوازن. دیالۆگی ڕاستەقینەی لەناو ناخی هەر تاکێکدا ڕودەدات. لەوبڕوایەدام جیهانی خۆرئاوا بەشێکی زۆر ڕاستگۆیی ئەخلاقی خۆی لەدەستداوە، هەروەها بەشێکی زۆر لە ئیمانی خۆی بە بیروڕاکانی خۆی لەدەستداوە. لەسەر نوسەران و هونەرمەندان پێویستە، ڕۆڵێکی سەرەکی لە نزیککردنەوەی نێوان شارستانیەتی عەرەبی و خۆرئاوایدا ببینن. لە باشترین حاڵەتەکاندا پێویستە لەنێوان هونەرمەندانی دەریای سپی ناوەڕاستدا (سازانێک) هەبێت، تاکو بەشداربن لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا، بەڵام ئەمە تەنها وەک هیوایەک دەمێنێتەوە، چونکە ئاشکرایە ئەوە لەمڕۆدا ڕونادات، ئەگەرچی کەسانێکی زۆر هەن بەم ئاراستەیەدا ئیشدەکەن.

**-ئەوبەربەستە سەرەکییانە چین کە لێناگەڕێت دیالۆگی کەلتوری نێوان وڵاتانی هەردوو کەناری دەریای سپی ناوەڕاستدا دەرکەوێت؟**

*من حەزناکەم لەو ڕوانگەیەوە تەماشای ئەو جۆرە پرسیارانە بکەم کە کۆمەڵێ بەربەست هەیە دەبێ تێپانپەڕێنین. من پێم وایە جیهانی عەرەبی سەبارەت بە خودی خۆی و مێژووەکەی و دوارۆژی و پێگەی لە جیهاندا و پەیوەندی بە مۆدێرنە و ئاین و ئازادی و مافە مەدەنییەکان و ژیانی تایبەتەوە، پێویستی بە بیرکردنەوەیەکی قووڵ هەیە. هەروەها خۆرئاواش پێویستی بەوەیە لەسەردەمی جیهانگیری و لە بەکارهێنانی هێزدا لە پەیوەندی بەوانی دیکەوە، بیر لە ڕۆڵی خۆی بکاتەوە. لەو بڕوایەدام ئێمە لە هەردوو کەناری دەریای سپی ناوەڕاستدا، پێویستمان بەوەیە سەرلەنوێ و بەشێوەیەکی ڕادیکاڵانە بیر لە چەمکی شوناس بکەینەوە.

**-بیروڕای تۆ دەربارەی ئەوەی لە جیهانی**










**عەرەبیدا ڕوودەدات چییە، یان ئەوەی پێیدەوترێ بەهاری عەرەبی؟**

*لەم ساڵدا بارودۆخی جیهانی عەرەبی گۆڕا، دەکرێ بوترێت ئەم ڕوداوانە چەندین ڕەهەند و مانای قووڵ و زۆر لەخۆدەگرن. هەموو ئەوەی ڕوودەدات پەیوەندی بە مێژووی جیهانی عەرەبییەوە هەیە. بەهاری عەرەبی کۆتایی قۆناغێک و سەرەتای قۆناغێکی تازەیە. لەو بڕوایەدام پێویست بوو ئەوەی ڕوویدا ڕوبدات، ئەو جووڵەیەی ڕوویدا دەبوایە هەر بهاتایە، چونکە بارودۆخەکە گەشتبووە ئاستێک چیتر تەحەمول نەدەکرا. ئەمە سەرەتای قۆناغێکی دووردرێژ و سەختە کە هەڵچون و داچونی زۆری تێدایە، بەڵام لەم جۆرە وەرچەرخانانەدا ئەو هەڵچون و داچونە سروشتییە روبدات. ئەم هەموو شتە ناکرێت بەو پەڕی هێمنی و ڕێکوپێکییەوە ڕوبدات، وەک ئەوەی لە نوسینی سیناریۆیەکی ئامادەکراودا ڕودەدات. چونکە ئەوە شۆڕشێکی ڕاستەقینەیە. ئێمە ڕێگایەکی تازە دەدۆزینەوە، بۆیە پێویستە هەر ئەو ڕێچکەیە بگرینەبەر.

**-ئایا تۆ وەك خۆت پێشبینی ڕودانی بەهاری عەرەبیت دەکرد؟ بەو پێیەی تۆ لە ئەوروپا دەژیت، ئایا لەو بڕوایەدای بەهاری عەرەبی کاریگەری لەسەر ئەوروپا هەبێت؟**

*لە ڕاستیدا، من هیواداربوم بەهاری عەرەبی ڕوبدات، بەڵام پێشبینی ڕودانیم نەدەکرد. ئەوە هەر دەبوایە ڕوبدات، دەبوایە جیهانی عەرەبی ڕاپەڕێت و لەو خەوە قووڵەی بێتەدەرەوە کە تێیدا نوقم بووە. هەمو شتێک بە خێرایییەکی گەورە ڕویدا. بۆ من شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، بەڵام چاوەڕوان نەکراوێکی خۆش بوو. لەو بڕوایەدام ئەوروپا لە ئێستادا دووچاری قەیرانێکی ڕاستەقینە بووەتەوە، ئەم قەیرانەی ئەوروپا لە جەوهەریدا لە قەیرانی ڕێڕەوی یەکێتی ئەوروپاوە سەرچاوەی گرتووە. ئەوە قەیرانێکی گەورەیە و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەوەوە نییە کە لە جیهانی عەرەبیدا ڕودەدات. بەڵام ڕوداوەکان لەیەک کاتدا ڕودەدەن.

قەیرانی ئەوروپا پەیوەندی بەو ڕوداوانەوە هەیە کە سەرچاوەکەیان وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و هەڵکشانی ئابورییە تازەکانە لە هەر یەک لە هند و چین و وڵاتانی باشور. بۆیە قەیرانی ئەوروپا لە سیاقێکی دیکەدا ڕودەدات. بەڵام خۆرئاوا وەک جوگرافیا و بەناویەکداچونی جیهانی خۆرئاوا و جیهانی عەرەبی، ئەوا وادەکەن قەیرانەکانیشیان بەناویەکدابچن. من وا هەستدەکەم قەیرانی ئەوروپی و گۆڕانکارییەکانی جیهانی عەرەبی، لە قۆناغێکی تازەدا لەیەکترەوە ئاڵاون و بەناویەکداچوون.

**-لە ئەوروپا چەندین کتێب لەم ڕووەوە بڵاوکرانەوە، ئایا ئەو کتیبانە وێنەیەکی ڕاستەقینەی ئەم ڕوداوانە دەخەنەڕوو؟ ئایا نیازت نییە کتێبێك لەسەر ئەم ڕوداوانە بنوسیت؟**

*ئێمە لە قۆناغی خێرا گواستەوەی هەواڵەکاندا دەژین، لەبەر ئەم هۆکارەیە لەم بوارەدا کتێبێکی زۆر بڵاوکراونەتەوە. هەرچۆنێک بێت ئەو کتێبانە کتێبی سودمەندن، ئەگەرچی جیاوازیشبن. ئەو کتێبانە تاڕادەیەک وەسفی ڕوداوەکانی ناوجەرگەی واقعیان



کردووە، هەروەها ئەو کتێبانە دۆکیمێنتی ئایندەن.
من سروشتی خۆم واملێدەکات حەزم لە هێمنی و چاودێریکردنە، من هەندێ لەوانەی کە دەنوسرێن، زۆر بە بایەخەوە لێیاندەڕوانم و هیچ پەلەشم نییە. بیر لەوە دەکەمە شتێک بنوسم پەیوەندی بەو ڕوداوانەوە بێت کە لەم ساڵدا ڕوویاندا، بەڵام من لەو نوسەرانەم کە لە ڕوداوی گەرماوگەرم دوور دەکەونەوە، ڕەنگە دوای تێپەڕبونی چەندین ساڵ بەسەر ئەو ڕوداوانەدا، شتێک لەو ڕوداوانە وەربگرم. زەحمەتە لە کتێبێکدا ڕۆمان یان شیکردنەوە بۆ بەهاری عەرەبی بنوسیت، پێش ئەوەی بەهاری عەرەبی سیماکانی و پێکهاتەکانی دەرکەوێت و ئێمە نازانین ئەمە کەی کۆتایی پێدێت یاخود لە ئایندەدا دەرئەنجامەکانی چۆن دەبێت و بە چ شێوەیەک دەکەوێتەوە.

**-ئایا لەو باوەڕەدای بەهاری عەرەبی کاریگەریی لەسەر داهێنانی ئەدەبی هەبێت؟**

*پێویستە ئەدیبەکان ئیلهام لەم جۆرە ڕوداوانە وەربگرن، من وا هەستدەکەم کاریگەری ئەم ڕوداوانە لە چەند مانگی داهاتودا دەرناکەون، لەوانەیە دوای پانزە ساڵ دەرکەون. هەستدەکەم ئەم قۆناغە لەگەڵ قەیرانە ئەوروپییەکەدا، لە ئایندەدا دەبنە هۆی ڕودانی ڕێنیسانسێکی ئەدەبی و کەلتوریی. ئەمە بەو مانایەیە ئەوەی ڕوویدا، بریتییە لە دەرهاویشتەکانی شۆڕشێکی ڕاستەقینە لە جیهانی عەرەبیدا.

**-تۆ ژمارەیەکی زۆر خەڵاتی جیهانیت وەرگرتووە، خەڵاتی (العویس) بۆ تۆ چ تام و لەزەتێکی هەیە؟**

*من ئەم خەڵاتە زۆر گرنگی دەزانم، چونکە خەڵاتێکی ڕۆشنبیرییە و لە جیهانی عەرەبییەوە هاتووە. وەک لە کارەکانم و ڕۆمانەکانمدا دیارە، من پێداگری لەسەر پەیوەندی نێوان ئەو دوو جیهانە دەکەم، هەوڵدەدەم پردەکان لەنێوان جیهانی عەرەبی و جیهانی خۆرئاوا، لە نێوان کەلتورەکانی خۆرهەڵات و کەلتورەکانی خۆرئاوادا دروست بکەم. زۆر گرنگە دەزگا ڕۆشنبیرییەکان بەردەوامی و جدییەتیان هەبێت، وەک ئەو حاڵەتەی لە دەزگای -سوڵتان العویس- ی ڕۆشنبیریدا هەیە. ئەمە زۆر گرنگە، نەک تەنها بۆ کەسەکان، بەڵکو بۆ پێگەی ڕۆشنبیریی لە وڵاتەکانماندا.

**-ئایا بەنیازی نوسینی ڕۆمانێکی تازەیت؟ ئەی لە کوێ بڵاویدەکەیتەوە؟**

*لەوانەیە لە مانگی ئەیلول یان تشرینی یەکەمی داهاتودا بڵاوببێتەوە، من خەریکم دواهەمین پاکنوسی دەکەم. بەڵام بۆ دەزگای بڵاوکردنەوە، ئەوا هیچ گۆڕانکارییەک ڕوینەداوە، چونکە من لەو نوسەرانەم دەزگای بڵاوکردنەوەکان ناگۆڕن یان لە دەزگایەکەوە ناڕۆن بۆ دەزگایەکی دیکە. پەیوەندی من لەگەڵ بڵاوکەرەوەکەم لە دەزگای بڵاوکردنەوەی (گراسییە) باشە و ناگەڕێم بەشوێن دەزگایەکی دیکەدا.

**-ئایا دەکرێ بابەتەکەی یان ناونیشانەکەیمان پێ بڵێیت؟**

*من حەزناکەم قسە لەسەر ڕۆمانێک بکەم جارێ بڵاونەبوەتەوە، تەنانەت ناونیشانەکەشی جارێ یەکلایی نەبووەتەوە. بەڵام دەتوانم هەر ئەوەندە بڵێم کە ڕوداوەکانی ڕۆمانەکە لەم سی یان لەم سی‌وپێنج ساڵەی دواییدا ڕوودەدان، ئەوە ڕۆمانێکی مێژوویی نییە یان پشتی بە مێژوو نەبەستووە.

سەرچاوە: لاپەڕەی ڕۆشنبیری، ڕۆژنامەی الشرق الاوسط، یەکشەمە، ٢٠١٢/٥/٦

# ئەدەب و هونەر

* پشیلەیەک لە بەرباراندا — ئێرنست همنگوای — و. لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵا
* خەونەکانی باوکم — غوڵام حسێن — و. لە فارسییەوە: مەزهەر ئیبراهیمی
* سێ دەقی شیعری — و. لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

# پشیلەیەك لەبەر باراندا

نوسینی: ئارنست همنگوای
و. لە عەرەبییەوە : دڵنیا عەبدوڵڵا

دوو ئەمریکی بەتەنها لەو ئوتێلەدا دابەزین، هێشتا کەسیان لە میوانی ئەو ئوتێلە نەناسیبوو، بەنێو پلیکانە بەرزەکاندا ڕێگەیان گرتەبەر، بە ڕاڕەوێکدا تێپەڕین بەرەو ژوورەکەیان کە لە قاتی دووەم بوو، بەرامبەر بە دەریا و بەسەر باخچەیەکی گشتیدا دەیڕوانی کە لە ناوەڕاستیدا پەیکەرێکی یادگاری جەنگ دانرابوو، هەندێک دارخورمای تێدا نێژرابوو لەگەڵ چەند سەکۆیەک کە بەڕەنگی سەوز بۆیە کرابوو.
هەمیشە لەکەش و هەوایەکی خۆشدا، یەکێک لە نیگارکێشەکان دێتە ئەو شوێنە و تابلۆکانی لەگەڵ خۆیدا دێنێت، هونەرمەندەکان عاشقی ئەو شێوازە بوون کە دارخورما بەرزەکانی پێ ڕوا بوو، هەروەها شەیدای ڕەنگە بریقەدارەکانی ئوتێلەکان بوون کە بەرامبەر بە باخچەکان و دەریا بوون.
چەند ئیتالیەک لە شوێنی دوورەوە هاتبوون، بەمەبەستی بینینی ئەو پەیکەرە برۆنزیەی کەشێوەکەی دەبریقایەوە پاش ئەوەی باران لێی دەدا. بارانەکە لەمیانەی دارخورماکانەوە دای دەکرد و جۆگەلەیەک ئاوی لێڵی لەنێو ئەو ڕاڕەوانەدا پێک هێنابوو کە چەو ڕێژ کرابوون، دەریاکە لەژێر ڕێژنەی باراندا بەهێڵێکی خوارو خێچ دوو لەت دەبوو، بەرەو کەنارەکە دەخلیسکا و دەدرایەوە، پاشان بەهێڵێکی درێژی شکاوی دی بەرز دەبوەوە، پاش ئەوەی بارانەکە زۆر دەبوو پاشەکشێی دەکرد.
عەربانەکان گۆڕەپانی پەیکەرەکەیان جێهێشت، لەقاوەخانەی نێو گۆڕەپانەکەدا، یەکێک لە شاگردەکان لەدالآنەکەدا وەستا بوو تەماشای دەرەوەی دەکرد، کە شوێنەکە چۆڵ بوو.
ژنی پیاوە ئەمەریکیەکە لەبەرم پەنجەرەکەیدا وەستابوو، تەماشای دەرەوەی دەکرد، لە خوارەوە و لای ڕاستی پەنجەرەکەوە بێچووە پشیلەیەک دانیشتبوو، لەژێر مێزێکی سەوزی تەڕدا گرمۆڵە ببوو، دەلەرزی، هەوڵی دەدا دڵۆپە بارانەکانی بەر نەکەوێت لەکاتی بارینیاندا، ژنەکە وتی:
– من دەچمە خوارەوە ئەو بێچووە پشیلەیە دێنم
مێردەکەی لەجێگەکەیەوە ناڕازی بوو، وتی :
– من دەچم
– نەخێر، من دەیهێنم، داماوە هەوڵدەدات تەڕنەبێت لەژێر مێزەکەدا.
مێردەکەی دەستی کردەوە بە خوێندنەوە، کەلەسەر دووسەرین لەخوار جێگەکەیەوە پاڵی دابوەوە، بەژنەکەی وت:
ئاگاداربە تەڕ نەبیت ...
ژنەکە هاتە خوارەوە بۆ قاتی یەکەم، خاوەن ئوتێلەکە پیاوێکی پیری درێژ بوو، وەستا و بەسەر ڕاوەشاندنێک سڵاوی لە ژنەکە کرد کاتێک کە بەلای نوسینگەکەیدا تێپەڕی، مێزەکەی لەسوچێکی دووری ژووری کارگێڕیدا بوو، ژنەکە شێوەی پیرەمێردەکەی بەدڵ بوو، وتی: – ئێوارەت باش
– بەڵی، بەڵی خانم، چ کەش و هەوایەکی نالەبارە .
پیاوەکە لەشوێنەکەی خۆیدا و لە سوچێکی دووری



ئارنست هەمنگوای

بەر ڕووناکیەکی کزدا مایەوە، لەوە دەچوو ژنەکە ئەو پیاوەی بەدڵ بێت، شێوازی قسە کردن و دڵسۆزی لە کارەکەیدا بەدڵبوو کاتێک کە یەکێک سکاڵای ئاراستە دەکرد، سەنگینی و شێوازی پێشکەش کردنی خزمەتگوزاریەکانی بۆ ئەو بە دڵ بوو، هەروەها ڕێز گرتنی لەپلەو پایە کارگێڕییەکەیدا .
هەروەها پیرێتی و پتەوی ڕووخسار و دەستە زلەکانی بە دڵبوو، هەستی بە مەیلێکی زۆر کرد بەلایدا.
ژنەکە چوو دەرگاکەی کردەوە و سەیری دەرەوەی کرد، لەوکاتەدا ڕێژنەی بارانەکە توند بوو، پیاوێک بەبەردەمیدا بە گۆڕەپانە چۆڵەکەدا بەرەو قاوەخانەکە تێپەڕی، قاپوتێکی بارانی لەبەردا بوو، پێدەچێت پشیلەکە شوێنێکی بۆ خۆی لەلای ڕاستەوە دۆزیبێتەوە، لەوانەشە تۆزێک دوور کەوتبێتەوە بەرەو هەیوانەکە، لەو کاتەدا کە ژنەکە لە دالآنەکەدا وەستا بوو، چەترێک لە تەنیشتیەوە لەلایەن کارگوزاری ژوورەکانەوە کرایەوە، وتی: نابێت تەڕبیت، بەزەردەخەنەوە بە ئیتالی قسەی لەگەڵدا کرد، بێگومان لەوانەیە بەڕێوبەری ئوتێلەکە ناردبووی، ژنەکە بە ڕاڕەوە چەو ڕێژەکەدا خێرا دەڕۆیشت و کارگوزارەکە دوای کەوتبوو و چەترەکەی بۆ هەڵ کردبوو، تا ئەو شوێنەی بەتەواوەتی لەژێر پەنجەرەکەیدا بوو، بینی مێزە سەوزەکە لە شوێنی خۆیدا دەبریقێتەوە کە باران شتبوویەوە، بەڵام پشیلەکە لەوێدا نەمابوو.
لەناکاو تووشی نائومێدی بوو، کارگوزارەکە سەیری کرد و پرسیاری کرد:
خانم، هیچت لێ ون بووە ؟

ژنە ئەمەریکیەکە وەڵامی دایەوە:
پشیلەیەک لێرەدا بوو .
-پشیلە ؟
- بەڵێ پشیلە.
-پشیلە (کارگوزارەکە پێکەنی ) _ پشیلەیەک لەبەر باراندا.
-وتی: بەڵێ لەژێر ئەو مێزەدابوو. ئۆی، من دەمەوێت، من پڕ بەدڵ ئەو بێچووە پشیلەیەم دەوێت .
ڕووخساری کارگوزارەکە گرژ بوو، کاتێک بەزمانی ئینگلیزی قسەی لەگەڵدا کرد، وتی:
- خانم وەرە بابچینە ژوورەوە، تەڕدەبیت.
ژنە ئەمەریکیەکە وەڵامی دایەوە:
- وابزانم.
بەنێو ڕاڕەوە چەو ڕێژەکەدا گەڕانەوە، ژنەکە لە دەرگاکەوە هاتە ژوورەوە، لەکاتێکدا کارگوزارەکە لە دەرەوە دواکەوت تا چەترەکە دابخات، هەر کە ژنە ئەمەریکیەکە بە نوسینگەی ئوتێلەکەدا تێپەڕی، بەڕێوبەرەکە لەپشت مێزەکەوە سەرێکی تری بۆ لەقاند، ژنەکە دڵی زۆر تەنگ بوو، هەستێکی ناخۆشی پێدا هات، سەر لەقاندنی پیاوەکە لەو کاتەدا دڵ تەنگ تری کرد، بەڵام هاوکات هەستی بە گرنگی و نرخە ڕاستەقینەکەی خۆی کرد، کە لە هەست کردنێکی ساتی ناکۆتا بە بوون و بەرزی و باڵایی دەچوو، بەسەر پلیکانەکاندا سەرکەوت، کاتێک دەرگای ژوورەکەی کردەوە، جۆرجی مێردی هێشتا لەسەر جێگاکە ڕاکشا بوو و بەردەوام بوو لەخوێندنەوەدا.

– کتێبەکەی خستە لاوە و پرسیاری لێکرد، پشیلەکەت هێنا؟
– ڕۆیشتبوو.
پیاوەکە چاوەکانی هەڵگڵۆفی تا لەخوێندنەوە پشویان پێبدات، پرسیاری کرد: سەیرە بۆ کوێ چووبێت؟
ژنەکە لەسەر لێواری جێگاکە دانیشت و وتی :
زۆر حەزم دەکرد بۆ من بێت، نازانم بۆچی ئەوەندە سورم لە ویستنی ئەو پشیلە دامـاوە، ئاخۆ بوونی بێچووە پشیلەیەکی نەگبەت لەبەر باراندا شتێکی دڵخۆشکەرە؟.
جۆرج دەستی کردەوە بە خوێندنەوە، ژنەکەش چووە بەردەم مێزی خۆڕازاندنەوەکە و دانیشت، بەئاوێنەیەکی بچووک سەیری خـۆی دەکـرد، لەلاتەنیشتەوە لە ڕووخسـاری خۆی دەڕوانـی، لەپێشدا لە لایەکەوە دەستییپێکرد، پاشان لاکەی تری، پاشان سەیری پشتە سەر و ملی دەکرد.
– ئایا بەبیرۆکەیەکی باشی دەزانـی گەر قژم درێژ بکەمەوە ؟
ئەم پرسیارەی کرد لەو کاتەدا کە دووبارە سەیری دەم و چاوی خۆی کردەوە، جۆرج ئاوڕی دایەوە تەماشای دیمەنی ملی ئەوی کرد لـەدواوە، کە قژی وەک کوڕ بڕیبوو
– من ئاوا حەزم لێیە.
وتی: ماندوو بووم لێی، ماندوو بووم لەوەی لە کوڕ دەچم .
جۆرج ڕاست بوەوە و باری خۆی لەجێگەکەیدا گۆڕی، سەیری ژنەکەی نەکردبوەوە لەوکاتەوە کە دەستی بەدواندنی کردبوو، وتی:
– بەڵام ئاوا جوان و نازدار دیاریت،..... نەفرەت
ژنەکە ئاوێنەکەی خستەوە ناو چەکمەجەکەوە، هەستا و ڕووی کردە پەنجەرەکە، تەماشای دووری دەکرد، لەدەرەوەی ژوورەکەدا تاریکی باڵی کێشا بوو، وتی :
– حەزدەکەم قژم ببمە دواوە و بەتوندی بیبەستم، پرچێکی گـەورەی لێدروست بکەم تا ناوشانم بێتە خـوارەوە، ئەوە هەستمە، حەزدەکەم ببمە خاوەن بێچووە پشیلەیەک و لە باوەشمدا دایبنێم، هەرکە دەستم بە سەریدا هێنا، بمیاوێنێت.
جۆرج لەسەر جێگەکەیەوە بۆڵە بۆڵێکی لێهات:
– بەڵێ....
– هەروەها حەز دەکەم لەسەر مێزێک و لە قاپە زیویە تایبەتیەکاندا و لەبەر تیشکی مۆمدا نان بخۆم، حەز بە هاتنی بەهار دەکەم، لەبەر بادا و لەبەردەم ئاوێنەدا قژم دابێنم، پشیلەیەک و هەندێک کراسی نوێم دەوێت.
–ئۆی، بێدەنگ بە، شتێک بەرەو بیخوێنەرەوە......
جـۆرج ئـەمـەی وت و دووبـــارە دەسـتـی کـردەوە بەخوێندنەوە، ژنەکەش دووبـارە لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکـرد، دنیا تاریک تر ببوو، بارانیش بە بەردەوامی بەسەر درەختەکاندا دەباری.
وتی:
– بەهەرحاڵ پشیلەیەکم دەوێت، ئێستا دەمەوێت، ئەگەر نەتوانم بەخۆشی بژیم و قژێکی درێژم نەبێت، ئەوا دەتوانم ببمە خاوەن بێچووە پشیلەیەک.
جۆرج گوێی لە قسەکانی نەگرتبوو، بە تەواوەتی سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبەکەی بوو،
ژنەکەی هەر چاودێری پەنجەرەکەی دەکرد و تەماشای ئەو ڕووناکیەی دەکرد کە گۆڕەپانەکەی داپۆشیبوو، لەکاتێکدا کەسێک لە دەرگـای دا. جـۆرج لەسەر کتێبەکەیەوە سەیری کرد و وتی:
– وەرە ژوورەوە .
کارەکەرەکە لە ڕاڕەوەکـەدا لەلای دەرگاکەوە وەستا بوو، پشیلەیەکی بە دەستەوە بوو توکەکەی لە ڕەنگی قاوغی کیسەڵ دەچوو، پشیلەکە بەزۆر لەچنگی هەڵات، بە پێچەوانەی ئاراستەی ئەوەوە دەهات و دەچوو، دەیویست بچێتە خوارەوە، کارەکەرەکە وتی:
– ببورە... بەڕێوبەر داوای لێکردم ئەو پشیلەیە بۆ خانمەکە بێنم .

وەرگـێڕانـی بۆ عـەرەبـی:
زەعـیـم ئـەلـتـائـی
سـەرچـاوە: WWW.adebogy.maktoobblog.com

# خەونەکانی باوکم

نووسینی: غولام حسێن ساعێدی
و. لە فارسییەوە: مەزهەر ئیبراهیمی

ئەمڕۆ هەینییە. باوکم لە دیوەخانەکە دانیشتووە و چند پەڕاوێک و باوەشێ کاغەزی بە دەور خۆیدا بڵاوکردووەتەوە. سەرتاقەکان بە بەڵگەی تێچوو و ڕەشنووسی مووچەی مووچەخۆران و پەڕاوی جۆراوجۆر ئاخنراون. باوکم ژمێریاری مەزرینگەی داراییە. دایکم بە بۆڵەبۆڵ لە ژوورەکە دێتەدەر و لەسەر پلیکانەکان دادەنیشێ و بە ئاماژە بۆ لای خۆیم بانگدەکا:

ـ "کارەکانی ئەبینی؟ بڕوانە چ قوڕێکم چووەتەسەر، ئەمەش لە جومعەکانمان. چیبکەم؟ تا نەمرم لەم ژینە ڕزگارم نابێ. ئەزانم هەتا نیوەشەو ئەم بەزمەیە: مەجووڵێن، قسەمەکەن، ئەوە چی بوو داکەوت؟ هێواشتر قسەکەن، پەڕاوە گشتییەکەم لەکوێیە؟... هێشتا دیوەکانم گسک نەداوە. چێشتم لێنەناوە، ناتوانین بجووڵێینەوە، خەریکە شێت ئەبێ، وەرە، وەرە و سەیری کە".

هەردووکمان بە دزیەوە دەچینە بن دەلاقەکە. باوکم، لە سەرووی ژوورەکەوە، لەسەر پێخەفێک خۆی پانکردووەتەوە، قژە دانامەکەی* ڕژاندووەتە ناوچەوانی، چاویلکەکەی هێناوەتە سەر کەپوی، دووگمەی کراسەکەی کراوەیە و دەفەی سینگی قوت و ڕەقتر لە هەمیشە دیارە.

چەند پەڕاوی گەورەی کەڵەکەکردووە، لای ڕاست و چەپی پڕە لە بەستەی زل زلی کاغەز. بەڵام هیچ ناکات، میدادێکی ناوەتە لای ددان و چاوی بڕیوەتە سووچی ژوورەکە. دایکم دیسانەوە دەست پێدەکا:

ـ "ئەمە بووە ماڵ، ئەمە بووە ژیان؟ خوا گیان مەرگم هەزار جار پێ خۆشترە! یەکێ نییە بەم پیاوە بڵێ، ئەمە ماڵە خۆ دایرە نییە، بۆ ئەوەنە خۆت ئەکوژی؟ سەیری کە، سەیری کە، وەک کتک** چاوی لەو کولەسووچە زەقکردۆتەوە، ئێستا دەس پێ ئەکا، هەڵمەت ئاهێنێ، چەن ژمارە لە مێشکیا تێکەڵ بوونە، بۆی ڕیز ناکرێن

دیتنی ئەم دیمەنانە بێزاری کردووم، بە زۆر دایکم



غولامحسێن ساعێدی

ئەکێشمە ئەملاوە و بە ئارامی پێی دەڵێم:

_ "باشە دەی دایە گیان، ئاوایە ئیدی، ئەبێ تاقەت بگری، زۆری نەماوە، دوو ساڵی دی خانەنشین ئەبێ و ئەم گێچەڵانە دوایی دێ و ڕزگارمان ئەبێ."

دایکم واز ناهێنێ، هەر بۆڵەی دێ، تەواو وەڕەز بووم، لە پلیکانەکان سەردەکەوم و دەرگای باڵەخانەکە دەکەمەوە و لەسەر زەویەکە ڕادەکشێم. وڕ بووم، خەریکم لەسەر خۆم ئەچم. لەسەر دیواری بەر دەمما وێنەی گەنجێتی باوکم هەڵواسراوە. سیمایەکی ڕێکوپێک، گۆنای تا ڕادەیەک گوپن و قژی داهێنراو. بە بیرمدا دێ، ئەمن بەم لاوازییە و بەم بێ تاقەتییەی بەرۆکی گرتووم، کاتێ بگەمە تەمەنی باوکم چیم لێ دێ. شتێک لە خەیاڵمدا جێی دەگۆڕدرێ، وێنەکەی باوکم گیانی تێ دێ، بیچمی تێکدەچێ و لۆچ دەوردەمی دەگرێ، قژی ئەشێوێ، ڕووی گرژ ئەبێ، گۆنای دەقوپێ، شانەکانی بەرزئەبنەوە، دەمی دادەچەقێ و بە یەکجاری دەڕشێتەوە. هەست بە دڵەخورپەیەکی ناخۆش دەکەم، ئەمەوێ هەڵسم. بۆنی شێم دێتە بەر لووت و بە شوێنیدا دەنگی هاواری باوکم لە دیوەخانەوە. هەڵمەت دەستیپێکردووە.

بە پەلە خۆم دەگەێنمە دیوەخانەکە. باوکم تەنیایە. بە شێوەیەکی سەیر دەلەرزێ.

_ چیتە باوکە؟ چی بووە؟

_ ڕاست نییە، ڕاست دەرنایێ. فێڵێک لە کارایە.

_ چ فێڵێ باوکە؟

_ هەموو شتێ لەم پەڕاوانە جێی ئەگۆڕدرێ.

_ چی جێی ئەگۆڕدرێ؟

_ ژمارەکان ئیتر. شتێ تری تیایە؟

_ چۆن جێیان ئەگۆڕدرێ؟

_ گشتیان وەکوو مێرووله ڕێدەکەن. تێکەڵ ئەبن، سەر ئەخەنە سەرم.

_ شتی وا نابێ باوکە.

_ چۆن نابێ؟ بەم چاوانەی خۆم بینیم، چەن دانە

چوار و پێنج و نۆ ئازا شوێنەکەیان گۆڕی.
ــ ئەمە گرنگ نییە بابە گیان...
ــ گرنگ نییە؟ بەلای تۆوە کە مفت ئەخۆیت و خوێری ئەگەڕێی گرنگ نییە ئەرێ.
ــ ماندوویت باوکە، ئەگەر تۆزێ...
ــ ماندووی چی؟ ئەگەر حسابەکە ڕاست دەرنەیێ ئەزانی چی ڕووئـەدا، هەر تێئەگەی چی ئەڵێم؟ ئەگەر تۆزقاڵێکیش جیاوازی هەبێ، ئەزانی چی ئەبێ؟ ئەزانی جیاوازی یانی چی؟
ــ جیاوازی جیاوازییە ئیتر.
ــ نا سەرزل، واتایەکی تری جیاوازی دزییە. جیاوازی یانی دزی.
ــ یانی کێ دزی کردووە؟
ــ یانی من. باوکە بێشەرەف و بێناموسەکەی تۆ.
ــ خۆ تۆ پارەت لە بەردەستا نییە.
ــ ئەی ئەمانە چییە ئەیاننووسم. ئەمانە پارە نین!
ــ ئاخر خۆ ژمارەی پارەکان نادزرێن.
ــ ئەی چی ئەدزرێت؟
ــ پارەکە خۆی.
ــ لاچۆ ونبە لەبەر چاوم گەوجە، تۆ چووزانی. خوالێخۆشبوو "دەفتەری"ت لەبیر نییە؟
ــ با، لەبیرمە.
ــ بۆچی خۆی کوشت؟
ــ نازانم.
ــ بەڵێ نازانی. لەبەر ئائەم جیاوازییە خۆی کوشت.
ــ کارێکی باشی نەکردووە.
ــ ئەرێ، بە ڕای ئێوە ئەرێ. منیش خۆم بکوژم هەر وا ئەڵێن.
ــ باشە خۆکوشتنی بۆچییە؟
ــ لـەبـەر نـاوزڕاویـەکـەی بـەقـوربـان، لـەبـەر ئاوڕووچوونەکەی. پێت وایە من لە چی ئەترسم؟ لە پۆلیس یان سەرۆکی دادگا، یان بەندیخانە؟ نا، من تەنیا لە ناوزڕاوی، لە ناوزڕاویەکەی ئەترسم.
ــ ناوزڕاو نابی باوکە، خەڵکی تۆ ئەناسن، دڵنیابە!
ــ ئێستا خۆ بوومە، ئێستا خۆ ناوم زڕاوە. باشە بۆ وای لێ هاتووە؟ بۆ هەموو شتەکان تێکەڵ بوونە؟ بۆ هیچی لە جێی خۆیدا نەماوە؟ ها؟ ئەتوانی وەڵام بەیتەوە یان نا؟ ها؟ بۆ لاڵ بوویتە؟ زمانت گیراوە؟ دە بڵێ دەی چەپەڵەی بێشەرەفە.
دەستی هەڵدەسووڕێنێ و لەپ بۆ یەکێک لە پەڕاوەکان دەکوتێ. منیش بە هەڵاتن خۆم دەربازدەکەم و بە شوێنمدا شتێکی قورس، مستێکی بەهێز ئەماڵێتە دەرگاکە.
کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ، من و دایکم لە هێشخاندا نانەکەمان دەخۆین و دێینە دەرەوە. نانەکەی باوکم لەسەر تاقەکە ساردبووەتەوە ، نە من و نە دایکم ناوێرین کاتی نانخواردنی وەبیربێنینەوە. باوکم سەری بەرزئەکاتەوە و سەیرێکی من و دایکم دەکات.
ــ چیتانە؟ بۆ وا تەماشام ئەکەن؟
ورەی من لە دایکم زۆرترە، بە شێنەیی دەڵێم:
ــ هیچ نییە.
ــ با، زۆر شت هەیە. ئێوە ئاگاتان نییە.
ــ ڕەنگە وابێ باوکە.
ــ ئەرێ، هەروایە، تۆ وەرە پێشێ.
ئەڕۆمە پێشەوە و لە تەنیشتیەوە دادەنیشم. پەڕاوە ئاوەڵاکەی پاڵ دەستی پڕە لە ئەستوونگەلی تەژی لە ژمارە. باوکم بە قامک ژمارەیەکم پیشان ئەدا.
ــ ئەمە چەنێکە؟
ــ نۆ!
ــ بەڵام تا خولەکێک لەمەوبەر هەفت بوو.
ــ ئەمەیان چەنێکە؟
ــ سێ.
ــ وایـە، ئەمە تەنیا ژمـارەیـەکـە لەجێی خۆی نەجووڵاوە.

__ ئەمەیان؟
__ هەفتە.
__ ئەک چەپەڵی بێشەرەف! هەر ئەمە بەرلەوەی پێتی نیشاندەم هەشت بوو.
__ چۆن وائەبێ؟
__ پێت وایە درۆت لەگەڵا ئەکەم؟ هەشت بوو ئیتر.
__ ئاخر شتی وا چۆن ئەبێ؟ ها؟
نەختێ لە قوژبنی ژوورەکـە ڕادەمێنێ و پاشان شاگەشکەدەبێ!
__ زۆر ڕوونـە، هەشت ئەگەر سەرمەقولاتێک ببا ئەبێتە هەفت. وانییە؟
بە هێواشی وەڵام ئەدەمەوە:
__ ئەرێ، بە تەقلەیەک ئەکرێ ببێتە هەفت.
__ تەقلە نا، سەرمەقولات.
__ وایە.
__ بەڵام هەفت هەرچی بکا نابێتە نۆ، ئەبێ؟
__ بۆ نابێ، ئەتوانی ڕاکشێ و وەک یەکی لێ بێ، پاشان سەری گێڕکاتەوە و لوولی کا و ببێتە نۆ.
مستەکۆڵەیەک بەر کەلەکەم دەکـەوێ و لەجێی خۆمدا هەڵدەبەزم.
__ تیتاڵی بە خۆت کە هەتیوەی کەرە. شتی وا قەت نابێ. بەڵام هەر ئەبێ سەر لەم فێڵە دەربێنم. ئەرێ، نهێنیەکی تیایە. سیحرێک لە ئارادایە.
ڕوو لە دایکم دەکا و چاوە دەرپەڕیوەکانی لێ زەق دەکاتەوە. بە هێواشی چاویلکەکەی لائەبا و لە نێوان پەڕاوەکەی دادەنێ.
__ ئەرێ ژنەکە، ئەمە کاری تۆ نەبێ؟
__ ئەوە چێ ئەڵێی پیاوەکە؟ تەواو لێت شێواوە.
__ ئەرێ گیانی خۆت، هەست ئەکەم هەمووی لە بن سەری تۆدایە. چیت کردووە؟
__ واز بێنە، بچۆ سەر ئیشەکەت. گەرەکتە بە منی ساغ کەیتەوە؟ بۆ وا بکەم؟
__ بۆ ئەوەی ئیتر ئیشی دایرە نەهێنمەوە ماڵ.
__ تۆبە خوایە! ئیتر چی ماوە بیڵێی؟!
خێرا هەڵدەبەزێ و ئەکاتە قژ دایکما و بە نێو ژوورەکەدا دەیسووڕێنێ و ناوەناوە مستێکی توندی بە ناوشاندا دەسرەوێنێ.
__ ئەتکوژم! ئەتتۆپێنم! ئەبێ بیڵێی، ڕاستییەکەم پێ بڵێ.
بە تووڕەییەوە خۆم هەڵدەدەمە نێوانیان. دایکم لە ژێر چەپۆکی باوکم دەردەهێنم. دایکم بەخوڕ ئەسرین دەڕژێنێ و دوعای شەڕ دەکا.
دایکم چارشێوەکەی هەڵدەگرێ و دەرگاکە ئەکاتەوە و ئەڕواتە دەرەوە. بەپەلە دوای دەکـەوم. دایکم بە دەم گریانەوە دێتەوە و بە باوکم کە خۆی لە دەلاقەکەی حەوشەکەوە شۆڕکردووتەوە، ئەڵێ:
__ لە خوام گەرەکە خۆشی نەیەتە ڕێت. زۆر باش لەم تەمەنا و بەم پیرییەوە وەڵامی چاکەت دامەوە. وائەزانی دیلت دەس کەوتووە؟ ئەچم بۆ ماڵی کاکم.
باوکم ئەنەڕێنێ:
__ بۆ هـەر گۆڕستانێ ئـەڕۆی بـڕۆ، خـوای کرد نەهاتیتەوە، هەرکەس دەس بباتە نێو کاروباری دایرە، ئەبێ هەر وای لێ کەی.
کاتژمێرەکە دوانزە جار زەنگ لێدەدا. مەلی کاتژمێر دوانزە جار دەمی ئەکاتەوە و دایدەخات. قووقەی کەڵەشێری دراوسێکەمان تێکەڵ بە دەنگی کاتژمێر ئەبێ. من لە باڵەخانەکە دانیشتووم و جگەرە دەکێشم، لەپڕ دەرگاکە دەکرێتەوە و باوکم شپرز و پەشۆکاو دێتەژوورەوە. دەست ئەنێتە سەر سینگ و لە بەردەمما چۆک دائەدا.
__ "بەڕێزی پایەبەرز! تکایە دوایین قسەکانم ببیسن، من تەنیا مووچەخۆرێکی کڵۆڵم. بە درێژایی تەمەنم بە خۆبەخشییەوە بەرپرسیارێتی حیساب و کیتابی دایـرەی دارایـیـم لە ئەستۆدا بـووە. خـوا بیزانێ

تا ئێستا هیچ تاوانێکم نەکردووە. تا ئێستا ئەم شوێنانە نەهاتووم. من بە شەرەفەوە ژیاوم و ئەژیم. نازانم چۆن ئاوام بەسەرهات. کەچی باش ئەزانم یاسا لە کەس نابووڕێ و هیچ تاوانبارێ بێ سزا ناهێڵێتەوە، بەڵام ئەمجارە تاوانی ئەو ژنە سەڵیتە و ئەو کوڕە ملهوڕەم بوو. من ترسم لە سزا نییە. تەنیا لە بێ ئابڕووی ئەترسم. خێری مناڵەکانتان بەرمدەن و مەهێڵن لە نێو خەڵکا نێوم بزڕێ. ناوم لە ڕۆژنامەکاندا بڵاومەکەنەوە، من کڵۆڵم، هەزاران چەرمەسەریم دیوە، بەڵام هەرگیز بی ئابڕوو نەبوومە. بێ ئابڕووم مەکەن. تکاتان لێ ئەکەم، تکاتان لێ ئەکەم..."

ئەیەوێ باوەش بە قاچما بکات، هەڵیدەسێنمەوە. ئەمجا دەنگی بەرز و تێکەڵ بە تێخوڕینی من لە دیوەکەدا دەنگ ئەداتەوە:

_ تەنیا تاوانی تۆ ئەوەیە فەرمانەکانی ئێمە جێبەجێ ناکەیت.

_ من گوو ئەخۆم. هەرچی بفەرموون بەوردی جێبەجێی دەکەم.

_ کەوایە، هەر ئێستا ئەچی حەبێکی ئاسپرین ئەخۆیت و بێخەم ئەخەویت.

باوکم بە دەم دووپات کردنەوەی "باشە بەسەرچاو" ژوورەکە بەجێ دەهێڵێ. پاش چەند چرکەیەک بە پێخشکە دەڕۆمە خوارەوە. پرخەپرخی باوکم لە دیوەکەدا دەنگ ئەداتەوە و لە جێگایەکی نادیارەوە، جریوەی مەلی کاتژمێرێک وەبەرگوێ دەکەوێ.

سەرچاوە: ساعدی، غلامحسین. شب نشینی باشکوه. تهران. انتشارات نگاه. چاپ اول ١٣٨٨





# سترانێك لەمەڕ ئەركی باوان

فرانسز كۆنفۆرد
و. لەئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

گیانی منداڵەكان دوورە و پڕ لە حیكمەت..
مەرجە ئازاد و سەرفراز بن
هەر وەك ماسییەكانی زەریا
یان ڕیشۆلەكانی ئاسمان..
تا ئەو حەلەی تۆ دەمێنیت
لە گوینە هەر بە ڕێكەوت دیسانەوە بێنەوە كەنار زەریا.
وەلێ لەوێدا كە سێبەری ستوونی ترس دەشكێت..
مەرجە لەناكاو تۆ هەر لەو دەوروبەرە و نزیك بیت..
تۆ كە ناجێگیریت.. مەرجە وەك درەخت لەوێدا سەوز بیت
چڕ و پڕ بە لق و پۆپی هەمیشە گەش و هەڵچوو بە ئاسماندا
سەنگین و داكەوتوو بە میوەی پێگەییو.. زەنگوڵەی زۆری زیوین..
كە لە باوەشیدا سیحری مەلی خۆشخوان دڵ دەبات
هەر هەمووشی وەك چیرۆكی پەریان دێتە بەر گوێ..
گەرچی هێشتا گەرەكە كە خودانی
ڕەگوڕیشەیەك بیت قووڵ و ڕەگاژۆ بە خاكێكی خاكەڕا ڕۆچوو بیت..
بەدەم ناڵینی دڵنەوایی زۆر گەرمەوە
تێر بە خۆشەویستی و ڕامووسان و نەوازشەوە.

*

دوا جار..کە تاریك دادێت
سەرێکی نشین و نیان لەسەر سەرین.. دڵنیا
چاوانی پاکی هەڵدەبڕێت و وەك بتنۆشێت ڕادەمێنێت.
ئەوکاتەیە کە لە پشت ئەوانەوە پرسیارەکاٰن چەکەرە دەکەن ..
بە سووربوونێکەوە و.. هەمیشە هەتەر
لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە لە ژیانتا درکاندووتە
سەبارەت بە خۆرەکان ومارەکان و لاتەریبەکان و مێشوولەکان..
پاشان بۆ ماوەیەك پێویستت بەوەیە کە چیدیکە..
تۆ پەناگا و کەنار نەبیت
یان درەختێکی ئەفسووناوی کە دڵنیایە لە پەلوپۆ هاوێشتنی
نەخێر.. مەرجە دواتر تۆ بەرگ و سیپاڵی «سلێمان»  پێغەمبەر بپۆشیت..
یان هەر زۆر بە سادەیی
ئاغای «ئیسحاق نیوتن» ئاسا لەسەر پێخەفەکەی خۆت دابنیشیت.
***





# تـــۆ.. مـەرجـە جاروبار بێیتە دەرێ

ئیلزابێت داریوش

جار و بار.. پێویستە و.. وەرە دەرێ
جێبێڵە ئەو شوێنەی کە دڵسۆزانت کڕنووش دەبەن..
کوچەو کۆڵانەکانی گومان... بەسەر بکەوە
ئەوە ببینە کە دۆڕاوەکان هەستی پێدەکەن..

گەرەکە هەندێکجار.. بەڕێ بکەویت..
دوورتر لەو ڕێگایانەی هاوڕێکانت دەیکوتنەوە..
برۆ تا ئەو شوێنانەی ڕیسواکراوان و خۆبەهیچ ـ زانەکان ڕۆیشتن..
تێپەڕە دوورتر لەوەی گلەیی و ستایشەکان بتگەنێ..

هەمدیس..تاو تاوە وا دەخوازێت فەرامۆشی بکەیت
( ئاە.. بەڵێ )ماڵی پراوپڕ لە هەتاوت..
گەرەکە بۆ تاوێك بە دڵێکی غەمینەوە ڕوونیشیت..
لە ژووری تاریکی گوناهبارێك.. هەتا..!

یان بۆ هەمیشە.. لەناکاو..
ئەوکاتەی بە خۆشنوودییەکی سادەوە شاگەشکەیت و فریو دەخۆیت..
وا چاوەڕێ دەکرێت ناچار بیت بە قووچاندن
ناخۆشەویست.. تاك و تەنیا.. زەندەقچوو..!





# ئاوێنە

سیلڤیا پلاس



من زیوین و ڕاست و دروستم. من هیچ وێنەیەکی پێشینم نیە.
هەر چییەکی کە دەیبینم.. دەستبەجێ قووتی دەدەم
هەر وەکو خۆی، بێ تەمومژی خۆشەویستی یان ڕق.
من دڵڕەق نیم، تەنها ئەوەیە ڕاستگۆم ــ
چاوی خوداوەندێکی بچکۆلەم.. چوارگۆشەیی.
زۆرینەی وەختم تێڕامانە لەو دیوارەی بەرامبەرم.
پەمەیی و .. پڕ لە خاڵ و پەڵەدارە. من زۆر دەمێکە تێیدەڕوانم
وا مەزەندە دەکەم کە پارچەیەکە لە دڵم... وەلێ ترپە ترپییەتی.
کەچی جار لەدوای جار تاریکی و ڕووخسارەکان لێکدیمان دەکەن.
*

من هەنووکە دەریاچەیەکم. ژنێك وا بەسەرمدا دەنوشتێتەوە..
لە قووڵایی مندا دەگەڕێت بۆ ئەو شتەی کە ڕێك خۆیەتی.
پاشان ڕوو دەکاتە درۆزنەکان، مۆمەکان یان ئەو مانگە.
من لە پشتەوەڕا دەیبینم.. بە ئەمەکەوە وەك خۆی پیشانی دەدەمەوە.
ئەو بە فرمێسکەکانی و پەشۆکان و لەرزەی دەستەکانی..
پاداشتم دەداتەوە.
من بۆ ئەو مایەی بایەخم. هەردەم دێت و دەڕوات.
هەموو سپێدەیەك..ئەوە ڕووخساری هەمان ژنە کە تاریکی ڕاو دەنێت و ..
جێگەکەی ئەم دەگرێتەوە.
ئەو لە مندا کچێکی جوانی خنکاند. وێجا.. لەناو مندا پیرەژنێك...
ڕوو بە ڕووی ئەم بێدار دەبێتەوە. ڕۆژ دوای ڕۆژ. وەك ماسییەکی سامناك!

پەراوێز:

١.فرانسز کنفۆرد: ( ١٨٨٦-١٩٦٠) کچەزای «چارلز دارون» بووە. حەوت کۆمەڵە شیعری بڵاو کردۆتەوە. ئەم خولیای بووە کە لەسەر ژیانی خێزانداری منداڵا و مناڵی بنووسێت. کارەساتی جەرگبڕی ئەو خانمە ئەوە بوو کە کوڕە گەورەکەی « جۆن» کە هەم شاعیر و هەم جەنگاوەر بووە و لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیدا لەبەرەی کۆمارییەکاندا بووە ئەو کاتەی جەنگی ناوخۆی ئیسپانیا دەستی پێکردووە و کوژراوە لە ساڵی (١٩٥٩) خەڵاتی شاژنی بۆ شیعر وەرگرتووە.

٢.ئێلزابێت داریوش: (١٨٨٧-١٩٧٧) کچی ڕۆبرت برچز — ی شاعیر بووە. لە ساڵی ١٩١١-ە بە دواوە دەیەها کۆمەڵە شیعری بڵاو کردۆتەوە. لە ١٩٢٦ شووی بە « عەلی ئەکبەر داریوش» کردووە و پێکەوە چوونەتە ئێران و پاشان لە ١٩٢٩ گەڕاونەتەوە بریتانیا. دوای مەرگی باوکی شیعرێکی زۆری نووسیوە. زۆرتر بە «تۆماس هاردی» شاعیر بەراورد دەکرێت. بە یەکێك لەو شاعیرە دەژمێردرێت کە پتر بایەخی بە برگە داوە تا کێش و سەروا. لەوەدا « ئۆدن» شاعیر لاسایی کردۆتەوە

٣. سیلڤیا پلاپ: (١٩٣٢-١٩٦٣) ئەم خانمە لە بۆستن لە دایك بووە. بێجگە لە ئەمریکا. لە ئینگلتەرەش خوێندوویەتی. لەتەك شاعیر « تێد هیوز»ی هاوسەری لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە کە لە ساڵی -١٩٥٦ -دا زەماوەندیان ساز کرد و بەرهەمەکەی دوو بێچوو بوو. حەزی بەوە بوو ببێتە مۆدێل بۆ خانمانی دیکە لە بواری شیعردا کە دەیزانی بە ژمارە کەمن. گەرچی حەزیشی لە پێشبڕکێ بوو لەگەڵا هاوتوخمی خۆیدا. لەوەدا خۆی بە تاقانە دەزانی و بە فیز و هەوا بوو. لە « سافۆ» ی یۆنان —ییەوە دەیژمارد تا دوا شاعیرە ناودارەکانی هاوچەرخی خۆی وەك هاوشانی هەموویان خۆی دەبینی. بەڵام شێوەی ژیانی پتر لە شیعرەکانی مایەی تێڕامان بوو.

سەرچاوە:

**Modern Women Poets**
**Edited by DERYN REES_JONES**
**First published 2005 by Bloodaxe Books Ltd,**
**Printed in Great Britain**
**159_Pages: 40, 46 & 158**

# نووسەرانی نوبڵ

* پێر لاگەرکڤیست
* یەڵمار سوێدەربێری




NOBEL

زنجیرەی: - نۆبێلیستەکان
{نوسەرانێك کە خەڵاتی نۆبێڵیان پێ بەخشراوە}
وڵات: سوید: پێڕ لاگەرکڤیست Pär Lagerkvist (١)
سەرجەمی بەرهەمەکانی، کۆمەڵە نۆڤێلی:"ئەفسانە شەیتانیەکان Onda sagor ١٩٢٤ "
وەرگێڕانی : دەزگای مەریوانی، بەهاری ١٩٨٥
بە سەرپەرشتی گۆران مەریوانی

# ئاسانسورەکەی چووە خوارێ بۆ دۆزەخ

ژمێریاری بانک یۆنسۆن دەرگای ڕازاوە و جوانی ئاسانسۆری هۆتێلەکەی کردەوە و بە دەستێکی پاڵێکی عاشقانەی بە کەمەری گیانلەبەرێکی باریک و نازدارەوە، کە بۆنی فەرو و بۆدرەی لێدەهات، بۆ ژوورەوە نا. لەسەر جێنشینە نەرموشلەکەی نێو ئاسانسۆرەکە چوونە باخەڵی یەکەوەو ئاسانسۆرەکە بەرەو خوارەوە چوو. خانمی وردیلە دەمی نیوەکراوەی بەشەڕاب تەڕکراوی درێژکرد و دایانە ماچکردن. ئەوان لەسەرەوە لە تراسەکە، لەژێر ئەستێراندا شێویان کردبوو، ئێستا بەڕێوە بوون بچنە دەرێ بۆ ڕابواردن.

– خۆشەویستەکەم، چەند دڵگیربوو لەو سەربانە، خانم چرپاندنی. چەند شاعیرانەیە لەوێدا لەگەڵ تۆدا دانیشتن، لەوە دەچێت بەرز لەناو ئەستێراندا بیت. ئەودەم مرۆڤ دەزانێت عەشق چییە. تۆ بەڕاست عاشیقی منی، وانییە؟

– ئینجا ژمێریار بە ماچێک وەڵامیدایەوە کە گەلێک زیاتری خایاند، ئاسانسۆر دەچووە خوارێ.
— چەند باش بوو تۆ هاتیت، وردیلەکەم، ئەو گوتی، دەنا ئۆقرەم لێدەبڕا — بەڵێ، بڕوات بێت هی ئەوە نییە لەگەڵیدا هەڵبکەیت. هەر لەگەڵ خەریکی خۆئامادەکردن بووم پرسی نیازی کوێم هەیە. دەچم بۆ هەر شوێنێک دڵم بیبات، وابزانم، وا گوتم. خۆ ئاخر مرۆڤ زیندانی نییە. ئینجا بۆی دانیشت و بەدرێژایی کات کە خەریکی خۆگۆڕین بووم ئەبڵەق لێی دەڕوانیم، ئیتر بێجیە ڕەنگباوەکەم لەبەرکرد، تۆ پێت وایێ لێمدێت، بەڕاستی باشترینیان کە لێم بێت کامەیە، دەرحاڵ، ڕەنگە مەیلە و سووری کاڵ؟– لەتۆ هەموو شتێک دێت، خۆشەویستەکەم، ژمێریار گوتی، لێ وەکو ئەم ئێوارەیە قەشەنگ هەرگیز نەمبینیووت. بەسوپاسگوزاریەوە فەرولەبەر خەندەیەکی



پێر لاگەرکڤیست

هەڵدایە سەرلێوان ، ماوەیەکی درێژتر ماچیانکرد، ئاسانسوریش دەچووە خوارێ. — ئیتر کە تەواوبوم و ئامادەبووم بڕۆم، ئەودەم دەستیگرتم و هێند فشاری لێکرد تا ئێساش ژاندەکات، دەنا وشەیەک چییە لەزاری نەهاتەدەر. هێند دڕندەیە، ناتوانیت بیری لێبکەیتەوە! ئاخ دەی، من گوتم. لە وشەیەک چییە حاڵی نابێت. — هێندە کەڵلەڕەقە، بێسنور، ئاخر ئیتر لەتەحەموول و توانای مرۆڤ دەردەچێت، — نەگبەتە وردیلەکەم، ژمێریار یۆنسۆن گوتی. — وەک ئەوەی بۆم نەبێت کەمێک بچمە دەرێ و خەمی خۆم بەبادەم. لێ، دەبینیت، ئەو کابرایە مەرگئاسا جیدیترین کەس لەسەر رووی زەمین بە بیری کەسێکدا بێت ئەوە. ئاخر هەرگیز نەیتوانیوە هیچ شتێک بە سروشت و سادەیی خۆی وەرگرێت. هەمیشە وادەزنێت کێشە کێشەی ژیان و مەرگە.

— بەدبەخت خۆت، دەبێت چەند ئازارت چەشتبێت- بەڵێ، بێئەندازە ئازارم چەشتووە. زۆر. هیچ کەس وەک من ئازاری نەچەشتووە. — خۆشەویستەکەم! یۆنسۆن گوتی و خانمی لە باخەڵنا، ئاسانسۆرەکەش دەچووە خوارێ. — بیربکەوە، خانم گوتی پاش ئەوەی ئاهێکی پاش یەکتر ڕاموسان و دەستبازی پێدا هاتەوە، چەند خۆشە لەوبانە لەگەڵ تۆدا دانیشتن و سەیری ئەستێران و خەون بینین — ئۆهـ من هەرگیز ئەوەم لە بیرناچێتەوە. دەبینیت، ئاخر شتی وا مەحاڵە کردنی لەگەڵ ئەو (ئارڤید)ـەدا، ئەو هەمیشە جیدیە، زەڕەیـەک شیعر چیە تیایا نییە، فڕی بەسەر شیعرەوە نییە و لەشیعریش تێناگات. — ئازیزەکەم، لەگەڵ کەسی وادا هەڵکردن مەحاڵە. — بەڵێ، ئینجا وانییە، لەگەڵیدا هەڵناکرێت. بەڵام، درێژەیدا بە وتەکانی و بە زەردەخەنەیەکەوە دەستی خستە ناودەستی، باشە بۆچی ئێمە لێرە دابنیشین و بیر لە شتی وابکەینەوە. خۆ ئێستا دەچینە دەرێ و ڕادەبوێرین! ئەرێ تۆ بەڕاست

منت خۆشدەوێت، وایە؟ - ئەگەر! ژمێریار وای گوت و خانمی کەمێ بە پشتدا خست تا هەناسەی سواربوو، ئاسانسۆڕیش دەچووە خوارێ. بەسەریدا چەمایەوە و دەستیکرد بەدەستبازی لەگەڵیدا، ئەو سوورهەڵگەڕا.- ئەمشەو پێکەوە عەشقبکەین ....... کە بەهیچجۆرێک لەوەوپێش نەکرابێت. تۆ ها.......؟ ئەو چرپاندی. خانم ئەوی ڕاکێشا بەرەو لای خۆی و چاوی لێکنا، ئاسانسۆڕەکەش دەچووە خوارێ.

ئاسانسۆرەکە تادەهات بەرەو خوارەوە دەچوو، هەر تەنیا بەرەو خوارەوە.

ئاخری یۆنسۆن هەستایە سەرپا، ڕوخساری سوورهەڵگەڕابوو.

-ئەرێ ئەم ئاسانسۆرە چیەتی! هاواریکرد. بۆ ڕاناوەستێت؟ ئێمە دەمێکە لێرە دانیشتووین و قسەدەکەین، وا نییە؟

- با، ئازیزەکەم، وایە دەمێکە دانیشتوین، کات وا زوو گوزەردەکات.

- باشە، لەڕێی خوادا، نابەجێیە، ئێمە ماوەیەکی زۆرە لێرە دانیشتووین! باشە مەبەست چییە!

ئەو لە شیشی ئاسانسۆرەکەوە ڕوانییە دەرێ. تەنیا وەک قەترانی ڕەش دەچــووەوە. ئەوجا ئاسانسۆرەکەش بێوچان دەچــووە خــوارێ و خوارێ، زۆر بە خێرایی، ڕاستەوڕێ قوڵترو قوڵتر دەچووە خوارێ.

-خوای گەورە، باشە مەبەست چییە! لەوەدەچێت بچینە خوارێ بۆ چاڵێکی بۆش. ئینجا زەمەنێکە خەریکی ئەمەین.

-دەگەڕان تا سەیری ئەو هەزار بەهەزارەی خوارەوە بکەن کە وەک قەترانی ڕەش دەچووەوە. ئەوان تەنیا ڕۆدەچوون و ڕۆدەچوون بەرەو ئەوێندەرێ.

- دۆزەخ لێیدات، یۆنسۆن گوتی.

- ئاخ ئازیزەکەم، خانم سکاڵایکرد و خۆی بە قۆڵیدا هەڵواسی، من تۆقم چووە. دەکرێت ستۆپی قەومان ڕابکێشیت.

یۆنسۆن پــڕی پیاکردو هەتا هێزی تێدا بوو ڕایکێشا. هیچ سوودێکی نەبوو. ئاسانسۆڕەکە تا دەهات پەلەی بوو بەرەو خوارەوە و خوارەوە بەرەو بێکۆتاییبوون.

- گەلێک وەحشەتناکە، خانم گوتــی، باشە چیبکەین!

- لەعنەت، باشە پیاو چیبکات، یۆنسۆن گوتی. ئەمە شێتێتیە.

خانمی وردیلە نائومێدبوو، لەپرمەی گریانیدا.

-نــا، نــا، ئازیزەکەم، وانابێت، دەبێت عەقڵی لەگەڵدا بەکاربێنین. ئاخر خۆ هیچمان لەگەڵیدا پێناکرێت. جا، دانیشە ئێستا. ئاوها، ئێستا ئارام هەردووکمان لێرە لەتەنیشت یەکەوە دادەنیشین، ئینجا با بزانین بە کوێ دەگات. ئاخر خۆ دەبێت لە کۆتاییدا لە شوێنێکدا ڕابوەستێت هەی لەعنەتم لێدا.

ئەوان دانیشتن و چاوەڕێیانکرد. — بیربکەوە، خانم گوتی، ئاوات لێبقەومێت. ئێمە کە بەتەما بووین بچینە دەرێ و خۆشی بگوزەرێنین. — ئا، لەعنەت لێیدات، گاڵتەبازارە، یۆنسۆن گوتی. تۆ بەڕاست عاشیقی منیت؟ - ئازیزە وردیلەکەم، یۆنسۆن گوتی و ئەوی لە ئامێزنا، ئاسانسۆڕیش هەر دەچووە خوارێ.

دواجار لەناکاودا ڕاستەوخۆ وەستا. دەورووپشت هێند ڕوناک بوو چاو بەر شەوارە دەکەوت. ئەوان لە دۆزەخدا بوون. شەیتان بە ئەدەبەوە شیشی ئانسانسۆرەکەی پاڵپێوەنا و دەرگا ئاوەڵەبوو.

–ئێوارەتان باش، ئەمەی گوت و خۆی تا زەمین لەحوزوردا نوشتایەوە. شەیتان شیک خۆی پۆشیبوو، رۆکێکی پارتی و کەرەواتێکی قەیتان، رۆکەکە بە باڵاترین بربڕەی پشتە توکنەکەیەوە هەڵواسرابوو، وەک ئەوەی کردبێتت بە بزمارێکی ژەنگاویەوە. یۆنسۆن و خانم بە لەرزەلەرزە هاتنە دەرێ. — بۆ خاتری خوا ئێمە ڕێمان کەوتۆتە کوێ! هەردوکیان هاواریانکرد و زەندەقیان چوبوو لەم دەعەجانە ترسناکەی بەردەمیان. شەیتان بە شەرمەوە کەمێک لەوبارەیەوە زانیاری پێدان. — لێ هێند ترسناک نییە وەک سەدای، بەپەلەپڕۆزێ ئەوەشی خستە بان زانیاریەکان، بەئومێدم میوانگەل تەواو خۆشی بگوزەرێنن. وابزانم تەنیا بۆ ئەم شەوە، وەک حاڵیکراوم؟– ئا، ئا! یۆنسۆن بەشەوقەوە هاواریکرد و ڕەزامەندی نیشاندا، بەڵێ، تەنیا بۆ ئەمشەوە. بیرمان نەکردۆتەوە بمێنینەوە، نەخێر نا! خانمی وردیلە بەترس و لەرزەوە توندوتۆڵ تەواو قۆڵی یۆنسۆنی گرتبوو. چراکە پرتەپرتی دەکردو ڕووناکیەکی سەوزی زەردباوی دەپەخشاند، بە ئاستەم شتێکت دەبینی، هەردووکیان وای بۆچوون کە چراکە ڕێک دوکەڵیدەکرد. دوای کەمێک چاویان ڕاهات، بینیان لەوە دەچوو لە مەیدانێکدا دەوروپشتی بە باڵەخانەی بڵند کە بەنێو تاریکی ئاسماندا ڕاستببوونەوە و داڵانەکانیان بە چرا ڕۆشن وێستابن. پەردەکان دادرابوونەوە بەڵام مرۆڤ دەیتوانی لە درز و شەقەکانیەوە ببینێت کە لە ناوەوە چراکان هەڵکرابوون. — ئەڵبەت وابزانم وایە میوانگەل عاشیقی یەکترن؟ شەیتان پرس و وەڵامێکی بۆ کرد. — ئا، لە سنوربەدەر، خانم وەڵامیدایەوە و نیگایەکیشی لە چاوە جوانەکانیەوە تێگرت. — دەی وابێت ئا لێرەوە، شەیتان گوتی و تکای لێکردن گەر ئەرک نەبێت کەرەمکەن و دوایبکەون. ئەوان چەند هەنگاوێکیان ناو کەوتنە نێو لاشەقامێکی تاریک و نوتەکی کەنار مەیدانەکە. لەبەردەم داڵانێکی پیس و گریساویدا کە چرایەکی شکاوی پێدا هەڵواسرابوو. — فەرمون، ئەمە خۆیەتی. ئەو دەرگای کردەوە و بێ ئەوەی کەس هەستی پێبکات دیارنەما.

میوانگەل وەژوورکەوتن. دەڵە شەیتانێکی نوێی، قەڵەوی دەمولەفز چەورکەر، سینگومەمک زل کە گەردیلە بۆدرەی پەمەیی لە دەوروپشتی سەروسمێلی نیشتبوو پێشوازی لێکردن. دەڵە شەیتان بە هەناسەی سوارەوە زەردەخەنەیەک گرتی، بە دوو چاوی دۆستانەوە کە بە جووتێک دەنکە گەنمەشامی دەچوون حاڵی بوونی تێگەیاندن، لە دەوروپشتی شاخەکەی نێوچەوانی چەپکە موو روا بوو، بە قردێلەی ئاوریشم بەستبوونی. — ئاها، ئەرێ ئەمە کاک یۆنسۆن و خانمی ژنێتی، دەڵە شەیتان گوتی، کەوا بێت ژووری ژمارە هەشتە. کێلونێکی گەورەشی دایە دەستیان. ئەوان بەسەر پێپلیکەی گریساوی تاریک و نوتەکدا سەرکەوتن. هەر شوێن پێپلیکەیەک هێند گریسی لێنیشتبوو مرۆڤی لەسەر هەڵدەخلیسکا، دوو نهۆم باڵابوو. یۆنسۆن ژمارە هەشتی دۆزیەوە و خۆیکرد بەژووردا. ژورێکی نیمچە گەورە، بۆن شێ و کەڕوو گرتوو. لەنێوەڕاستی ژوورەدا مێزێک بە سەرچەفێکی هەرزان بەهاوە، لەتەنیشت دیوارەکەوە چەرپایەک بەسەرچەفێکی ئوتوکراوەوە. بەلایانەوە خۆشبوو. جلکەکانی دەرەوەیان داکەند و ماوەیەکی زۆر یەکرتیان ڕاموسان.

کابرایەک لە دەرگایەکی ترەوە بەبێ ئەوەی کەس

ئاگای لێبێت خۆیکرد بە ژووردا، پێدەچوو گارسۆن بێت، کۆتی شێوە کەشخەو، کراسلێوانی سینگی هێند تەمیز تاپۆئاسا لەبەر نیمچە ڕوناکیەکەدا لە پاک و خاوێنیدا جوان دەدرەوشایەوە. بێدەنگ هەنگاوی دەنا، دەنگی ترپەی پێی نەدەهات و جولانەوەی زۆر میکانیکیانە بوو، وەک ئەوەی بـەدەم بێهۆشیەوە ڕەفتاربکات. سەروفەسالی قورس و گران، نیگای چاوی بەدەر لە گشت جۆرە تروکاندنێک تەنیا ڕێک و ڕەوان لەبەردەم خۆی دەڕوانی. وەک مردوو ڕەنگ و رووی پێوە نەمابوو، لاجانگی برینی فیشەکی پێوە بوو. ژوورەکـەی ڕێکوپێک کرد، سەرمێزی ئارایشتی خاوێنکرد، تەشتۆلکەیەکی شەو و سەتڵی پاشەڕۆیەکی دانا.

زۆر گوێیان بـەو نـەدا، بـەڵام کە خەریک بوو مــەرەخــەس بێت یۆنسۆن گـوتـی: – کەمێک شەرابیشمان گەرەکە، نیو قاپ (مەدێریا)مان بۆ بێنە! کابرا جوان نوشتایەوە و ونبوو.

یۆنسۆن کراسە قۆڵدرێژەکەی بەری داکەند. خانم کەمێک دوودڵ بوو. — ئەو ئێستا دێتەوە، خانم گوتی. — نا، لە شوێنی ئاوادا شەرم پێویست ناکات، تەنیا خۆت ڕووتکەوە، نەشمیلەکەم. بلوسەکەی داکەند، پانتۆڵەکەشی بە نازەوە داماڵی و لەسەر هەردوو ئەژنۆی ئەو دانیشت. خۆشبوو. بیرکەوە، خانم چرپاندی، پێکەوە ئالێرە دانیشین دوو بەدوو، تۆ و من، بەتەنیا، لە جێیەکی ئاوا سەرسامکەر و ڕۆمانسیدا. چەند شاعیرانەیە، هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە.......– دڵبەرە وردیلەکەم، ئەوی تریان گوتی، ماوەیەکی زۆر یەکتریان ڕاموسان.

کابرا جارێکی تر، بێدەنگ، خۆیکرد بە ژووردا. بەئارمەوە، بە شێوەیەکی میکانیکی، گڵاسەکانی دانا، شەرابی کردە نێویان. کەمێک ڕووناکی چرای سەرمێزەکە کەوتە سەر ڕوخساری. ئەو شتێکی تایبەتی وای پێوە دیار نەبوو جگە لە وەی وەک مردوان بێڕەنگ و ڕوو بوو هەروەها لاجانگی شوێن برینی فیشەکی پێوە بوو.

خانم بەدەم قیژەوە ڕاپەڕی:

– خوای گەورە! ئاڕڤید! ئەوە تۆی ئاڕڤید! ئەوە تۆی ئاڕڤید!

ئۆی خوای گەورە و میهرەبانی ئاسمان، ئەوە خۆ مردوە! بە فیشەک خۆی کوشتووە!

کابرا بێجوڵە وێستابوو، تەنیا بێ ئەوەی نیگای بجوڵێنێت لەبەردەم خۆی دەڕوانـی. ڕوخساری گوزارشی لە ئازار نەدەکرد، تەنیا ڕەقوتەق، تا بڵێی جیدی.

– ئاخر ئاڕڤید، ئەوە چیت کـردوە، ئەوە چیت کردوە! چۆن زاتت کرد! ئۆهـ خۆشەویستەکەم، بـڕوات بێت ئەگەر هەستم بکردبا شتێکی ئاوا ڕوودەدات لە ماڵەوە دەرنەدەچووم. بەڵام ئاخر تۆ هەرگیز باسی هیچشتێک بۆ من ناکەیت. هیچت نەدرکاندوە لەمبارەیەوە، تەنیا وشەیەک چییە! دەباشە ئاخر ئیتر من چۆن بزانم، کە تۆ هیچ نەڵێی! ئای خوای گەورە......!

خانم گشت گیانی دەلەرزی. کابرا وەک غەریبێک لێی دەڕوانی، نیگای سارد و خۆڵەمێشیی، هەموو شتێکی ئەمدیو ئەودیو دەسمی. ڕوخساری سپی زەردبـاوی دەدرەوشایەوە، خوێن لە برینەکەیوە سەرینەدەکرد، لە شوێن برینەکە تەنیا کوونێک بوو.

– ئـۆی چ وەحشەتناکە، وەحشەتناکە! خانم دەیقیژاند. من نامەوێت لێرە بمێنمەوە! هەر ئێستا دەبێت ئێرە بەجێبێڵین! هێندەم بەبەرەوە نەماوە!

– پڕی بە بلوسەکەی، شەبقە و فەروکەیدا کرد

و هەڵهاتە دەرێ، یۆنسۆن بەدوویدا. لەسەر پێپلیکانەکان هەڵخلیسکان، خانم دانیشت، بەڵغەم و تف و سووتوی سیگار پاشەڵیانی سواخدا. لە دامێندا لە خوارەوە دەڵە شەیتان ڕاوەستابوو، دۆستئاسا بە حاڵیبوونەوە بە خۆی و ڕیشیەوە دەگەشایەوە، شاخەکەی لە جێی حاڵی بوون دەلەقاند.

هەر دووکیان بەهاتنە دەرەوەیان بۆ سەر شەقامەکە کەمێک ئارامبوونەوە. خانم جلەکانی لەبەرکرد، تەوالێت و تەسریحەی چێکرد، ماکیاجی کرد. یۆنسۆن وەک ئەوەی بیپارێزی دەستی لەکەمەری ئاڵاندبوو، یۆنسۆن هێند پیاوی چاک بوو. ئەو فرمێسکانەی بەڕێوەبوون داکەون بە لێوی دەیسڕینەوە، هەردووکیان سەرکەوتن بەرەو مەیدانەکە.

سەرۆکی شەیتانەکان لەوناوەدا پیاسەیدەکرد، جارەکی تر ڕووبەڕی بوونەوە. — ئەها، هەر ئاوا زوو تەواوبوون، سەرۆک گوتی، هیوادارم بە ئارەزووی دڵی میونگەلان بوو بێت. — ئۆهـ ترسناک بوو، خانم گوتی. — نا وا مەڵێ، ناشێت وابێت، ئەگەر خانم بیبینابا زەمانی زوو چۆن بوو، ئەوسا جۆرێکی تر بوو. ئێستا دۆزەخ شتێکی وا نییە پیاو سکاڵا و گازندەی دەربار بکات. ئێمە چیمان لەدەست بێت تا مرۆڤ تێبینی هیچ نەکات درێخی ناکەین، بە پێچەوانەوە مرۆڤ ئێستا زۆر خۆشی لێ ڕادەگوزەرێت. — بەڵێ، کاک یۆنسۆن گوتی، دەبێت ئەوەش بگوترێت کە کەمێک مرۆڤانەتر بووە، بەهەرحال، بەڕاستی وایە. — ئۆهـ، شەیتان گوتی، ئێرەمان مۆدێرنکردۆتەوە، سەرلەبەری چێکراوە، کە بۆخۆی کارێکی سروشتیە. — بەڵێ، بێگومان دەبێت دوای پێشکەوتنی گشتی بکەوین. — بەڵێ،

ئێستاکونێ تەنیا هەر عەزابی ڕۆحە و هیچی تر.
— لەوەدا شوکرانەبێژی خوداین، خانم گوتی.
شەیتان بە ئەدەبەوە بردنی بەرەو ئاسانسۆرەکە. ئێوارەتان شاد، ئەوەی گوت و جوان نوشتایەوە، بەخێربێنەوە. دەرکی ئاسانۆرەکەی لەسەریان پێوەدا، ئاسانسۆر ڕووەو حەوا چوو.
– ئۆخەی، چەند خۆشە کۆتاییهات، هەردووکیان بەجووتە گوتیان و لەسەر جێنشینی نێو ئاسانسۆرەکە لەباخەڵی یەکتر خزان. — بێ تۆ هەرگیز نەمدەتوانی بەو هەموو کارەساتەدا گوزەربکەم، خانم چرپاندی. ئەویش خانمی بەرەو نێو باخەڵی خۆی ڕاکێشا، ماوەیەکی زۆر یەکتریان ماچکرد. — تۆ بیرکەرەوە، خانم گوتی دوای ئەوەی ئاهێکی پاش یەکتر ڕاموسان و دەستبازی پێدا هاتەوە، کە زاتیکرد شتێکی ئاوها بکات! بەڵام ئەو هەمیشە بیر و بۆچوونی سەیر و سەمەرەی هەبووە. قەت نەیتوانیوە هیچ شتێک بە سروشت و سادەیی خۆی چۆنە وەرگرێت. هەمیشە وادەزنێت کێشە کێشەی ژیان و مەرگە.
– گەمژەییە، یۆنسۆن گوتی. — ئاخر ئەو دەیتوانی قسەبکات! ئەوسا ئیتر دەمامەوە. خۆ دەمانتوانی لە جیاتی ئێوارەیەکی تر بچینە دەرێ. — بەڵێ حەتمەن، یۆنسۆن گوتی، بێگومان دەمانتوانی هەر وابکەین.
– بەڵام، خۆشەویستەکەم، باشە ئێمە لەپای چی لێرە دانیشین و بیر لەشتی ئاوها بکەینەوە، خانم چرپاندی و قۆڵی لەمل و گەردنیەوە ئاڵاند، خۆ ئیتر هەموو شتێک کۆتاییهات.
– بەڵێ، نەشمیلەکەم، ئیتر هەموو شتێک تەواو بوو تازە. ئەو خانمی لەباوەش نا، ئاسانۆرەکە بەرەو سەرێ خۆی کوتا.

سـويـد: پـــێڕ لاگەرکـــڤیـست Pär Lagerkvist (١)

بیۆگرافی:- پێر فابیان لاگەرکڤیست، لە دایکبووی ٢٣ مای ١٩٨١ لە شاری ڤێکشوێVäxjö ،

کۆچی دوایـی ١١ جـولای ١٩٧٤ لە لیندینگئوێ Lindingö.

نوسەر، شاعیر، دراماتیکار و ئەندامی ئاکادیمیای سـویـدی. لـە بنەماڵەیەکی دیـنـدار، پیێتیستی* خوشکوبرا زۆر هاتۆتە دنیاوە،

لە شاری ئۆپسالا ١٩١١-١٩١٢ خوێندنی باڵای خوێندوە،

ساڵانێکی زۆر لـەدەرەوەوی وڵات ١٩١٠-١٩٢٠ وەک فرەگەلێکی نوسەر و هونەرمەندانی سویدی و نەرویژی ژیاوە، دانیمارک، فەڕەنسا و ئیتالیا. بە منداڵی دیندار و دوایی داروینیزم، سۆسیالیزم، لەوانە ڕۆمانی، ١٩٢٥، "میوان لای واقیع"، و کۆمەڵە نۆڤێلی، ١٩٢٤ "ئەفسانە شەیتانیەکان" کە نۆڤێلی "من و باوکم" یەکێکە لەوانەی زیاتر ڕەنگی بیۆگرافی گرتووە. پێدەچێت لاگەرکڤیست بە س. گ. یـۆنـگC.G.Jung ی زانستمەندی سایکۆلۆژ ئاشنا بووبێت، بەرهەمەکانی ڕەنگی ژینگەی بنەماڵەیانی بە گەورەییش پێوەدیارە، میتۆلۆگی و ئەفسانەکانی بایبڵ بەشێکی گەورەی ئەون. پرسەکانی وجود، پرسەکانی جیهانێک کە تێیدا خوداوەند زۆردار نییە، بە کۆمەڵ پرسە مۆڕاڵیەکان کاتێک خۆمان رووبـەڕوی خۆمان دەبینەوە، دوور لە خـوداوەنـد، سەرئێشەی لاگەرکڤیستن، تەنانەت نوسەرێکی هاودەمی وەک ئولف-بێنUlf-Bengt لە شوێنێکدا ناوی دەبات بە، "کریستیانێک بەدەر لە ئیرادەی خۆی"، لاگەرکڤیست یەکەم سویدیشە کە بە پیکاسۆ ئاشنابووە و خەریکی ڕەخنەی هونەری شێوەکاری بووە، بەرهەمەکانی، کەم یان زۆر ڕەنگی، شاعیری، سیاسی، فەلسەفی، سۆسیالیستی پێوە دیارن، هونەری وشەسازی، وێناکێشانی هونەری گرینگ بوون لای. ڕۆمانی "پادشا ١٩٣٢" ڕەنگی مارکسیزمی پێوەدیارە،

١٩٤٠ هەڵبژێراوە بۆ ئەندامی ئاکادیمیای سویدی، ١٩٤١دکـتـۆرای شـەرەفـی لـە زانـکـۆی یۆتۆبۆری وەرگرتووە، ١٩٥١ خەڵاتی نۆبێڵی پێبەخشراوە، یەکەم رۆمانی، کەدوایی پەشیمان بۆتەوە لێی، لە ١٩١٥ پەخشکردوە. کێشە فەلسەفیەکانی لاگەرکڤیست زیاتر وجودین، پێشڕەوی ئەم فەلسەفەیەش بووە لێرە، خەمی دونیایەکی سیکولار بەدەر لە خوداوەند، یان خەمی بڕوایەک بە خوداوەندێک کە ئیتر حوزوری نییە، نیگەرانی و خەمێکی قوڵی لەکن ئەو بەجێهێشتووە، شیعری، ١٩١٦،: "خەم خەم ئەی میراتی من" بە شاکارێکی ئەو دەژمێردرێت. زۆر نین ئەوانەی لە سوید وەک ئەم نەیاری سەرسەختی نازیزم بووبێتن، ڕۆمانی بەراباس و سیبیلا، کە بەشێکی فەلسەفەی ئێکسیستیانلیزمی، جودی، ئەو پێکدێنن لە دووتۆی ئەم بەرهەمانەدان. ڕۆمانی جەلاد ١٩٣٣ لەلایەن نازیەکانەوە دەسووتێنرێت و لە "Der Sturmer" ئەو بە "Judenknecht" سەپانی جولەکە نێودەبەن. لەسەردەمی ئەمڕۆماندا و دوای چەندەها ساڵ، دەکرێت بیروباوەڕی لاگەرکڤیست لای فەیلەسوفێکی وەک René Girards لە کتێبی La Violence et le sacré، ١٩٧٢، "توندوتیژی و موقەدەسات" ببینینەوە. ١٩٣٢ گیستاپۆ لاگەرکڤیست دەخاتە ناولیستی کوشتنی ئەوانەوە. دووجار هاوسەرگیرکردوە، یەکەم ١٩١٦لـەگـەڵ دانیمارکی کارێن سورێنسۆن، ئێلین-ی کچی١٩١٨-٢٠٠٩ لەوە، دووەم لەتەک ئێلین ناسراوبە ئێلیانور هاڵبێری، هەردوو کوڕی بێنگت و ئەلف لەون. وەرگێڕ

* Pietism پیێتیسم:- بزوتنەوەیەکی پڕوتستانتیە لە کۆتایی چەرخی ١٦ وسەرەتای١٧ دا سەریهەڵداوە. وەرگێڕ

نوسەر: یەڵمار سوێدەربێری Hjalmar Söderberg(١)
وڵات: سوید: ٢ جەڵای ١٨٦٩-١٤ئۆکتۆبەری١٩٤١
سەرچاوە: سەرجەمی بەرهەمەکانی نوسەر،
وەرگێڕانی: - دەزگای مەریوانی
بەسەرپەرشتی گۆران مەریوانی، ساڵی وەرگێڕان ١٩٨٤

# فــــــــــەرو

ئەو ساڵە زستانێکی توش و سەخت بوو. خەڵکی لەبەر سەرماوسۆڵە خزابوونە باوەشی یەکترەوەو بچکۆلە ببوونەوە، جگە لەوانەی کە فەروویان هەبوو.
قازی گوندان، ریکارد، فەرویەکی چاکی گەورەی هەبوو. کە زیاتر دەشێت پەیوەندی بە کارو فرمانیەوە هەبوو بێت، چونکە ئەو کرابووە بەرێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیەکی تازە و نفت و نوێ. بەڵام هاوڕێ دێرینەکەی دکتۆر هێنک بەپێچەوانەوە هیچ فەرویەکی شک نەدەبرد: لەجێی فەرو ژنێکی قەشەنگ و سێ منداڵی هەبوو. دکتۆر هێنک لاغرو ڕەنگ پەڕیو بوو. هەندێک مەردوم هەن ژنهێنانیان پێدەکەوێت و گۆشتی پێدەگرن، هەندێکیش لاغر. دکتۆر هێنک لە لاغر بووان بوو؛ تا ڕۆژێک ئێوارە جەژنی کریسمس هات.
- ئەمساڵ بۆ من نەهاتبوو، دکتۆر هێنک بە خۆیی گوت، سەعاتی سێی پاش نیوەڕۆی ئەو کریسمسە، ڕێک دەمی عەسرێک کە خۆر خەریکە دەنیشێت، بەڕێوە بوو بۆ ماڵی دۆستە دێرینەکەی، جۆن ریکارد، بەو نیازەی بڕێک پارەی لێ قەرزبکات. ساڵێکی زۆر نەهات بوو بۆم. تەندروستیشم تەواو نییە، ئەگەر نەڵێم تێکچووە. بەڵام نزیکەی سەرلەبەری نەخۆشەکانم بە پێچەوانەوەی خۆمەوە چاکبوونەتەوە؛ ئێستا زۆر دەگمەنە بەنیازی چارەسەر سەریان لێدەم. وابزانم بەمزووانە دەمرم. ژنەکەشم وای بۆ دەچێت، لە ڕوخساریدا دەیبینم. ئەگەر وابێت تەمەننا دەکەم، پێش ئەوەی مانگی ژەنیوەری بگاتە کۆتا بە لادابێم، ئەودەم پێشەکی بیمەی ژیانی لەعنەتیەم دەدرێت.
- کاتێک پەتی بیرکردنەوەی گەیاندبوویە ئەم خاڵەی ئێرە، گەیشتبووە سەر گۆشەی شەقامی رگێرینگس -گاتان و هامن-گاتان. ئەوجا لەوێدا کە شەقامەکان ڕاستوچەپ یەکتر دەبڕن دەبوو ئەم بپەڕێتەوە و ملی ڕێگای بەروخوار بگرتبا بەرەو رگێرینگس-گاتان ڕێک لەسەر شوێن تەختە خلیسکەی درۆشکەیەکی بەفر کە تەواو بەفرەکەی ڕاماڵیبوو، جێگەکەی ساف و لوس ببوو، قاچی هەڵخلیسکاو بەسەردا کەوت، ڕاستەخۆ لەو دەمەدا گالیسکەیکی ئەسپ زۆر بە خێرایی هات. کابرای عەرەبانچی چی بەدەمدا هات گوتی و ئەسپەکەش هەر خۆڕسکی غاریدایە کەنار، هاوکات لەو سەروبەندەدا و کەمێک لای گالیسکە خۆی لە شانێکی دکتۆر هێنک داو ئینجا، بورغویەک، بزمارێک، شتێکی ئالەوجۆرە بەر پاڵتۆکەی کەوت و قەڵبەیەکی گەورەی تێکرد. مەردوم لەدەروپشتی کۆببوونەوە. چاوەشێکی پۆلیس یارمتیدا تا بکەێتەوە سەرپا، کیژێکی نەوجەوان بەفری لێتەکاند، خانمێکی بەتەمەنیش بە دەست و قامکی ئیشارەتی دەکرد وەک ئەوەی بخوازێ بڵێت، ئەگەر بۆی بکرابا هەر لەوێدا، دەمودەست شوێن قەڵبەکەی بۆ پینەدەکرد، یەکێک لەمیرانی کۆشکی پاشا کە بەڕیکەوت بەوێندەرێدا گوزەری دەکرد، کلێتەکەی سەری داگرت و لەسەری ئەمی نا، ئیتر هەموو شتێک وەکو پێشوی خۆی



یەڵمار سوێدەربێری

لێهاتەوە تەنیا پاڵتۆکەی نەبێت.
- لەعنەت لە شەیتان! تەماشاکە، چیت لێهاتووە، قازی گوندان، ڕیکارد ئەمەی گوت، کاتێک هێنک گەیشتەلای و خۆیکرد بە ژووری ئۆفیسەکەیدا.
- بووم بەژێر گالیسکەوە، هێنک گوتی.
- پڕ بە پێستی خۆیەتی، ڕیکارد وای گوت و پڕ بەدڵ پێکەنی.
بەڵام خۆ ناکرێت ئاوا بچیتەوە ماڵێ. دەتوانی فەروەکەی من قەرزبکەیت، من خۆم شاگردێک دەنێرم بۆ ماڵەوە تا پاڵتۆیەکم بۆ بێنێت.
-سوپاستدەکەم، دکتۆر هێنک گوتی.
دوای ئەوەی ئەو سەد کرۆنەی پێویستی بوو قەرزیکرد، درێژەی بە قسەکانیدا و گوتی:
بەخێربێن ئەوجا بۆ قاوڵتی.
ڕیکارد ڕەبەن بوو، عادەتەن ئێوارەی کریسمسی لای هێنک بەسەر دەبرد.
لە مێژ بوو هێنک کە بەرەو ماڵ بۆوە هێندە بەکەیف نەبوو.
- ئەوە لەبەرخاتری فەروکەیە، بە خۆیی گوت. ئەگەر عاقڵ بوومایە لەمێژ بوو سۆراخی فەروەیەکم بە قەرز بۆ خۆم دەکرد. فەروەیەک بڕوای بەخۆم قایمتر دەکرد و لەبەرچاوی خەڵکیش ڕێزی بەرز دەکردمەوە. ئاخر خۆ ناکرێت پوولێکی هێندە کەم بدەیتە هەقی دکتۆرێکی فەرولەبەر وەک لە دکتۆرێک کە پاڵتۆیەکی ئاسایی لەبەردایە و شوێن کونە قۆپچەکانیشی پووکاونەتەوە. گەلێک ناخۆشە، ئەدی پێشتر بۆ بیرم بۆ ئەوە نەچووە. تازەش درەنگە.
بۆ تاوێک خۆیکرد بە باخچەی پاشادا، کۆنئونگس-ترێدگۆرد، دەمێک بوو تاریک داهاتبوو، سەرلەنوێ بەفر دەستیکردەوە بە بارین، ئەو ئاشنایانەی لوتیان بوو بە لوتیەوە نەیان دەناسیەوە.
- کێ دەزانێت ئاخر تا بڵێت تازە درەنگە؟ هێنک لەگەڵ خۆیدا بەردەوام بوو. خۆ من هێشتا پیر نیم، و ڕەنگە هەڵەبم لەبارەی تەندروستیمەوە. من هەژارم وەک ڕێویەکی لەپلەی دارستان؛ بەڵام خۆ زۆر لە مێژ نییە جۆن ڕیکاردیش حاڵی وا بوو. ژنەکەم بەم دوا بە دواییە ساردوسڕو نامیهرەبانانە ڕەفتارم لە گەڵدا دەکات. دڵنیام سەرلەنوێ عاشقم دەبێتەوە، ئەگەر بێت و بتوانم پارەی زیاتر پەیدابکەم و خۆم بە فەرو بپۆشم. وا تێدەگەم زیاتر حەزی لە (جۆن)ـە بە بەراورد لەوەو پێش، دوای ئەوەی فەرویەکی کڕی. دروستە ئەودەمەش کە کچ بوو زەڕەیەک دڵی بەوەوە بوو؛ بەڵام هەرگیز قایل نەبوو زەماوەندی لەگەڵدا بکات، ئەو بە پێچەوانەوە بەو و بە گشت مرۆڤێکی تری دەگوت، کە هەرگیز جورئەت ناکات ژن بێنێت گەر بێت و کەمتر لە دە هەزاری لە ساڵێکدا دەستبکەوێت. ئێ خۆ من وێرام، و ئێلێنیش کچە هەژارێک بوو لێ حەزی دەکرد شووبکات. بڕواناکەم بەو شێوەیە منی خۆشویستبێت،

کە بتوانم، ئەگەر بمویستبایا، دڵی فریوبدەم. بەڵام خۆ منیش ئەوەم نەدەویست؛ ئاخر من چۆن چۆنی بتوانم خەون بە عەشقێکی واوە ببینم؟ لە دوای شازدە ساڵیمەوە کە بۆ یەکەمجار فاوستم بە ئۆپێرا بینی کە ئارنۆڵدسۆن تیابوو، شتی وام نەبینیووە. لێ من بەهەمان شێوە دڵنیام لەوەی ئەو دڵی بەمنەوە بوو یەکەمجار کە بەیەک شادبووین؛ پیاو بە هەڵەدا ناچێت لە پرسی وادا. داخۆ ناکرێت جارەکی تر تێهەڵچێتەوە؟ ماوەی یەکەم دوای ئەوەی بەیەکتر شادبووین هەمیشە، توانج و پلاری ڕەقی دەگرتە جۆن هەردەم ئەوی ببینابا، جار بوێری نەدەکرد. ئینجا جۆن هەستا کۆمپانیەکی دانا، ئێمەی هەندێکجار بانگهێشت دەکرد بۆ تیاترو فەرویەکی بۆخۆی پەیداکرد. دەی جا ژنەکەشم ئیتر کەم کەم لەگەڵ گوزەرانی وەختدا تاقەتیچوو لەوەی بەردەوام دایشۆرێت و قسەی ڕەقی پێ بڵێت.

هێنک کەمێ کاری هەبوو، دەبایە پێشی قاوڵتی کریسمس ڕاپەڕاندایە. سەعات خۆی دابوو لەدەورووپشتی پێنجو نیو، کە گەڕایەوە ماڵێ بارێک پاکەتی پێبوو. دەفەی شانی چەپی گەلێک ئێشی دەکرد؛ دەنا هیچ شتێکی وا لە گۆڕێدا نەبوو ئەو بەدبەختیەی پێش نیوەڕۆ تووشی ببوو وەبیری بهێنێتەوە، بێجگە لە فەروەکە.

– خۆشدەبێت ببینم بزانم خانمی ژنم چی لە سەروسیمای دێت، کە دەمبینێت فەروپۆشم، دکتۆر هێنک بە خۆیی گوت.

دالانەکە هێجگار تاریک بوو؛ چرای دالان قەت ڕۆشن نەدەکرا تەنیا لە پێشوازیکرنی میوانانددا نەبێت.

گوێم لێیە ئێستا لە ساڵۆنەکەیە دکتۆر هێنک بیریکردەوە. خانم سووک وەک باڵندەیەکی گچکە ڕێدەکات. ئەوە خۆیەتی، تا ئێستا کە لە ژوورێکی ترەوە گوێم لەدەنگی ترپەی پێی دەبێت دڵم گەرم دادەگیرسێت.

مەزەندەکەی دکتۆر هێنک دروست دەرچوو، بەوەی خانمی ژنی پێشوازیەکی خۆشتری لێبکات، ئێستا کە فەرووی کردۆتە بەری، وەک لە جاری جاران. خانم بەدزیەوە خۆی کشان بۆ لای تا جوان لە تاریکترین گۆشەی دالانەکدا جووت بوو لەگەڵیدا، هەردوو قۆڵی ئالاندە ملوگەردنی و ماچێکی گەرم و پڕ موحیبەتی کرد. ئینجا سەرو پەرچەمی لە ملوانی نەرموشلی فەروەکە گێڕاو سووک بە چرپە درکاندی:

–گوستاڤ هێشتا نەگەڕاوەتەوە ماڵ.

–بـا، دکتـۆر هێنک بـە دەنگێکی زیـاتـر پچڕ پچڕ وەڵامیدایەوە، هاوکاتیش بە هەردوو دەستی یاری بە قژی دەکرد، با، ئەو هاتۆتەوە ماڵ.

لە ئاگردانی ژووری کارەکەی دکتۆر هێنکدا ئاگرێکی گـەورە دەسـووتـا. لەسەر مێزەکەی ویسکی و ئاو دانرابوو. قازی گوندان، ڕیکارد، لە سەر قەنەفەیەکی چەرم پاڵی لێدابۆوەو سیگاری دەکێشا. دکتۆر هێنک لە گۆشەیەکی قەنەفەکەی خۆیدا هەڵتروکابوو. دەرگاش بەرەو ساڵۆنەکە لەسەر گازی پشت بوو، لەوێ خانم هێنک و منداڵانیان سەرقاڵی بە چرا ڕازاندنەوەی سنۆبەری کریسمس بوون.

– قاوڵتی بێدەنگ خورابوو. تەنیا منداڵەکان دەنگە دەنگ و هەراو هوریایان بوو. دڵخۆشبوون.

– ئەرێ تۆ هیچ نالێیت، کوڕی باش، ڕیکارد گوتی. ڕەنگە دانیشتبیت و لە فیکری پاڵتۆ دڕاوەکەتدا بیت؟

– نەخێر، هێنک هاتە وەڵام، بە پێچەوانەوە لە دالغەی فەروەکەدام.

دوای قەیرێک بێدەنگی شکاند و درێژەی بە قسەکانیدا:

– بیر لە شتێکی تر دەکـەمـەوە. دانیشتووم و بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەمە دوا کریسمسە بە یەکەوە بەسەری دەبەین. من دکتۆرم، دەزانم چەند ڕۆژێکی زۆرم لەتەمەنم نەماوە. لە تەواوی عەقڵمەوە دەزانم. جا دەمەوێت سوپاسی گشت میهرەبانیەکت بکەم کە بەو ئاخریە نیشانی خۆم و ژنەکەمت داوە.

– ئۆهـ، تۆ بەهەڵە تێگەیشتوویت، ڕیکارد لەبەر خۆیەوە ئەوەی گوت و دوور ڕوانی.

- نەخێر، هێنک وەڵامیدایەوە، نا بەهیچ جۆرێک بە هەڵە حاڵی نەبووم. دەمویێت سوپاست بکەم بۆ فەروەکەی بە قەرزت داتمێ، ئەو چەند دوا چرکە شادیە کە لە ژیانمدا هەستم پێکردبێت ئەو پێی بەخشیم.

(١). یەڵمار سوێدەربێری Hjalmar Söderberg:
-لە دایکبووی ستۆکهۆڵم، ٢ جولای ١٨٦٩.
کۆچی دوایی لە شۆپنهامن ١٤ ئۆکتۆبەری١٩٤١.
بابی فرێدریک سوێدەربێری،١٨٣٣-١٩٠٠ستۆکهۆڵم، ژمێریاری ژووری بازرگانی بووە،
دایکی ئێمیلیا ١٨٣٢-١٨٩٢ هەر لە ستۆکهۆڵم، ساڵی هاوسەرگیریان ١٨٦٥.
سوێدەربێری کورپیان لە ١٨٨٨-١٨٩٦ فەرمانبەری ئەنجومەنی گومرگی گشتی بووە.
لە دیسەمبەری١٨٩١تا ئاپریلی١٨٩٢ بۆتە ڕۆژنامەوانی کولتوری، فەرهنگی، دوای ئێمیل کلێێن لە ڕۆژنامەی کریستینا ستادس بلادت Kristinastadsbladet . بە گەڕاندنەوی بۆ ستۆکهۆڵم دەستدەکات بە نوسین لەبواری ڕەخنەگریدا لە ڕۆژنامەیDN و Ord&Bild دوایی١٨٩٧ بانگهێشتکراوە بۆ دەستەی Verner Von Heidenstam، {دەستەیەک دۆستانی ڕۆشنبیرانی ئەو دەمە بوون بە ڕابەری هایدنستامی شاعیر}، ئیتر دەست بەکاربووە لە ڕۆژنامەیSVD و گۆشەیەکی هەبووە تا ١٩٠٨. وەک زۆربەی هونەرمەندانی مێژووی سوید ١٩٠٦وڵات بەجێدێڵێت و دەچێتە شوپێنهامن/دانیمارک، بەڵام ١٩١٩ بە هێجگاری ئەوێ دەکاتە نشینگەی خۆی.
جگە لە ڕۆژنامەوانی، ڕەخنەگری، ڕۆمان، شانۆنامە و نۆڤێل نوسین، توێژینەوە لە بواری تیولۆگیدا، لاهوت، کە دواساڵەکانی ژیانیدا سەرقاڵی بووە، وەرگێڕانێکی زۆریشی هەیە، لەوانە، هێنریش هاینێ، ئاناتۆلێ فەڕانسێ، پێترا نانسێن، ج،د. موپاسان، ژ.پ. یاکبسۆن.......تاد. کە یەکەم ڕۆمانی Förvillelser، گومڕایی، بڵاودەبێتەوە،١٨٩٥، دەمێک بوو وەک ڕۆژنامەوانی بواری کولتور ناسراو بوو، ئەم ڕۆمانە سەدایەکی خراپ لە ناو ڕۆشنبیران و خەڵکی ئەو دەمەدا دەداتەوە بەوەی لە سنوری مۆڕاڵی باوی تێپەڕاندوە و هەرزەکاران گومڕادەکات، سوێدەربێری ناوزڕدەکەن بە: "نەوجەوان فرویدەر". خەسڵەتی نووسینەکانی سوێدەربێری، تەنیایی و نامۆیی مرۆڤە لە دونیایەکدا کە مۆڕاڵ پساوە و بۆتە جۆرێک لە پوول و پارە، پایە و مەقام زۆرداری.. تاد. یانی ئەو ژیانی سەردەم وەک خۆی، بێ ترس، هەڵدەبژێرێت و کونج و کەلەبەرە شاراوەکانی دەپشکنێت کاتێک کۆمەڵگای ئەودەم ژانی گۆڕانکاری دەیگرێت، وەرگەڕانی چەرخی هەژدەو بەرەو نۆزدە. ئەورۆ دەبێت سوپاسگوزاری ئەو بین کە دەزانین کۆمەڵگا ئەودەم چۆن بووە.
ڕۆمانی دکتۆر گڵاس یەکێکە لە هەرە شاکارە نایابەکانی ئەو. لێرەدا کێشەی کوشتن دەخاتە سەر خوانی وتووێژ: داخۆ مرۆڤ مافی ئەوەی پێ ڕەوا دەبینرێت گیانی مرۆڤێکی تر هەڵوەرنێت، لە هەچ جێ وشوێنێکدا بێت بەهەر پاساوێک بێت. ئێستا و دوای مردنی، بەداخەوە وەک لای خۆمان هەستکردن بە هەژاری لێ قەدری بیر تیژی سوێدەربێری دەزانرێت. نووسینەکانی بۆ ٢٠ زمانی زیندوی دونیا وەرگێڕدراوە، فرگەلێکیان کراونەتە فیلم، تیاتر. لێکۆڵینەوە تا ئێستا لەسەر ئەو درێژەی هەیە. خێزان و منداڵانی دانیمارکین و هەر لەوێندەرێش بە خاک سپێردراوە. سوێدەربێری یەکێکە لە نەیارە سەرسەختەکانی بیری نازیزم و نازیەکان کتێبەکانی یاساخدەکەن و لە ئاهەنگی کتێب سووتانی نازیەکاندا bokball سوێدەربێریش بەردەکەوێت. دەشێ مردنی بێوادەی لەدەستی ئەوان ڕزگاری کردبێت کاتێک نازیەکان دانمارک داگیردەکەن. وەرگێڕ

# وێستگەکانی سەردەم

* نەوال سەعداوی          و. لە عەرەبییەوە: دیاکۆ
* خەڵاتی ئەسترید لینگرێن...          و. لە سویدییەوە: ڕێنوار
* لە ئەفغانستان ئافرەت لەسەر...          و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان
* یاسایەک ڕێگا بە کوشتن دەدا          و. لە عەرەبییەوە: سەردەم

# سوید خەڵاتی "ستیگ داگرمان" بۆ ساڵی ٢٠١٢ دەدات بە نەوال سەعداوی

و. لە عەرەبییەوە: دیاکۆ

سوید خەڵاتی ستیگ داگرمان-ی ئەدەبی بۆ ساڵی ٢٠١٢ بەخشییە نوسەر و چالاکوانی میسری ناسراو نەوال سەعداوی، ئەمە وەک ڕێزلێنانێک بۆ بەشداریکردنی لە شۆڕشی میسریدا و لابردنی حوسنی موبارەک، هەروەها وەک ڕێزلێنانێک بۆ بەرهەمەکانی و کار و چالاکییەکانی لەپێناو بەرگریکردن لە مافەکانی ئافرەتانی میسر و وڵاتانی عەرەبی.

ئەم خەڵاتە بەشێوەیەکی گشتی، دەدرێت بەو نوسەر و چالاکوانە دیارانەی لە بوارەکانی ئەدەب و ئاشتی جیهانیدا کاردەکەن، ئەمەش وەک ڕێزلێنان و پێزانینێک بۆ ئەو بەها مرۆییانەی لە بەرهەمەکانیان و داهێنانەکانیاندا هەیە. خەڵاتەکە ناوی "ستیگ داگرمان"ی لەخۆگرتووە کە نوسەرێکی سویدی بەناوبانگە و لە تەمەنی ٣١ ساڵیدا خۆی کوشتووە، بەڵام داهێنانە فیکری و ئەدەبییەکەی تا ئێستاش لە سوید



نەوال سەعداوی

و تەواوی ئەوروپادا بڵاودەبێتەوە.

ئەم خەڵاتە لە ئاهەنگێکی تایبەت و لە زێدی "ستیگ داگرمان"ی ئەدیب، دەدرێت بە نەوال سەعداوی، ئەمەش لە چوارچێوەی ئەو سەردانەی نەوال سەعداوی-دایە کە لە ئێستادا لە وڵاتی سویدە و چەندین کۆڕ و سیمینار بۆ ڕەوەندی عەرەب ئەنجامدەدا. هەروەها بۆ بەیەکگەیشتنیەتی لەگەڵ دەزگا سویدییەکان و ئەو ڕۆشنبیر و بیرمەندانەی لەو دەزگایانەدا کار دەکەن.

"ئەرنا ڕۆت" سەرۆکی لیژنەی خەڵاتی ستیگ داگرمان بە ڕادیۆی سویدی ڕاگەیاند: (لیژنەکەمان نەوال سەعداوی هەڵبژارد، وەک ڕێزلێنانێک بۆ ئەو بەشداریکردنە مەیدانییەی لە شۆڕشی میسریدا پێیهەستا کە حوسنی موبارک-ی ڕوخاند و نەوال کە تەمەنی ٨١ ساڵە و هەرچەندە بارودۆخی تەندروستیشی باش نیە، کەچی بووتە سمبولی شۆڕشەکە. هەروەها وەک ڕێزلێنانێک بۆ ئەو بەردەوامی و کۆمەکەی لەگەڵ مەلاین شۆڕشگێڕی میسری، لە شەقامەکانی میسردا هەیەتی).

ڕادیـۆ سویدییەکە لـەسـەر زاری نـەوال سەعداوییەوە دەڵـێ: ئافرەتانی میسر، دوای شۆڕش، گەورەترین زەرەرمەند بوون، ئەگەرچی بەشدارییەکی کاریگەریشیان هەبوو. چونکە شۆڕشێکی پێچەوانەی دژ بە ئافرەتان لە ئارادایە. تاقە دەستکەوتێکی شۆڕش بریتییە لە ناچارکردنی سەرۆکی ڕژێمی پێشو حوسنی مـوبـارەک بە دوورکەوتنەوە لە دەسەڵات و حوکمڕانی.

ڕاگەیاندنی بەخشینی خەڵاتەکە بە نەوال سەعداوی، لای نوسەران و ڕۆشنبیرانی عەرەب لە تـاراوگـە، پـەرچـەکرداری بـاش و دڵخۆشی لێکەوتەوە. ئەمە لە کاتێکدایە میدیای سویدی گرنگی و بایەخێکی باشیان بەم ڕوداوە دا، ڕۆژنامەکان چەندین پانتاییان بۆ تەرخانکرد.

سـەرچـاوە: نـزار عەسکەر، ایـلاف، شەممە، ٢٠١٢/٥/١٩



## خەڵاتی ئەسترید لینگرێن ساڵی ٢٠١٢

# بۆ ئەدەبی منداڵان بەخشرا
# بە نووسەری هۆڵەندی گوس کەییەر

لە سویدییەوە: ڕێنوار

خەڵاتی ئەسترید لینگرێن بۆ ئەدەبی منداڵان کە ئەمساڵ دەهەمین ساڵی بەخشینی ئەم خەڵاتەیە درا بە نووسەری هۆڵەندی گوس کەییەر. گوس کەییەر پێنج ملیۆن کرۆن وەرئەگرێت وەک پاداشتێک بۆ هێنانەکایەی ئەو شێوازە تایبەتە بۆ گوزارشتکردن و خستنەڕووی پرسیارەکانی ژیان، بۆ خوێنەرانێک کە تەمەنیان لەنێوان منداڵ و مێردمنداڵیدایە. کاتێک سەرۆکی دادوەرانی خەڵاتی ئەسترید لینگرێن تەلەفوون بۆ گوس کەییەر ئەکات و هەواڵی پێدانی خەڵاتەکەی پێ ئەگەیەنێت، ئەڵێت:

ـ من توشی سەرسوڕمانێکی زۆربووم بەم هەواڵە، ئەمە ڕێزێکی گەورەیە بۆ من. بەڵام لە ڕاستیدا ئێستا ئەبێت من بڕۆم بۆ لای دکتۆری دان.

گوس کەییەر لە ساڵی ١٩٤٢ لەدایک بووە. بۆ منداڵان و گەورە ئەنووسێت. لە ساڵی ١٩٧٥ ـەوە وەک نووسەرێکی منداڵان ناسراوە و سی کتێبی منداڵانی نووسیوە، زۆرینەی ئەم کتێبانە بۆ خوێنەرانێکی تەمەن منداڵ و مێردمنداڵن. کتێبە زۆر دیارەکانی ئەم نووسەرە "ئەیچۆن، ئێمە هەمیشە دوو کەسین" ساڵی ١٩٩٩. "ئەوە بزانە کە من پۆلێکم" ٢٠٠١. "کتێبێک لەسەر هەموو شتێک" ٢٠٠٤. ئەم نووسەرە پێشتر دووجار خەڵاتی دۆیچی بۆ ئەدەبی منداڵان وەرگرتووە، کتێبەکانی بۆ زیاد لە دە زمانی وەرگێڕدراون.

خەڵاتی ئەسترید لینگرێن گەورەترین خەڵاتی ئەدەبی منداڵان و مێردمنداڵانە لە دنیادا. ئەمساڵ ١٨٤ نووسەر لە ٦٦ وڵاتی جیاواز هەڵبژێردرابوون بۆ ئەم خەڵاتە. مەبەست لەم خەڵاتە بەهێزکردنی حەزی خوێندنەوەیە لەلای منداڵ و پەرەپێدانی ئەدەبی مێردمنداڵان لە هەموو دنیادا. خەڵاتەکە لە ٢٩ی مانگی پێنجی ئەمساڵدا لە کۆنسێرهوست لە شاری ستۆکهۆڵم بەخشرا بە گوس کەییەر.

سەرچاوە: www.dn.se

# لە ئەفغانستان ئافرەت
# لەسەر نووسینی شیعر دەکوژرێت

نووسینی: یوسف یەڵدا
و. لە عەرەبییەوە: سەردەم

ئێمە لە جیهانێکدا دەژین، چیتر چاوەکانمان بڕوا بەوە ناکات کە ڕوودەدات و عەقڵیشمان وایلێهاتووە ئیدی بەرگەی هەواڵەکانی جیهان نەگرێت. بەشی هەرە زۆری ئەو شتانەی لە دەوروبەرمان ڕوودەدەن، ناکرێ بە هەندێ وشە پاساوی بۆ بهێنرێتەوە، چونکە کارەکە زۆر قێزەون و تاوانبارانەیە. لە ئافرەت دەدرێت، چونکە کتێبێکی شیعر دەخوێنێتەوە. ئافرەتێکی دیکە دەکوژرێت، چونکە شیعر دەنوسێت.

دەڵێن ئافرەتێک کاتێ نەیتوانیوە بگات بەو مرۆڤەی کە خۆشیدەویست، ئاگری لە جەستەی خۆی بەرداوە، دوای تێپەڕبوونی هەفتەیەک بەسەر ئەو ڕوداوەدا و بەهۆی شکستی ئەو حاڵەتە سۆزدارییەی کە تێیدا ژیاوە، لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی قەندەهاردا کۆچی دوایی کردووە. هەروەها دەڵێن کچێک بۆ بەدبەختی، لە کاتی خوێندنەوەی ئەو شیعرانەی کە نوسیبووی، لەناکاو هەستدەکات براکانی لەسەر سەری ڕاوەستاون، شیعرەکانی باسی بابەتی خۆشەویستی کردووە و وشەکانی بە نهێنی نوسراون، دوور لە چاوی جیهانێکەوە نوسراون کە پیاوان و جەنگ و ئەفیون هەیمەنەیان بەسەردا کردووە. ئەو کچە ناوی "زارمینا" بووە، ئەندامی دەستەیەکی نهێنی بووە لە چوارچێوەی گروپێکی ئەدەبیدا کە ماوە ماوە بەیەکگەیشتون تاکو قسە لەسەر شیعر بکەن. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو کچە لە (کابول)ی پایتەخت نیشتەجێ نەبووە، پێویست بووە لەسەری شیعرەکانی بە نهێنی و لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە بنێرێت، تەلەفۆنەکەشی هەر نهێنی بووە و لە چاوی ئەوانی دیکەی شاردبووەوە. دەبوایە شیعرەکانی بە

دەنگێکی نزم بناردایە، وەک ئەوەی ئەحداسیاتی شوێن و جێگای دوژمن دیاری بکات. ئەو لە کاتێکدا شیعرەکانی دەنارد، لەناکاو هەست بە براکانی دەکات لە پشت سەریەوە ڕاوەستاون و تاوانەکەی ئاشکرا دەکەن، پاشان براکانی بەردەبنە گیانی و تا دەتوانن لێیدەدەن. "زارمینا" دوای هەفتەیەک لە ئاشکرابوونی نهێنییەکەی، خۆی دەکوژێت.
لە ئەفغانستان سەدان حاڵەت هەیە کە لە حاڵەتی "زارمینا" دەچێت، بۆ ئاگاداربوون لێیان دەکرێ ڕاپۆرتی ڕۆژنامەی (نیۆیۆرک تایمز) بخوێنینەوە کە باس لەو ئافرەتانە دەکات بە هۆی نوسینی شیعرەوە، گەورەترین سزا دەدرێن، هەندێجار سزاکە دەگاتە ئاستی کوشتن. لە زۆربەی ئەو حاڵەتانەدا مێردی ئەو ئافرەتانەی شیعر دەنوسن، پاڵەوانی ئەم تاوانانەن و ئەوان تاوانەکان ئەنجامدەدەن. لە هەندێ حاڵەتی دیکەدا براکان یان مامەکان یاخود خزمە هەرە نزیکەکان، دەبنە پاڵەوان و تاوانەکان ئەنجامدەدەن. بۆ نمونە ساڵی ٢٠٠٥ هەواڵێک بڵاوکرایەوە تێیدا ئەوە ڕاگەیەنرابوو کچێکی گەنج لەبەر ئەوەی شیعر دەنوسێ و بە نهێنی دەینێرێت، لەسەر دەستی مێردەکەی دەکوژرێت.
هەرچەندە هێزەکانی مارینزی ئەمریکی، دەیانەوێ لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزی چەک و تەقەمەنییەوە، لە ئەفغانستاندا دیموکراسی بڵاوبکەنەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە هەر سەد ئافرەتێک تەنها پێنج ئافرەتیان توانیویانە بڕوانامەی قۆناغی سەرەتایی بەدەستبێنن، لە چوار کچ سیانیان بە زۆری و بە ناچاری لە تەمەنی شانزە ساڵیدا بە شوودەدرێن. بەڵام لە کابول و لەژێر سایەی ئەو تۆزە ئازادییەی کە هەیە، گروپێکی ئەدەبی بەناوی (میرمان باهیر) دروست بووە. ئەم گروپە کۆمەڵێ چیرۆکنوس و ڕۆماننوس و شاعیر لەخۆدەگرێت، گروپەکە تەنها ئەوانە لەخۆدەگرێت کە لەناو پایتەختی ئەفغانستاندا دەژین، بەڵام ئەوانەی لە دەرەوەی کابول دەژین، ئەوا پێویستە لەسەریان خۆیان بەرگەی موعاناتی گەیاندنی بەرهەمە ئەدەبییەکانیان لە ڕێگەی تەلەفۆنەکانیانەوە بگرن، ئەمەش هیچ دەرئەنجامێکی ئەوتۆی نابێت، تەنها ئەوە نەبێت دەبێتە هۆی خنکاندنی دەنگە شیعرییەکان و ژانرە ئەدەبییەکانی دیکە.
لێرەوە مەسەلەکە سەیر نییە کاتێ یەکێک لە دیکتاتۆرەکان دەگاتە لوتکەی دەسەڵات، بەشی هەرە زۆری ئەوانەی تاراوگە وەک نیشتیمانی خۆیان هەڵدەبژێرن، لە ئەدیبان و شاعیران و هونەرمەندانی شێوەکاری پێکدێن، بەشێوەیەکی گشتی لە هەموو ئەوانە پێکدێن کە لەمیانەی ئیشێکەوە لە دنیای دەرەوە دەڕوانن. مومارەسەکردنی دەسەڵات، لە بەشی هەرە زۆریدا، لە میانەی کەسێکەوە جێبەجێ دەکرێت هیچ چارەیەکی نییە ئەوە نەبێت هەمو ئەو ئاوێنانە بشکێنێ کە ئەو وێنانەی پیشاندەدەن بە دڵی نییە و لەگەڵ پلانی هەیمەنەکردنی بەسەر هەمووادا ناگونجێت. هەیمەنەکردن و سەپاندنی بڕیارەکان، تەنها لە دەستی یەک کەسدایە، بۆیە هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی کاری هەرەوەزی، وەک خیانەتێک وایە لێخۆشبونی بۆ نییە.
لە دواجاردا کاتێ تەرمەکان، بێ جووڵە بەسەر یەکدا کەڵەکە کراون، خێزانی ئەو ئافرەتانەی بە هۆی خۆشەویستیان بۆ شیعر سەربڕاون، ڕەتیدەکەنەوە لەنێوان کچەکانیان و شیعردا هیچ پەیوەندییەک هەبێت و هەموو ئەوەی کە ڕویداوە بە قەزاوقەدەری دادەنێن، وەک ئەوەی باوکەکان دەیڵێن. بەڵام لەلایەکی دیکەوە هەموو شتێ پاساوی خۆی هەبووە، وەک ئەوەی بکوژەکان دەیڵێن.
باشە بۆچی لە پێناو نوسینی شیعردا ژیان بخرێتە مەترسییەوە؟ لەوانەیە هۆکارەکە بێزاری و بێ ئومێد بێت، یان لەوانەیە هۆکارەکان ئێش و ئازار و خەم و خەفەت بێت، هەروەها لەوانەیە بەهۆی قەناعەتکردنەوە بێت بە نوسینی شیعر.

سەرچاوە: ایلاف، چوارشەممە، ٢٠١٢/٥/٩

# یاسایەك ڕێگا بەکوشتن دەدا

نووسینی: عەلی ئەبو خەتاب
و. لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

هیوادارم ناونیشانەکە خوێنەر دوچاری شۆک بکات، چونکە من ئەوەم دەوێ! ئایا دەچێتە عەقڵەوە یاسایەک لە یاساکان، لە هەر دەوڵەتێکدا بێت، مادەیەک لەخۆ بگرێت کە ڕێگا بە کوشتن بدات؟ واتە کارئاسانی بۆ بکوژەکە بکات و بە تۆمەتێکی سادە و ئاسان تۆمەتباری بکات و حوکمێکی سوکی بدات کە لە شەش مانگ زیندانیکردن تێنەپەڕێت. لە یاسای سزادانی فەلەستینی کە لە یاسای سزادانی ئەردەنییەوە وەرگیراوە، بگرە لە یاساکانی وڵاتانی دیکەی عەرەبییەوە وەرگیراوە، مادەیەک هەیە پەیوەستە بە تاوانی شەرەف و ڕێگە بەو جۆرە کوشتنە دەدات.

چۆن لە کۆمەڵگاکەماندا ڕێگا لە ئەنجامدانی تاوان بگرین و کوشتنی مرۆڤ قەدەغە بکەین، تەنانەت ئەگەر ئەو مرۆڤە هەڵەشی کربێت. کاتێک لەسەر تاوانی شەرەف، یاسایەک دەردەکەین کە سزای لە سێدارەدان یاخود سزای زیندانی هەتاهەتایی لەگەڵ کاری تاقەتپڕوکێنی تێدانەبێت، ئایا ئەمە مانای ئەوە نییە ئێمە وەک دەوڵەت و وەک یاسا، هانی هەموو ئەو کەسانە دەدەین کە تەنها

گومانیان لە دایک یان خۆشک یاخود کچەکەی یان ژنەکەی یان هەر مێینەیەکی دیکە کە تایبەتە بەم هەیە، بکوژن و خۆیان لەو گومانانە ڕزگار بکەن. تەنانەت ئەگەر مەسەلەکە تەنها گومانیش نەبێت و لەگەڵ یەکێکدا بینیبێتیان، ئایا ئەوە دەیسەلمێنێ کە ئەو تاوانی زینای ئەنجامداوە؟ سەلماندنی تاوانی زینا لە ئیسلامدا پێویستی بە چوار شاهیدە، بێگومان بوونی چوار شاهید کارێکی زۆر زەحمەتە و مەحاڵە ڕووبــدات. بگرە با وایدابنێین ئافرەتێک لەسەر جێگاکەی بە تەنها لەگەڵ پیاوێک لە پیاوەکاندا بینرا، ئایا ئەمە پاساوی ئەنجامدانی تاوانی کوشتنی ئەو ئافرەتە بەڕەوا دەبینێت و یاساش خەڵاتی دەکات بەوەی بە زووترین کات لە زیندان دەریدەهێنێت؟
مادام دەوڵەتێکی خاوەن سەروەریمان هەیە، ئەگەرچی ناتەواویشە وەک دەوڵەتی فەلەستین، بۆیە ئەوە یاسایە پێویستە لەسەری جڵەوی مەسەلەکان بگرێتە دەست و سزای تاوانی زینا دەربکات. وەلێ ئەگەر یاسا لەگەڵ بکوژدا دەست و پەنجەی نەرم بکات، ئەمە وەک ئەوە وایە هانی بکوژەکە بدات تاوانەکەی ئەنجامبدا و مۆڵەتی پێبدا لە باتی یاسا تۆڵەی خۆی بکاتەوە. یاسای تاوانی شەرەف، یاسایەک نییە تەنها پەیوەست بێت بە کێشەیەکی دادگاییەوە، بگرە مەسەلەکە لەوە فراوانترە و مافێک لە مافەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە، مافی یەکسانی نێوان برا و خوشک. لە کۆمەڵگایەکی شارستانیدا کە ڕێزی خۆی بگرێت، پێویستە ئافرەت هەمان مافی یەکسانی لەگەڵ پیاوەکاندا هەبێت. هەروەها پێویستە ئێمە قۆناغی باوکسالاری یان ئەوەی "هشام شەرابی"ی توێژەر پێیدەڵێ قۆناغی پاتریارکی-مان تێپەڕاندبێت یاخود لە هەوڵی تێپەڕاندنیدابین.
لەبەر ئەوە ئایا کۆمەڵگا و یاسا ڕێگە بە ئافرەت دەدا، براکەی یان باوکی یاخود کوڕەکەی یان مێردەکەی یان هەر نێرینەیەکی دیکە کە تایبەتە بەم، بکوژێت، چونکە لەگەڵ ئافرەتێک لە ئافرەتەکان بینیویەتی؟
من زۆر لەوە دڵنیام ئەم پرسیارە تووڕەیی و ناڕەزایی زۆرێک لە خوێنەرانی میللەتەکەمان دەوروژێنێت، بگرە تەنانەت خودی یاسادانەرانیش تووڕە دەکات. چونکە ئێمە لەلایەنی پەروەردەییەوە وا فێرکراوین تەنها بە قسە مافەکانی ئافرەت بسەلمێنین و بە کردەوە هەست بەوە نەکەین ئێمە لەگەڵ ئافرەتدا یەکسانین. خودی ئاینی ئیسلام لە تاوانی زینادا جیاوازی لەنێوان ژن و پیاودا ناکات. ئیدی چۆن و بە چ شێوەیەک کۆمەڵگا لەسەر تاوانی شەرەف، لەنێوان ژن و پیاودا، ئەو جیاوازییە دەکات؟ کۆمەڵگایەک گوایە ئیسلامییە و یاساکانیشی لەسەر بنەمای ئیسلام دارێژراون؟
بێگومان ئێمە بانگەشەی ئەوە ناکەین ئافرەت هەمان مافی کوشتنی وەک پیاو هەبێت، بگرە بانگەشەی ئەوە دەکەین کە لۆژیک ڕێگەی پێدەدات، ئەویش بریتییە لەوەی یاسا سەروەربێت، واتە یاسا بەرپرسیار بێت لە سزادانی کەسی هەڵە، سا ئەو کەسە پیاو بێت یان ئافرەت. لە هەمانکاتدا سزایەکی توندی پیا و یان ئافرەت بدات کە کاری کوشتن ئەنجامدەدا و یاسا پێشێل دەکات. ئێمە ئەو نائارامی و پێشێلکاریانەی دەرهەق بەیاسا دەکرێت بەسمانە و چیتر پێویستیمان بـەوە نییە خـودی یاساکان، بەشێک بن لە فەوزا و پشێوی ئەمنی و تێکچوونە ئەخلاقییەکان. لەم بارودۆخەماندا یاسایەک ڕێگە بە کوشتن بدات یاخود کارئاسانی بۆ بکوژەکە بکات، تابێت قووڕەکە خەستتر دەکات. ئەم جۆرە یاسایانە نە لۆژیک و نە ئاین پێی ڕازی نابن، ئیدی مرۆڤ چۆن و بە چ شێوەیەک پێی ڕازی دەبێت و پاساوی بۆ دەهێنێتەوە!

سەرچاوە: الاوان، هەینی، ٢٠ نیسان، ٢٠١٢

# بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم

ئامادەکردنی: باوکی ڕەهەند

لای کەسمان شاراوە نییە کە دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ڕۆڵێکی بەرچاوی بینیوە لە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی نوسەرانی بیانی و ناوخۆیی و توانیویەتی بەو بەرهەمانە سوچێکی کتێبخانەی کوردی پڕکاتەوە. ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە و پێویست بە سەلماندن ناکات، چونکە هەر کەسێک بە ویژدانەوە تەماشایەکی کتێبخانەکانی شار و شارۆچکەکانی کوردستان بکات، ئەو ڕاستیەی بۆ دەردەکەوێت و بە چاوی خۆی بەرهەمەکانی دەزگای سەردەم دەبینێت.

دەزگای سەردەم لە ماوەی دوو مانگی ڕابردودا، وەک پیشەی هەمیشەیی و وەک ساڵان و مانگەکانی ڕابردوو، کۆمەڵێ بەرهەمی دیکەی خستە بەردەست خوێنەران.

بەرهەمەکانی ئەم دوو مانگەی دەزگای سەردەم، بەشی هەرە زۆریان بە شێوەیەکی گشتی تایبەت بوون بە شانۆ و دەقی شانۆیی، ئەمە سەرەڕای چاپکردنی کتێبی (بوون و نەبوون)ی بیرمەندی فەرەنسی جان پۆل سارتەر کە بەیەکێک لە کتێبە نایاب و بایەخدارەکانی سەدەی بیستەم دادەنرێت.

# زمانی چیا




ئەم کتێبە دەقێکی شانۆیی نوسەری ئینگلیزی "هارۆڵد پینتەر"ە کە ساڵی ٢٠٠٥ خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئەدەب پێ بەخشراوە، ئەگەرچی ئەم بەرهەمەی "هارۆڵد پینتەر" بەرهەمێکی کورتە و لە کتێبەکەدا کە شەستوچوار لاپەڕەی نیو ئەی فۆرە، تەنها نزیکەی سی لاپەڕەی گرتووەتەوە، لاپەڕەکانی دیکە بریتییە لەو پێشەکییەی وەرگێڕی کتێبەکە بۆ شانۆنامەکەی نوسیوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بایەخی دەقەکە لەوەدایە باس لە کێشەی زمانی ئەو نەتەوانە دەکات کە ژێردەستەن و لەلایەن نەتەوەکانی دیکەوە، ڕێگریان لێ دەکرێت بەوەی زمانی ڕەسەنی خۆیان بەکاربهێنن. باس لەوە دەکات کە خەڵکانی دەرەوەی پایتەخت، سا ئەو خەڵکانە سەر بە نەتەوەی جیاواز جیاواز بن، نابێت بە زمانی ڕەسەنی خۆیان قسە بکەن و هەر دەبێ بە زمانی پایتەخت کە دیارە زمانی نەتەوەی باڵادەستە، قسە بکەن. بیرۆکەی نوسینی ئەم شانۆنامەیە، وەک لە کتێبەکەدا ئاماژەی پێدراوە، لەو سەردانەوە سەرچاوەی گرتووە کە نوسەری دەقەکە لەگەڵ "ئارسەر میلەر" سەردانی کوردستانی تورکیایان کردووە، تا لە نزیکەوە بە دواداچون بۆ مەسەلەی مافی مرۆڤ بکەن و پشتگیری لە نوسەرە بەرهەڵستکارەکان بکەن.

بەڵام ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە شوێنی سەرنجە، ئەوەیە نوسەری دەقەکە هەرچەندە بیرۆکە و هەوێنی نوسینی ئەم دەقەی لە کێشەی کورد لە تورکیا وەرگرتووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە دەقەکەدا بە ڕاستەوخۆی باسی کوردی نەکردووە و ناوی نەهێناون. تەنانەت لە دەقەکەدا هیچ ئاماژەیەکی وا نییە کە پێمان بڵێ کارەکتەرەکان کوردن، تەنانەت ناوی ئەو وڵاتە یان ئەو شوێنە نەبراوە کە ڕوداوەکانی تێدا ڕوودەدات. ڕەنگە هۆکاری ئەوەی کە ڕاستەوخۆ ناوی کورد نەهاتووە، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە "هارۆڵد پینتەر" هەوڵیداوە دەقەکەی ڕەهەندێکی جیهانی وەرگرێت و تەواوی ئەو نەتەوانە بگرێتەوە کە بە شێوەیەک لە شێوەکان، ڕێگریان لێدەکرێت کە بە زمانی دایک قسە بکەن. بەمانایەکیتر نوسەری دەقەکە، نەیویستووە دەقەکەی تەنها تایبەت بکات بە کورد و بە کێشەی کورد، ئەگەرچی بیرۆکەی نوسینی دەقەکەی لە کێشەی کوردەوە وەرگرتووە. بەڵکو ئەو هەوڵیداوە ئەو حاڵەتە بخاتەڕوو کە لە زۆربەی سیستمە دیکتاتۆریەکاندا هەیە، حاڵەتی ئەوەی کە نەتەوەیەکی باڵا دەست، لە ڕێگەی قەدەغەکردنی زمانەوە، دەیەوێ هەژمونی خۆی بەسەر تەواوی نەتەوەکانی بن دەستیدا بسەپێنێ.

ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز عەلی عەسمان یاقووب بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە کراوە بە کوردی و

پێشەکییەکیشی بۆ نوسیوە کە وەک خۆی ئاماژەی پێداوە لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر دەقەکە و تێیدا باس لە شێوازی کارکردنی "پینتەر" دەکات، بە تایبەتی لەم شانۆنامەیەیدا.
ئەم کتێبە ژمارەی لاپەڕەکانی ٦٤ لاپەڕەی قەبارە بچوکە و تیراژی ٥٠٠ دانەیەو نرخی هەزار دینارە.

## شانۆنامەو گفتوگۆ

ئەم کتێبە یەکێکی ترە لەو کتێبانەی تایبەتە بە دەقی شانۆیی و قسەکردن لەسەر بوارەکانی شانۆ، لە نوسینی دەقی شانۆییەوە بیگرە بۆ کاری دەرهێنان و نواندن و ڕوناکی و جلوبەرگ و تەواوی ئەو کارانەی




دیکە کە لە نمایشکردنی دەقێکی شانۆیدا پێویستە. واتە یەکێک لە سیفەتە باشەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە تەنها کۆمەڵێ دەقی شانۆیی نییە، یاخود تەنها کۆمەڵێ گفتوگۆ نییە لەسەر شانۆ، بەڵکو لەیەککاتدا هەردوکیانە. ئەمە وایکردووە کتێبەکە دەوڵەمەندتر و سودبەخشتر ببێت، هەروەها وەرگێڕ لە دەستنیشانکردنەکانی چ بۆ دەقە شانۆییەکان و چ بۆ ئەو شانۆنوسانەی گفتوگۆکانیان لەگەڵدا ئەنجامدراوە، سەرکەوتوو بووە. چونکە ئەوانەی لەم کتێبەدا بەرهەمەکانیان کراوە بە کوردی، پسپۆڕانی دنیای شانۆو نوسینی شانۆیین.
ئەم کتێبە کە لە چواردە دەقی شانۆیی و هەشت گفتوگۆ پێکهاتووە و لە ژێدەری جیاواز جیاوازەوە وەرگیراوە، سەرچاوەیەکی باشە بۆ شانۆکاران و بۆ ئەو تیپ و گروپە شانۆیانەی کار لە شانۆ و دەرهێناندا دەکەن و کۆمەڵێ دەقی جوان و نایابیان دەخاتە بەردەست تاکو لە سەر لاپەڕەکانی کتێبەکەوە بیگوێزنەوە بۆ سەر تەختەی شانۆکان، ئەمە سەرەڕای ئەوەی بۆ ئەوانەش بە سودە کە حەزیان لە خوێندنەوەی دەقی شانۆییە. بە مانایەکیتر ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ کەمکردنەوەی ئەو دیاردەیەی پێدەوترێت نەبونی دەق بە زمانی کوردی، بەتایبەتی دەقی وەرگێڕدراو یان دەقی ئەو شانۆنوسانەی کە لە گۆڕەپانی شانۆدا ناوێکی دیار و بەرچاون و کارەکانیان شایستەی وەرگێڕان و نمایشکردنە. ئەم کتێبە دێت و بە زمانێکی کوردی پاراو چواردە دەقی شانۆیمان پێ دەناسێنێت کە تاڕادەیەک سەر بە قوتابخانەی فیکری جیاواز جیاوازن.
دەقە شانۆییەکانی ئەم کتێبە، بۆ ئەو نوسەرانە دەگەڕێتەوە کە لە بواری نوسینی شانۆییدا، ناوبانگێکی گەورەیان هەیە و لەسەر ئاستی جیهان ناسراون، لەوانە چوار دەقی سامۆئێل بێکێت، دوو

دەقی هارۆڵد پینتەر، سێ دەقی ئێدوارد ئەلبی، لەگەڵ دەقێکی هەر یەک لە ئۆجین یۆنسکۆ و ئۆجین ئۆنیل و دۆن دیلیلۆ و بێتی کێڵەر.
ئەم کتێبە کە لەلایەن بەڕێز عەبدوڵلا سلێمان (مەشخەڵ)ەوە بە شێوەیەکی جوان کراوە بە کوردی، ژمارەی لاپەڕەکانی ٢٩٤ لاپەڕەی گەورەیە و تیراژەکەی ٥٠٠ دانەیە و نرخی ٤٥٠٠ دینارە.

## بوونو نەبوون




یەکێک لە بەرهەمە نایاب و بە پێزەکانی بیرمەندی فەرەنسی جان پۆل سارتەر، بریتییە لە کتێبی (بوونو نەبوون- الوجود و العدم). ئاشکرایە نوسەری ئەم کتێبە، بە شێوەیەکی تایبەت و تا ڕادەیەک لە ڕێگەی وەرگێڕانی شانۆنامەکانییەوە یان لە ڕێگەی ئیشکردن لە شانۆنامەکانیدا، لای ئێمە ناسراوە و ناوێکی دیارە. بەڵام ئەم نوسەرە کە لەیەککاتدا شانۆنامە و ڕۆمان و کاری ڕەخنەیی و فەلسەفی نوسیوە و یەکێکە لە ناوە پرشنگدارەکانی سەدەی بیستەم، نەک تەنها لە فەرەنسا، بەڵکو لە تەواوی جیهانیشدا.
کتێبی بوون و نەبوون کە وەک وەرگێڕی کتێبەکە (د. محەمەد کەمال) لە پێشەکییە کورتەکەیدا ئاماژەی پێداوە، بریتییە لە خستنەڕووی فەلسەفەی سارتەر کە بە فەلسەفەی بوونگەرایی ناسراوە. سارتەر نزیکەی پێنج ساڵ سەرقاڵی نوسینی ئەم کتێبەی بووە، واتە لە نێوان ساڵانی ١٩٣٩ بۆ ١٩٤٣. لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین ئەم کتێبە لەبەر ئەوەی باس لە کۆمەڵێ چەمک و زاراوەی فەلسەفی دەکات و باس لە کێشەکانی بوون و نەبوون دەکات، بۆیە تاڕادەیەک قورسە و خوێنەر بە ئاسانی لێی تێناگات و ماندوو دەبێت. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا کتێبێکی بەنرخە و شایەنی ئەوەیە بخوێنرێتەوە، کتێبێکە لە ڕێگەیەوە لە فیکری فەلسەفی ئەم نوسەرە گەورەیەی فەرەنسا تێدەگەیت کە لە ساڵانی شەست و حەفتاکانی سەدەی ڕابردوا، یەکێک بوو لە ناوە هەرە درەوشاوەکانی جیهان.
وەرگێڕی کوردی بەڕێز "د. محەمەد کەمال" کە لە بورای کاری فەلسەفیدا، چ بە نوسین یان وەرگێڕان، جێ دەستی دیارە، لە چەندین لاپەڕەی ئەم کتێبەدا، پەراوێزی بۆ بابەتەکان داناوە، ئەمەش هەوڵێکی زۆر باشی وەرگێڕە تا خوێنەر بتوانێت لە بابەتەکان تێبگات.
ئەم کتێبە لە ٦٢٥ لاپەڕەی قەبارە گەورە پێکهاتووە، تیراژی ١٥٠٠ دانەیە و نرخی دە هەزار دینارە.

# لەڕادەبەدەر خۆشەویستییت




ئەمە یەکێکە لەو ڕۆمانانەی تەنها باس لە کێشەی خۆشەویستی دەکات، واتە تەوەری سەرەکی و جەوهەری ئەم ڕۆمانە بریتییە لە خۆشەویستی و هیچ پەلوپۆی دیکەی لێنابێتەوە هیچ ڕوداوێکی دیکەی تێدا نییە کە لە دەرەوەی خۆشەویستی بێت. بە مانایەکیتر دەتوانین بڵێن ئەمە ڕۆمانێکە تەنها باس لە پەیوەندیەکی خۆشەویستی نا هاوسەنگی نێوان کچ و کوڕێکی خەڵکی سعودیە دەکات کە لە تاراوگە دەژین و لەوێ یەکتریان ناسیوە.

ئەم ڕۆمانە بە پەرەگرافێک دەستپێدەکات و بە هەمان پەرەگرافیش کۆتایی پێدێت، لەنێوان ئەم دوو پەرەگرافەدا، ئێمە لەبەردەم ڕۆمانێکداین باس لە خۆشەویستی و عەشقی نامورادی جومانە بۆ عەزیز دەکات، عەشقێک دەتوانین بڵێین سەرەتای هەیە بەڵام کۆتایی نییە و تا ئەبەد درێژ دەبێتەوە، عەشقی جومانە یان خۆشەویستی جومانە بۆ عەزیز، بەشێوەیەکە مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ و تێناگات ئەم کچە بۆ ئەوەندە شەیدا و هۆگرای ئەو کوڕە بووە کە پڕە لە گرێی دەرونی و کۆمەڵایەتی و کەلتوری. ئەوەی لەم ڕۆمانەدا دەیبینین، ئەوەیە هەندێجار مرۆڤ بۆ خۆشی نازانێت، بۆچی کەسێکی خۆشدەوێ و کەسێکی دیکەی خۆشناوێت، لەبەرچی ئامادەیە تەواوی ژیانی بۆ کەسێک تەرخان بکات کە لەوانەیە شایەنیشی نەبێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سورە لەسەر ئەو تەرخانکردنە و پێداگریی لەسەر دەکات.

لەم ڕۆمانەدا خۆشەویستی جومانە بۆ عەزیز، وەک جۆرێک لە پەتای لێهاتووە کە جومانە نە دەتوانێ دەستبەرداری ببێت و وازی لێبێنێت، نە هیچ ئەنجامێکیشی هەیە. ئەم خانمە وەک دێوانەیەک، عەزیزی خۆشدەوێ و بێ ئەو ناتوانێ هەڵبکات. بێ ئەو ژیانی هیچ مانایەکی نییەو ئەوەی مانا بە ژیانو بە بوونی دەبەخشێت، خۆشەویستییەتی بۆ ئەو کوڕە کە زۆر بە ساردییەوە پێشوازی لەو خۆشەویستیە گەرمکە دەکات.

ئێمە لەم ڕۆمانەدا لەبەردەم دوو کەسایەتیداین، هەریەکەیان بە جۆرێکی تەواو جیاواز لە مەسەلەی عەشق و خۆشەویستی دەڕوانن. یەکەمیان کە جومانەیە لە عەشقدا بەشوێن مانای مرۆڤبوون و ڕاستگۆیی و وەفادرای و متمانە و هۆگربوون و پاکیەتیدا دەگەڕێت، واتە بەشوێن هەمو ئەو شتانەدا دەگەڕێت کە لە ڕێگەی عەشق و خۆشەویستییەوە ژیان جوان دەکەن و دنیا

دەڕازێننەوە. وەلێ دووەمیان کە عەزیزە لە عەشقدا بەشوێن داگیرکردن و ناڕاستگۆیی و بێ وەفایی و هەوەسبازیدا دەگەڕێت، واتە بە شوێن هەمو ئەو شتانەدا دەگەڕێت کە عەشق و خۆشەویستی ڕێگایان پێنادات!

ئەم ململانێیە، ئەم دوو تێڕوانینە جیاوازە بۆ عەشق و خۆشەویستی، تەواوی لاپەڕەکانی ڕۆمانەکەی داگیر کردووە، هەر یەکێکیشیان کۆمەڵێ بەهانە و پاساوی خۆییان هەیە و لەبەرامبەر یەکتر و بۆ سەرخستنی خۆیان بەکاریدەهێنن. بێگومان ئێمە وەک خوێنەر، وەک کەسێک کە لاپەڕەکانی کتێبەکە دەخوێنێتەوە و وردە وردە ئاشنای ئەو ململانێیە دەبێت و جەوهەری ڕاستەقینەی هەردوو کاراکتەرەکەی بۆ دەردەکەوێت، ناتوانین بێلایەنانە ڕاوەستین و لایەنگیری جومانە نەبین. چونکە عەشقی جومانە و خۆشەویستی جومانە بۆ عەزیز، بە ڕادەیەک پاک و بێگەردە کە پڕە لە هەڵوێستی جوان و لە میهرەبانی و لە ڕۆحی لێبووردن، ڕۆحێک کەم کەس بتوانێ ببێت بە خاوەنی، کەم کەس هەیە بتوانێ لەبەرامبەر ئەو هەمو ناڕەوایەتیانەی لە خۆشەویستەکەیەوە پێیدەکرێت، لەبەرامبەر ئەو هەمو ناحەقی و زوڵم و ناڕاستگۆیی و خیانەتەوە کە خۆشەویستەکەی دەیکات، ئاوا وەک جومانە لێبوردەیی هەبێت.

لە ڕاستیدا مرۆڤ کاتێ دوچاری خۆشەویستی ڕاستەقینە دەبێت و عەشق لە دەرگـای دڵی دەدات، مەبەستم لە خۆشەویستی ڕاستەقینە ئـەو خۆشەویستییەیە کە لە قوڵایی ڕۆحـەوە دێتە دەرێ، لە شوێنە پەنهان و نادیارەکانی ناخەوە دێت و خۆی بەیان دەکات. خۆشەویستی ڕاستەقینە لە جێگایەکەوە دێت کە ڕەنگە خودی کەسەکەش نەزانێت لە چ بەشێکی جەستەیەوە سەرچاوەی گرتووە، هیچ دوور نییە لە دەرەوەی دەسـەڵات و ویست و ئـیرادەی خۆیەوە بێت، لەوانەیە هیچ پەیوەندییەکی بە ئەندامەکانی جەستەیەوە نەبێت، بەڵکو تەنها ئەوە دەزانێت ئەو فڵانە کەسی خۆشدەوێ و بەس، ئیدی بۆ خۆشی دەوێ و چاوەڕوانی چی لەم خۆشەویستییە گەرم و تاقەتپڕوکێنە دەکات، ئەوەی بەلاوە هیچ گرنگ نییە. هیچ دوور نییە هێزێکی یەزدانی یان ئاسمانی یاخود هێزێک لە دەرەوە و لە شوێنێکی نادیارەوە هێنابێتی، لەوانەیە دەنگێک لە غەیبەوە هاتبێت و بۆ یەکجار چرپاندویەتی بە گوێیدا و پێی وتووە ئەو کەسەت خۆشبوێت، ئیدی دەنگەکە ڕۆشتووە و ئەمیش ناتوانێت خـۆی لـەو قــەدەرە ڕزگـار بکات کە ئەو دەنگە بۆی هێناوە. خۆشەویستی ڕاستەقینە کە پڕە لە قوربانی و بەخشین، پڕە لە لێبوردەیی و ڕاستگۆیی، زەحمەتە هەمو کەسێک بەرگەی بگرێت و پابەندبێت پێیەوە، ئەوە تەنها جومانەی پاڵەوانی ئەم ڕۆمانەیە، توانیویەتی بەرگەی هەمو ئەو ناخۆشی و نەهامەتیانە بگرێت کە خۆشەویستەکەی بەسەریدا دەهێنێت. ئەوە تەنها جومانەیە تێدەگات خۆشەویستی مەزن و بێ بەرامبەر، نرخەکەی چ باجێکی گەورەیە و دەبێ بیدەیت.

ئەم ڕۆمانە لەلایەن بەڕێز هەڵکەوت عەبدوڵڵاوە کراوە بە کوردی و بەڕێز مامۆستا شێرزاد حەسەن پێداچونەوەی بۆ کـردووە، ئەمەش وایکردوە وەرگێڕانەکە زیاتر سەرکەوتوبێت و بە زمانێکی کـوردی پوخت و پـاراو نوسراوەتەوە. ڕۆمانی لـەڕادەبـەدەر خۆشمویستیت لە ٢٨٢ لاپـەڕەی قەبارە گەورە پێکهاتووە، تیراژی ١٢٠٠ دانەیە و نرخی ٤٥٠٠ دینارە.